### ٣) پەلەگەرکەکان[١]:

یەکەم، پەنجەگورگیەکان[٢]: تا وەکوو ئێستا ١٢٠٠ جۆریان لێ دۆزراوەتەوە. ئاوەخۆرەیان هەیە و بنەمای دەستەی ڕوەکە ئاوەخۆرەدارەکانن. شێوازی زیادکردنیان لە ڕێگەی گرا دەبێت.

دووهەم، پەلەکەرگەکان[٣]: تا وەکوو ئێستا ١١٠٠٠ جۆریان لێ دۆزراوەتەوە. گەڵای گەشەکردوویان هەیە و زیادکردنیان لە ڕێگەی گرای پشت گەڵاکانەوە دەبێت.

### ٤) گیا دانەدارەکان[٤]:

یەکەم، سیکادەکان[٥]: نزیکەی ١٦٠ جۆریان لێ دۆزراوەتەوە. پێشینەی ئەم دەستەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دایناسۆرەکان. لەوانەیە سیکاد یەکێ لە خۆراکەکانی ئەو گیاندارە مێژووییە بووبێت.

دووهەم، ژینکۆکان[٦]: تەنیا یەک جۆری لێ دۆزراوەتەوە و بە کۆنەداریش دەناسرێت. یەکێ لە کۆنترین دارەکانی سەر ڕووی زەوییە. گەڵاکانی سوودی دەرمانی هەیە بۆ بەهێز کردنی یادگە و مێشک و خێرا کردنی تێفکرینی مرۆڤ. ماکە دەرمانیەکانی ناو ژینکۆ بریتین لە فلاونۆیید و تێرپنۆیید.

سێهەم، ئەسرۆییەکان[٧]: نزیکەی ٦٣٠ جۆریان لێ دۆزراوەتەوە. ئەم دەستەیە سەربە ڕوەکە هەمیشە سەوزەکانە. گەڵاکانی زۆرتر شێوەی سووژنی و درێژۆکەیە. زۆربەیان خاوەنی مادەی دەرمانی و پیشەسازی تێربانتینن. نموونەی ئەم دەستەیە وەکوو ناژوەن (سەوڵەکێوی)، سەوڵ (ئەسروو)، سەروەناز و کاژی دەریایی.

چوارەم، جەوڕنەکان[٨]: نزیکەی ٧٠ جۆریان لێ دۆزراوەتەوە وەکوو جەوڕنە،

---

١. Pteriophytes
٢. Lycopodiophyta
٣. Pteriophyta
٤. Seed Plant
٥. Cycadophyta
٦. Ginkgophyta
٧. Pinophyta
٨. Gnetophyta

گێنتۆم و ڤیلۆچیا. سەر بە دەستەی سنەوبەریەکانن بەلاّم چەشنی گوڵدارەکانی ماگنۆلۆفیتا پێکهاتەی ئاوەخۆرە[١]یان هەیە.

پێنجەم، گوڵدارەکان[٢]: نزیکەی ٢٥٨٦٥٠ جۆریان لێ دۆزراوەتەوە. زۆرترین ڕێژە و جۆری ڕوەک لەم دەستەیەدا جێ گرتووە. ئەم دەستەیە بە تازەترین دەستەی ڕوەکەکان ئەژمێردرێت، واتا لە ٤٢٥ ملیۆن ساڵ پێشەوە تا وەکوو ئێستا. بنچینەی سەرهەڵدانی ئەم دەستەیە لە گرا دەستی پێ کردووە. کاتێک مرۆڤ بە قۆناغی کشتوکاڵی گەیشت، توانی بەهۆی جەماوەری ئەم دەستە ڕوەکەوە ژیانی بخاتە قۆناغی پاش ڕاوچییەتی و گۆشتخۆرییەوە. نموونەی ئەم دەستەیە: ڕوەکەکانی وەک گەنم[٣]، گەنمەشامی[٤]، جۆ[٥]، نەیشەکەر[٦]، خەیار[٧]، هێرۆ[٨]، پرتەقاڵ[٩]، گێزەر[١٠]، نارنجبۆ[١١]، گیابەند[١٢]، مۆز[١٣]، هەنار[١٤] و هتد.

## بچووکترین ڕوەکی جیهان

لە دەستەی قەوزە وردیلەکان چەندین جۆر قەوزەی تەک خانەیی دەریایی دۆزراوەتەوە کە بە «دیاتۆم[١٥]» ناسراون. دیاتۆمەکان بە دوو شێوە شین دەبن.

---

١. Vessel Element
٢. Magnoliphyta
٣. *Triticum aestivum*
٤. *Zea mays*
٥. *Hordeum vulgar*
٦. *Saccharum officinarum*
٧. *Cucumis sativus*
٨. *Alcea spp.* = *Althaea spp.*
٩. *Citrus sinensis*
١٠. *Daucus carota* L. var. *sativys*
١١. *Melissa officinalis*
١٢. *Artemisia absinthium*
١٣. *Musa sapientum*
١٤. *Punica granatum* L. var. *sativa* K.
١٥. Diatom

یەکەم لەناو ئاوی دەریاکان کە هاوشێوەی دەنکە مایکرۆسکۆپیەکان مەلە دەکەن و پێیان دەڵێن پلانکتۆن[1]. دووهەم هاوچەشنی کرێژەبەردەکان خۆیان دەچەسپێنن بە بەرد و گڵی شێدار و لیتەی بن رووبار و دەریاکان یان لاسکی ڕووەکە شێدارەکان.

دیاتومەکانیش چەشنی ڕووەکە گوڵدارەکان خاوەنی کارگەی خۆراکسازی سەوزینە و فۆتۆسەنتێزن. ئەم ڕووەکە هەرەوردیلەیە پێکهاتووە لە دوو توێکڵی بچووک و گەورە. کاتی زیادکردن و زاوزێیی، توێکڵە گەورەکە لە بچووکەکە جیا دەبێتەوە و دەبنە دوو گیای سەربەخۆ. پاش چەندین جار زیادبوون بەم شێوەیە، زیادکردن لە ڕێگەیەکی ترەوە واتە گرا جێنشین دەبێت. توێکڵی گەورەی دیاتۆمەکان پێکهاتووە لە مادەی شووشە[2]. بەواتایەک توێکڵی دیاتوم هەمان وردیلەی بەردی شووشەیە کە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی بازرگانیە. هەروەها سەرچاوەی سەرەکی بەردی سماتە هەمان توێکڵی دیاتومەکانە. ئەم ڕووەکە وردیلە مایکرۆسکۆپیکە دیپلۆئیدە[3] و بەهۆی مادەیەکی کیمیاوی کە لە کونی توێکڵەکەی دێتە دەر، لە سەری دەخزێت و چەشنی گیاندارێکی مێرووئاسا دەجووڵێت.

پسپۆڕان باس لەوە دەکەن کە ئەگەر دیاتۆمەکان وەبێ مایکرۆسکۆپ بە چاو بینرابان، بێگومان دەبوون بە جوانترین ڤیترینی مۆزەخانەکان. هەروەها بەهۆی هەبوونی مادەی پرۆتەئینی سیلافینی ناو دیاتۆمەکان، سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی خۆراکی و دەرمانین.

### سوودی دیاتۆمەکان:

خۆراکی سەرەکی نەهەنگ و ماسیەکان، سەرچاوەیەکی سەرەکیە بۆ بەدەست هێنانی ڕۆنی جەرگی ماسی و کەرەستەکانی پیشەسازی (بۆردی سەر مێمۆری، ڕۆبۆتە پزیشکی و پیشەسازیەکان، بۆردەکانی ناو کۆمپیۆتەر، هەستەوەرە زیرەکەکان، مادەی دژەدەنگ بۆ ناو تۆمارگەکان، مادەی بۆیاخ و ڕەنگ، مادەی ناو تاید و شامپۆ، مادەی ناو تۆزی پۆلیشی سەیارە و هەروەها مادەی دروستکردنی

١. Plankton

٢. Silicon

٣. Diploid

پەرداخ و تۆنگە و کاشی چینی).

ئەوڕۆکە لە بواری زانســتی نانۆتێکنۆلۆژی[1] بۆ دروســت کردنی کەرەســتە و ئامێرە ورد و درشــتەکانی دنیای زانیاری و پێشــکەوتنی ئەم ســەردەمە بایەخێکی زۆر ئەدەن بە بەرهەمەکانی دیاتۆم بەتایبەت جۆری سیلیس.

## ڕوەکە مشەخۆرەکان[2]

ڕوەکە مشــەخۆرەکان بەو ڕوەکانە دەڵێن کە لە ســەر ڕیشــە یان لاسک و گەڵای ڕوەکەکانی دیکە پەل دادەکوتن و ژیان و ئاو و خۆراکیان بەو ڕوەکانە بەند دەکەن. ئەم دەســتە ڕوەکانە یا تەواو مشــەخۆرن و خۆیان هیچ خۆراکێک دروســت ناکەن یان نیوەمشــەخۆرن. لە بواری کشـتوکاڵدا ئەم جۆرە ڕوەکانە هاوچەشنی نەخۆشـی و مێرووە زیانبەخشەکان مێمڵ و دوژمنی تەندروستی ڕوەکەکانن و شیلەی ژیانیان دەمژن و تا ئاسـتی وشـک کردنی ڕوەک دەچن. کەواتە هەم گیابژارن وەک قامیش[3] و کاڕووش[4]، هەم گیای مشەخۆر و لاکوت واتە زیانیان دوو بەرابەرە بۆ کشتوکاڵ.

### تەواو مشەخۆرەکانە

ئەمانە ڕیشــەیان نییە بەڵکوو کاتێک هەســت بکەن ڕوەکی تایبەتی خۆیان شــین بووە یا بەهۆی بڵاوبوونەوەی هۆرموونات و مادە تایبەتیەکانی پەلک و ڕیشـــە و گوڵی ئەو ڕوەکانە، تووی ئەم مشەخۆرانە چەکەرە دەکەن و مارئاسا خۆیان بەرەو ڕوەکەکە دەکێشن. ئەڵبەتە تەنیا بۆ ڕوەکی بژاردەی خۆیان دەکێشرێن و هەڵدەکوتنە ســەریان. بۆ نموونە ڕوەکی گوڵەک تەنیا بۆ لای کۆمەڵێک ڕوەک دەکێشـرێ وەکوو گوڵەبەڕۆژە، کاخڵی، باینجان، تەماتە، توتن، نیسـک، نۆک، گێزەر و بادام و قەیسـی. یان ڕوەکی مێوەخۆرکە (جلە، گیاهەلاوە و گیاترتڕە) کە لە سەر زۆربەی ڕوەکەکان

١. Nanotechnology: تقنيه النانو

٢. Parasitic Plants

٣. *Phragmites australis* (Cav.) Trin. ex Steud. = *P. Communis* Trin.

٤. *Sorghum halepense*

ژیانی مشـــەخۆری و لاکوتی خۆی مســـۆگەر دەکات. گوڵەک و مێوەخۆرکە تەنیا لاسـک و تووویان هەیە و ڕیشـە و گەڵا و ئەندامی سـەوزینەی فۆتۆسـەنتێزیان نییە بۆیە ئەمانە بە ڕووەکی خۆراکخۆر[1] دەناســـرێن. ئەم دوو مشـــەخۆرە پێویســـتە تووەکەیان لە خاکەوە چەکەرە بکات و خۆیان بگەیننە ڕوەکەکانی دیکە.

## نیوەمشەخۆر[2]

لە کوردســتاندا نموونەی ئەم دەســتەیە کە بە (دەمکانە، دەمووکانە و دەمووکە)[3] دەناسرێن لە سەر لاسکی جۆرەکانی دار بەڕوو، مازوو، گوێژ و هەرمێ بە شێوەی کۆگایەکی ســـەوزی چڕ دەبینرێن. هەندێ پەلەوەر بەتایبەت قشـــقەرە و دارتەقێنە هۆکارن بۆ بڵاوکردنەوەی تووی ئەم نیوەمشـەخۆرە بۆ سـەر دارەکانی دیکە. کاتێ تووە چەســـپینەکەی دەمکانە لە ســـەر قەد و کۆتەی دارەکە دائەکەوێت ئەگەر شوێنەکەی شێدار بێت خێرا چەکەرە دەکات و دەڕواتە ناو ئاوەخۆرەی دارەکە. ئەم ڕوەکە ڕیشـــەی نییە و تەنیا لە ســـەر لاســـک و قەدی دارەکان چەکەرە دەکات و ناتوانێ لە خاکدا بژیت. دەمووکانە ئەندامی سەوزینەی هەیە و فتۆسەنتێزیش دەکات بەڵام مەوادی پێداویستی کانزایی و ئاو لە لاسکی دارەکە دەمژێت.

لە ســـەرچاوەکانی گیادەرمانی کۆن ڕوەکە مشـــەخۆرەکان گەلێک ســـوودی دەرمانیان بووە. لە کۆندا مێوەخۆرکە بە (افتیمون و کشـــوث) و دەمووکانە بە (دبق و شجرەالدبق) ناویان هاتووە.

---

١. Heterotroph

٢. Semi Parasitic Plants

٣. *Loranthus europeaus*

## باسی دووهەم

### پێگە و زانستی ڕوەکناسی

ڕوەکناسی یا زانستی ناسینی ڕوەکەکان یەکێ لە لقەکانی زانستی زیندەناسیە. کاری ئەم بوارە زانستیە توێژینەوە، لێکدانەوە، تێگەیشتن و خوێندنەوەی هەموو بوارەکانی ژیان و گەشەی زنجیرەی ڕوەکەکانی جیهانە. ژێرلقەکانی ئەم زانستە بریتین لە: مۆرفۆلۆژی، فیزیۆلۆژی و سیستماتیک یا تاکسۆنۆمی[1] ڕوەکی (پۆلێنبەندی).

- مۆرفۆلۆژی[2]: کاری ناسین و زانینی ڕواڵەت و پێکهاتە و پەرەپێدان و پێوەندی ئەندامەکانی ڕوەک دەکات. واتە کاری ڕواڵەتناسی، سیتۆلۆژی[3] و تۆوناسی[4] و کاری نێرومێیی گوڵەکان[5].

1. Taxonomy
2. Morphology
3. Cytology = Cell Biology
4. Agronomy
5. Pollination

- فیزیۆلۆژی[1]: کاری ناسین و زانینی کاروباری کیمیاوی، کۆندامی هەناسە، ئاوەخۆرە (بەشی ئاو و شیلە)، متابۆلیسم، کارلێک و کاردانەوەکانی ناو شانەکانی ڕووەک بۆ دروست کردنی مادەی خاو و پەروەردە و کانزانییەکان و بەرهەم هێنانی ڕەنگ و بۆن و تام و ئۆکسیژن لە ئەنجامی کارگەی فتۆسەنتێز.
- سیستماتیک یا تاکسۆنۆمی ڕووەکی (زانستی پۆلێنبەندی): زانستی پۆلێن کردنی زنجیرە و نەژاد و جۆر و بنەماڵەی ڕووەکەکان.

زانستەکانی سەرەوە هەموویان پێویستییان بە شیکردنەوە و پێناسەیەکی قووڵ هەیە تا وەکوو کەلێن و قوژبنی پڕ نهێنی ناو و دەرەوەی ڕووەک بناسینەوە. لێرەدا ئێمە تەنیا دەچینە سەر زانستی پۆلێنبەندی ڕووەکناسی.

لەو کاتەوە مرۆڤ دەستی کرد بە خواردن و بەکارهێنانی ڕووەکەکان، هەستی بە جیاوازی نێوان جۆرەکان وەکوو ڕەنگ، بۆ، تام، نەرمی، ڕەقی، ناسکی، ئەستووری، بەرزی، نەوی، شیرینی، تاڵی، ترشی و ژەهراوی کرد. پاش سەرهەڵدانی شۆڕشی کشتوکاڵی و هەڵبژاردنی ڕووەکەکان بۆ چاندن و خواردن و بەکارهێنانی دیکە، مرۆڤ توانی ڕووەک بە شێوازێکی ساکار پۆلێنبەندی بکات واتە خۆراک، دەرمان، جوانکاری، پیشەسازی و ژەهراوی.

تێئۆفێراست[2] (٢٨٠ پێش زایین) شاگردی ئەفلاتوونی حەکیم ٥٠٠ پۆل[3] ڕووەکی بە شێوازی دار، دارچک، دەوەن و بنچک و تایبەتمەندیەکانی گوڵ و مێوەی لە پەرتووکی (Historia Plantarum) پۆلێنبەندی کرد. پاشان لە سەدەی یەکەمی زایینیدا دیسکۆریدۆس[4] پزیشکی یۆنانی ڕووەکە دەرمانیەکانی لە ٦٠٠ تاکسۆندا پۆلێن کرد و لە پەرتووکی (Materia Medica) چاپ کرد. ساڵی ١٦٢٧ زایینی زانای

١. Physiology
٢. Theophraste
٣. Taxon
٤. Disoscorides

بریتـانی Jay Ray بەپێی کۆتیلیـدۆنی[١] تووەکـان ١٨٠٠ جۆر ڕووەکی تۆمـار کرد. پۆلێنبەندی ڕووەکەکان لە سەر شێوازی نەژاد و جۆر پاش Jay Ray دروست بوو. ســالّی ١٦٦٠ زایینی تێئۆفۆرت ڕووەکەکانی لە ســەر ســێ دەســتەی گوڵپەڕەی یەکپارچە[٢]، گوڵپەڕەی جیا[٣] و گوڵی بێ گوڵپەڕە[٤]، ڕیز و نەژاد[٥] و جۆر[٦] پۆلێنبەندی کرد. ئەم ڕووەکناســە توانی ٢٢٠ ڕیز، ٧٠٠ نەژاد (جنس) و ٩٠٠٠ جۆر ڕووەک پۆلێن ببەســتێت. بیرۆکە تازەکەی تێئۆفۆرت بووە هۆی ئەوە قۆناغ بە قۆناغ تۆمارکردنی جۆری ڕووەکەکان ڕووی لە زیـادبوون کرد. داهێنـانی ئامێری مـایکرۆســکۆپ لە ساڵەکانی ١٧٠٠ زایینی جووڵەیەکی بەهێزتری خستە تەنی پۆلێنبەندی ڕووەکناسان.

ســالّی ١٧٥٨ زایینی لینە[٧] قەشــە و ڕووەکناســی ســویدی بە شــوێن بیرۆکەکەی تێئۆفۆرتـدا دەرگایەکی تـازەی بە ڕووی پۆلێنبەندی گیـانداران کردەوە. کـارڵ لینە شــێوازی ناوی جۆرەکانی لەســەر ناوی دوانەیی[٨] و لەگەڵ کۆمەڵێک ڕێنمایی، پەرتووکێکی بە نـاوی (Systema Naturae) دەرکرد و ٧٧٠٠ جۆر ڕووەکی بەم شــێوازە دوانەییە تۆمار کرد. دواتر ئەم شــێوازە لە ژێر ناوی شــێوازی ناونیانی لینەیی یان ناوی زانســتی[٩] (ناوی لاتین) ناوبانگی دەرکرد. تا ئێســتاکەش زانســتی ڕووەکناسی لەسەر سیستەمی ناوی زانستی لینە دەڕواتە پێش.

لینە ناوی دوور و درێژی جۆرەکانی بەم ســیســتەمە تازەیە کرد بە دوو وشــەی کورتی نەژاد و جۆر. بۆ نموونە ناوی جۆرێک ڕووەکی بزگیلە لە ( Physalis amno ramosissime ramis angulosis glabris foliis dentoserratis) بوو بە بزگیلەی ئانگولاتا (*Physalis angulate* L.). لینە هەروەها لەســەر ژمارەی ئەندامی نێرینەی

---

١. Cotyledon
٢. Gamopetales
٣. Dialypetales
٤. Apetales
٥. Genus
٦. Species
٧. Carl Nilsson Linnaeus
٨. Binominal
٩. Scientific Name

گوڵەکان، ڕووەکەکانی بە ٢٤ دەستە دابەش کرد: Monodria (گوڵێک کە یەک ئەندامی نێرینەی هەبێ)، Diandria (گوڵێک کە دوو ئەندامی نێرینەی هەبێ) و هتد.

## ڕێنماییەکانی ناوی زانستی ڕووەك

سیستەمی ناونانی لینەیی لەسەر هەموو گیاندارانی سەر ڕووی زەوی جێبەجێ دەبێت.

١) ناوی زانستی ڕووەکەکانی جیهان بەپێی پێڕەونامەی ناوەندی ناونیانی جیهانی ڕووەکناسی[١] و بنکەی بنەماکانی کۆدی جیهانی ناوی ڕووەکەکان[٢] ئەنجام دەبێت. بەگشتی بنەمای سەرەکی ناوی زانستی هەمان یاسای ناوی دوانەیی لینەیە.

٢) پاش لینە ڕووەکناسان گەلێک داشکان و زیادکردن و چاکسازیان لە ناونیان و ڕێژەی تۆمارکردنی ڕووەکەکان ئەنجام دا. نوێنەرانی ڕێکخراوە و بنکەکانی ڕووەکناسی جیهان ساڵەکانی ١٨٩٢، ١٩٠٥، ١٩٠٧ و ١٩١٠ چەندین کۆنگرەی ستانداردکردنی یاساکانی ڕووەکناسی و ناونیانی لینەییان ڕێک خست. گرینگترین کۆنگرە ساڵی ١٩٠٥ بوو کە تەنیا تایبەت بوو بە پتەوکردن و گشتاندنی یاساکانی ناونیانی لینە. پاش ئەم کۆنگرەیە ساڵی ١٩٠٨ یاسایەکیان دەرکرد کە دەبێ بۆ هەموو ناوە زانستیە تازەکان پێناسە و ڕوونکردنەوەیەک بە زمانی لاتین ئامادە بکرێت. ساڵی ١٩٧٣ پێڕەونامەی گشتی و ستانداردی جیهانی ڕووەکناسی لە ژێر ناوی (IPNI: International Plant Names Index) گشتێندرا و چووە بواری جێبەجێ کردنەوە.

٣) پێنج بنەمای سەرەکی ناونیانی ڕووەکناسی:

یەکەم: ناوی زانستی ڕووەکەکان جیایە لە ناوی زانستی گیاندارانی دیکە. لەوانەیە

١. International Plant Names Index: IPNI

٢. Nomencalture International Code of Botanical: NICB

ناوێکی زانستی کە بۆ ڕووەکێک دادەنرێت وێکچوونی هەبێت لەگەڵ ناوی زانستی یەکێ لە جۆرەکانی زنجیرەی گیاندارانی دیکە وەکوو ئاژەڵ و مێروو. بۆ نموونە ناوی Cocropia هەم بۆ نەژادێکی پەپوولەیە و هەم ناوی نەژادێکی گەورەی ڕووەکە گەرمێنیەکانی بنەماڵەی Moraceae، یا Corydalis هەم ناوی نەژادێکی گیانداری مێروولەخۆرەیە و هەم نەژادێکی بنەماڵەی ڕووەکی شاتەرە.

دووهەم: ئەو ناوانەی کە لە ئاستەکانی تاکسۆنۆمیکی ڕووەکدا دادەنرێت بەپێی نموونەی تیپ[1] دەستنیشان دەکرێن. واتا ناوی هەر جۆرێک ڕووەک دەبێ لەسەر نموونەی تیپی ئەو ڕووەکە بێت کە بە ناوی نموونەی تیپ دەیناسن، هەروەها نموونەی تیپی هەر بنەماڵە بۆ هەر نەژادێک، نموونەی تیپی هەر نەژادێک بۆ یەک جۆر یان نموونەی تیپی هەر جۆرێک بۆ یەک ژێرجۆر و هتد، دادەنرێت.

سێهەم: ناوی زانستی یەک ئاستی تاکسۆنۆمی ڕووەک بەپێی کاتی بڵاوبوونەوەی ئەو ناوەیە. یانێ ناوی دروست ناوێکە بەگوێرەی یاسا و کۆدی جیهانی زووتر چاپ کرابێت. کەواتە لەپێشدا ماف بەو ناوانەیە کە لینە لە بەرواری ١٧٥٣/٥/١ ناوی زانستی ڕووەکەکانی لە پەرتووکی (Species plantarum) بڵاو کردەوە.

چوارەم: هەموو ئاستەکانی تاکسۆنۆمیکی تەنیا ڕێگەیان هەیە یەک ناویان هەبێت کە بەپێی یاسای ناونیانی ڕووەکناسی کۆنترین ناو قەبووڵ دەکرێت (بێجگە لە بابەتی جۆر).

پێنجەم: ناوی زانستی هەموو ئاستەکانی تاکسۆنۆمیکی (زنجیرە[2]، لق[3]، پۆل[4]، ڕیز[5]، بنەماڵە[6]، نەژاد[7] و جۆر[8]) پێویستە بە زمانی لاتینی بنووسرێ و تۆمار بکرێت.

---

١. Type specimen
٢. Kingdom
٣. Division
٤. Class
٥. Order
٦. Family
٧. Genus
٨. Species

٤) بەکارهێنانی ناوی زانستی بۆ ئەوەیە کە ناوێکی جیهانی بۆ ناسین و زانینی هەموو جۆر و شێوەجۆری گیانداران بەتایبەت ڕوەک لەبەر دەستدا بێت و هەموو ڕوەکناسان، گیادەرمانان، خوێندکارانی کشتوکاڵ و ژینگە، پزیشکان، گەشتیاران و جوتیاران، ئەگەر بە نیاز بوون زانیاری زیاتر لە سەر جۆرێکی تایبەتی ڕوەک وەربگرن، بە ئاسانی ئەنجامی توێژینەوە و تاقیکردنەوەکانی هەموو بنکە و زانکۆ و تاقیگەکانی ڕوەک لە جیهاندا کە لە سەر ئەو جۆرە ڕوەکە کاریان کردووە، وەر بگرن.

٥) ناوی خۆماڵی و ناوچەیی تەنیا لە شوێنێکی سنوورداری شار، وڵات یان کیشوەرێکدا دەناسرێ بەڵام ناوی زانستی جیهانیە.

٦) ناوی زانستی گشتگیر دەتوانێت هۆی پشتیوانی و خزمەت بە بواری یەکگرتوویی و ستاندارد کردنی هەمبەرەکانی زمانی خۆماڵی کوردی ڕوەکەکان بێت. کاتێ ڕوەکێک یەک ناوی زانستی بۆ دانرا، ئیدی بە ئاسانی دەتوانین هەمبەری کوردی بۆ دابنین و یەکگرتوویی ناوی خۆماڵیش ببەخشین بە هەمبەرەکان. بۆ نموونە ناوی زانستی *Equisetum arvense* L. وەک هەموو جیهان قەبووڵمان کردووە ئێستا دانانی هەمبەرەکانی کوردی (گیافیزۆک، گیاقەفقەفە و قەفقەفۆکە) بەرامبەر بەم ناوە زانستیە دەتوانێت لە زمانی کوردیشدا ئەم سێ ناوە جێگیر بمێنێت و ئیدی بۆ ناوی ڕوەکێکی دیکە بەکار نەبرێت. چونکە ئەگەر زمانی زانستی نەبێت ئێمە گەلێک ناومان هەیە بۆ یەک یان چەندین جۆر ڕوەک بەکار دەچێت. ئەم پرژ و بڵاویە لە هەموو زمانەکاندا هەیە و زۆر کێشەی ناسین و کاری دەرمانی و خۆراکی و ژەهراوی بوونی هێناوەتە گۆڕێ. چونکە ئەگەر پەرتووکێکی دەرمانی یان ئەزموونی حەکیمێکی خۆماڵی ئاماژە بە سوودی خۆراکی یا دەرمانی ڕوەکێک دەکات و بە ناوێک دەیناسێت، ئەگەر لە شوێنێکی دیکە کەسێک نیازی بێت بەکاری بهێنێت ئەوە ئەگەر تەنیا لە ڕووی ناوەکەی دەرمانەکە دابین بکات ڕەنگە ئەو ناوە لە گوند یا ناوچەی ئەواندا ناوی ڕوەکێکی دیکە یا تەنانەت ژەهراویش بێت.

بۆ نموونە لە ناوچەی سنە و مەریوان جۆرێک لە نەژادی چنوور هەیە کە بە

(بزنەڕیشە، ڕیشەبزنە، بزنەڕیش و ڕیش بزن)[1] دەیناسن هەر ئەم ناوە لای سەقز و تیکاب بۆ نەژادی ڕووەکی (جەوڕنە، خوم، خومە و ژانوبا)[2] بەکار دەبرێت. ئەم دوو ڕووەکە لە زنجیرەی ڕووەکناســــی لق، ڕیز، بنەماڵە، نەژاد و جۆر لە یەک جیاوازن. ڕووەکی Tomk. & M. Pimen. *Ferulago bernardi* ســـەر بە لقی Magnoliphyta، ڕیزی Umbellales، بنەماڵەی Apiaceae، نەژادی Ferulago و جۆری bernardi، بەڵام ڕووەکـــی *Ephedra major* Host. ســــەر بە لـقـی Gntephyta، ڕیـــزی Ephedrales، بنەماڵەی Ephedraceae، نەژادی *Ephedra* و جۆری *major*.

دیارە هەبوونی ئەم جیاوازییە تەنیا بە یارمەتی ناوی زانستیەکە دەتوانین تووشی لاڕێ نەبین و ئەم لێکچوونە لە ناوە کوردیەکەدا بەرەو هەڵەی دەرمانی و خۆراکیمان نەبات. لە پەرتووکی "فەرهەنگی ڕووەکناســـی کوردســـتان" هەوڵم داوە گەلێک بابەتی هاوشێوەی ئەم دوو ڕووەکەی سەرەوە بەرەو ستاندارد کردن و یەکگرتوویی زمانی کوردی بەرم. بۆ نموونە بە حوکمی ئەوە کە هەمبەری *Ephedra major* Host. لە فارســـیدا دەبێ بە (ریش بز)[3]، ڕەنگە خەڵکی لای ســـەقز و تیکاب ئەم ناوەیان لە فـارســـیەوە وەرگرتبێت. هەرچەنـد لاســـک و قەد و گەڵای هەر دوو ڕووەکەکە هاوشێوەی ڕیشی بزن تاڵ تاڵ و درێژن. لەوانەیە ئەم وێکچوونییە لە ناوی کوردی ئەم دوو ڕووەکەدا ئاســـایی بێت بەڵام دانانی (بزنەڕیشـــە، ڕیشـــبزن و بزنەڕیش) بۆ هەر دوو ڕووەکەکە گیادەرمانان و دەرمانســـازان تووشـــی هەڵە دەکات و دەرمانی هەڵە دەگرنەوە بۆ نەخۆش. لە پەرتووکی فەرهەنگی ڕووەکناســـی کوردســـتاندا بەرامبەر بە *Ephedra major* Host. هەمبەرەکانی دیکەی کوردی وەکوو (جەوڕنە، ژانوبا، خومە و خوم) دانراون و (بزنەڕیشـــە، ڕیشـــبزن، بزنریش و بزنەڕیش) بۆ ڕووەکی *Ferulago bernardi* Tomk. & M. Pimen. هاتوون تا وەکوو ئیتر ئەم ناڕوونی و تێکەڵاویە نەیتە ئاراوە.

٧) ئەگەر سەیری زمانەکانی دنیا بکەین جاری وا هەیە تەنانەت بۆ یەک نەژادی

---

١. *Ferulago bernardi* Tomk. & M. Pimen.

٢. *Ephedra major* Host.

٣. بە واتای ڕیشی بزن

ڕووەک چەندین ناوی جۆراجۆر و هاوبەش لەگەڵ نەژادی ڕووەکانی دیکەدا بەکار دەبرێت. لە ناوی جۆردا ئیدی ئەم جۆراجۆری و تێکەڵاویە زۆرتر بەرچاو دەکەوێت. ئەگەر بڕوانینە زمانەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی، هێشتا ناوی یەکگرتوو بۆ زۆربەی جۆر و نەژادەکان دانەنراون و زۆر جار ڕووەکناس و گیادەرمان و پسپۆڕانی کارگە و دەرمانسازان بەهەڵەدا دەچن. ناوی زانستی بەتایبەت بۆ بواری کیمیا و پزیشکی و دەرمان سەداسەد پێویستە چونکە گەلێک جۆری ڕووەکی دەرمانی و خۆراکی لە ڕواڵەتدا هاوشێوەی جۆرە ژەهراوی یان کەمسوودەکانە. ڕەنگە ڕووەکناس هەڵەیش بکات کوتوپڕ شتێکی نامۆ و مەترسیدار ڕوو نەدات بەڵام ئەگەر گیادەرمان یا پزیشک و دەرمانسازێک جۆرێک ڕووەکی دەرمانی و ژەهراوی بەهەڵە بناسێت، گیانی کەسێک یان کەسانێک لە کاتێکی نزیکدا دەکەوێتە مەترسیەوە.

٨) نووسینی ناوی زانستی تەنیا بە شێوەی لاتینە. ڕێنووسی زمانەکانی دیکە وەکوو کوردی و فارسی و عەرەبی بۆ نووسینی ناوی زانستی دروست نییە، مەگەر بۆ لەبەرکردنی ئاسانتری ناوەکە بێت. وەکوو ناوی زانستی گوڵەشلێرەی کوردی (*Fritillaria kurdica* Boiss. & Noe.: فریتیلاریا کوردیکا).

٩) هۆی ئەوە کە ڕووەکناسان و هەموو تاکسۆنۆمیستەکان زمانی لاتینیان بۆ ناوی زانستی هەڵبژاردووە ئەوەیە کە شێوازی ناوی زانستی لینەیی لە سەدەکانی ١٨ و ١٩ زایینیدا پەرەی سەند و ئەو سەردەمە لە ئەورووپا زمانی لاتین چەشنی زمانی یەکگرتووی زانستی دەناسرا. جا ئەو کاتە لاتین زمانی دووهەم و زمانی زانستی گشت ئەرووپا و ئەمریکا و هەندێ شوێنی دیکەی جیهان بوو. ئەم زمانە ئێستاکە تەنیا ڕێنووس و ڕێزمان و فەرهەنگی وشەدانی ماوەتەوە و ئاخێوەر و بەکارهێنەری زارەکی نییە.

١٠) ناونیانی ڕووەکەکان و گیاندارانی دیکە خاوەنی کۆد و نیشانەی سەربەخۆن و لێک جیان.

(١١) کاتێک ڕووەکناسێک یەکەم جار جۆرێک ڕووەک دەدۆزێتەوە، پێویستە نموونەیەکی تەواو و تۆکمەی ئەو جۆرە بە هەموو ئەندامەکانیەوە(گوڵ، گەڵا، لاسک، ڕیشە و تەنانەت توو) ڕەوانەی ڕێکخراوی جیهانی IPNI بکات هەتا لەوێ لە سەر ئەم نموونە تیپە ناوی زانستی بۆ هەڵبژێردرێت و لە هێرباریۆمی ڕێکخراوەکەیشدا هەڵبگیردرێت. ئەم نموونەیە بە Type یا Holotype ناودێر دەکرێت. ئەگەر ڕووەکناس لەجیاتی یەک نموونە، چەندین نموونە ڕەوانە بکات یەکێک لەوانە دەکرێت بە Holotype و ئەوانی دیکە بە Paratype. هەروەها ئەگەر ڕووەکناس سەرەڕای نموونەی Holotype کە بۆ (IPNI)ی ناردووە، نموونە یا نموونەکانی دیکە بنێرێت بۆ ڕێکخراوەکانی دیکە لێرە ئەم نموونەیە بە Isotype دەناسرێت. جاری وایە ڕووەکناس Holotype دەسنیشان ناکات بەڵکوو لە لایەن ڕووەکناسانی دیکەوە نموونەیەک بە Lectotype دیاری دەکەن. هێرباریۆمەکان هەمیشە بۆ هەر تیپێک سێ نموونە هەڵدەگرن تا هەمیشە یەدەکی نموونەیان هەبێت و نموونەکانیان تاقانە نەبن.

هێرباریۆمی شوێنەکانی دیکەی گیادەرمانی و ڕووەکناسی بەردەوام هەوڵ ئەدەن بۆ هەر تیپێکی ڕووەک زیاتر لە سێ نموونە پاشەکەوت بکەن. بۆ ئەوەی کە ئەگەر کەسێک نیازی توێژینەوە و تاقیکردنەوەی زانستی هەبوو، و ئەو ڕووەکە لە سروشتدا بە ئاسانی دەست نەکەوت یان تەنانەت گومانی لەناوچوونی لێ بوو، ئەوە بەیارمەتی نموونە یەدەکیەکان کاری توێژینەوە و تاقیکردنەوە و تەنانەت زیندووکردنەوەی ڕووەکەکە نەوەستێت.

لە بنکە و ناوەندەکانی فیلۆژێنێتیک[1] و بواری گشتی کار کردن لە سەر ژێنێتیکی گیاکان، کاتێ نموونەی تیپی ڕووەکەکان کۆ دەکەنەوە و لە هێرباریۆم دەیپارێزن، هەوڵ ئەدەن تەواوی ئەنجامی توێژینەوەکانی خۆیان یان شوێن و سەنتەرەکانی دیکەی دنیا کە لە سەر ئەو جۆرە ڕووەکە ئەنجام بووە کۆی بکەنەوە و هەڵیبگرن. جا ئەگەر توێژەر یان خوێندکارێک بە نیازی توێژینەوە بێت لە سەر ئەو ڕووەکە، سەنتەرەکە ئەو توێژینەوانە کە خۆیان یان سەنتەرەکانی دیکەی وڵات یا خود جیهان

١. Phylpgenetics

ئەنجامیان داوە بە توێژەرەکە ڕادەگەیێنێت و بابەتی تازە و کردنەوەی ڕووی تازە لە سەر ڕوەکەکەی پێ پێشنیار دەکات.

بۆ نموونە ئەگەر کەسێک کار لە سەر ئالکالۆئیدی ئیمپێریسینی ناو سەلکی گوڵە شلێر بکات دەبێ بزانێت کاری هاوشێوە نەکراوە ئەگینا دەتوانێت کار لە سەر ئالکالۆئیدی دیکەی ناو سەلکی ئەم گوڵە بکات بە ناوی (فێرتیسین). ئەم شێوازە بۆ پرۆسەی توێژینەوە و گرێدانی هەموو توێژینەوەکان بەیەکەوە دەتوانێت بازنەیەکی تەزبێحاسا دروست بکات و توێژەر بە ئاسانی بگات بە هەموو زانیاریەکانی ئەنجامبوو لە سەر یەک جۆری دیاریکراوی ڕوەک.

بنکەکانی توێژینەوەی ڕوەکناسی و فیلۆژێنێتیک بۆ پاراستنی جۆری هەموو ڕوەکەکانی فلۆرای ناوچە یا وڵات، خاوەنی هێرباریۆمی ڕوەکناسین. هێرباریۆمی ناوبراو نموونەی تیپی ڕوەکەکان دەپارێزێت و سەرجەم زانیاری پێویست هاوپێچ دەکەن تا توێژەر بە ئاسانی و لە کەمترین کاتدا بتوانێت نموونەی زیندووی ڕوەکەکە بە دەست بهێنێت و کاری لە سەر بکات.

بۆ نموونە سەبارەت بە گوڵە شلێرەی جۆری (*Fritillaria imperialis* L.) لە سنووری پارێزگای ئیلام: ڕوەکی گوڵە شلێرە لە بەرزاییەکانی سەرووی ١٥٠٠ مەتر لە ئاستی دەریا و ژینگەی کوێستانی و باران و بەفرگردا شین دەبێت وەکوو کێوی تەنگەدۆڵاو و داوێنی چیای مانشت لای ئیلام، هەروەها لە کەشی دەڤەری ئیلامدا کۆتایی مانگی نەورۆز شین دەبێ و لە کۆتایی باران بارین واتا مانگی جۆزەردان تەواو دەبێت. ئەگەر کاتی کۆکردنەوەی نموونەی تیپی گوڵە شلێر ئەم زانیاریانە و خاڵی (GPS) شوێنی نموونەکە و هەروەها زانیاریەکانی دیکە لە سەر بەرچەسپ[١] نموونەکە بنووسرێت و لە هێرباریۆمەکەدا بپارێزرێت، ئەوە هەر کاتێک لە دەڤەری ئیلام کەسێک بیەوێت کار و توێژینەوە لە سەر ئەم جۆرەی گوڵە شلێر بکات یەکسەر لە مانگی گوڵان و جۆزەردانی بەهاردا دەچێتە بەرزاییەکانی سەرووی ١٥٠٠ مەتری ئیلام و یان تەنانەت دەچێتە خاڵی (GPS) ژینگەی نموونە تیپیکەکە و بە ئاسانی جۆری ڕوەکی گوڵە شلێری (*Fritillaria imperialis* L.) دەست دەکەوێت.

١. Label

١٢) بە ڕیزەوە ئاسـتەکانی تاکسـۆنۆمیکی ڕووەکەکان بە پاشـگرەکەیانەوە بەم شـێوەیە دەبێت: لق بە پاشـگری phyta، پۆل بە پاشـگری opsida، ڕیز بە پاشـگری ales، بنەماڵە بە پاشگری aceae، هۆز[١] بە پاشگری eae، نەژاد، جۆر، ژێرجۆر[٢]. لە ئاستی نەژاد و جۆردا پاشگرەکان دەتوانن زۆر بن بەڵام دەتوانن زۆرینە ئەمانە بن: پاشگرەکانی نەژاد (a, us, um, es, on) و جۆر (a, us, um, es, on).

بۆ نموونە بە ڕیزەوە دەرخسـتنی ئاسـتی ژێرجۆری شـیرنۆکەی دالاهوویی لە زنجیرەی ڕووەکەکانەوە تا ژێرجۆر: زنجیرەی ڕووەکەکان، لقی Magnolipyta، پۆلی Magnoliopsida، ڕیـزی Asterales، بـنەمـاڵەی Plantaginaceae، هـۆزی Vernonieae، نەژادی Veronica، جـۆری macrostachya، ژێـرجـۆری schizostegia:

*Veronica macrostachya* Vahl. subsp. *schizistegia* (Bornm.) M. A. (Fischer.)

١٣) لە نیشاندانی ڤارایەتی و ژێرجۆر لە پاش ناوی جۆرەوە، دەبێ کورتکراوی (var.) ڤارایەتی[٣] و (subsp.) ژێرجۆر دابنرێت پاشـان وشـەکە و ناوی ڕووەکناسـەکە کە ڤارایەتی یا ژێرجۆرەکەی تۆمار کردووە، بنووسرێت. لێرەیش وشەی ڤارایەتی و ژێرجۆرەکە بە فۆنتی ئیتالیک بێت، وەکوو:

ژێرجۆرێکی ڕووەکی تـاڵینتووسـی کوردی *Picris strigosa* M. B. subsp. *kurdica* Lack. و ڤارایەتیەکی واشێرە *Poa balbosa* L. var. *vivipara* Koel.

١٤) لە یاسـای ناوی زانسـتیدا نابێت هیچ ڕووەکێک زیاتر لە یەک ناوی هەبێت. هەندێ جار ڕووەکناسـان پێشـتر جۆرێکیان تۆمار کردووە یان ڕاسـتکردنەوەیان بۆ ناوێک کردووە، لێرەدا پاش ناوی سـەرەکی نیشـانەی (=) دادەنرێت و ناوەکەی

١. Tribe

٢. Sub species

٣. Variety

دیکەش دەنووسرێت، بەڵام بۆ ڕووەکناسان هەمیشە ناوی یەکەم قەبووڵترە. لەوانەیە ئەم دووبارەکاری و هەڵە و ڕاستکردنەوەیە یەک دوو جار ڕوو بدات، وەکوو: جاری وایە ڕووەکێک پێشتر لە نەژادێک یان جۆرێکی دیکەوە بەهۆی هەڵەکاری یا نەزانینەوە تۆمار کراوە بەڵام دواتر ڕووەکناسان پێیان زانیوە و ناوە دروستەکەیان داناوە. لەم دۆخەیشدا هەر ناوی یەکەم پەسەندە، وەکوو:

گادەمەی ئیرەڤانی

*Verbascum suworowianum* (C. Koch.) O. Kuntze. var. *suworowianum* Revis. = *Celsia suworowianum* C. Koch.

گادەمەی ئەڵوەندی

*Verbascum nudicaule* (Wydi.) Takht. = *V. persicum* (C. A. Mey.) O. Kuntze. = *Celsia nudicaule* (Wydi.) B. Fedtsch. = *Celsia persica* C. A. Mey. = *Scrophularia nudicaule* Wydl.

١٥) ناونیانی دەستەیەکی تاکسۆنۆمیکی بەپێی چڕی و بڵاوبوونەوەیە، بۆ نموونە: بنەماڵەی (Poaceae) بەهۆی زۆری و چڕی زۆرینەی چیمەنەکان، یان نەژادی (Cucurbita) لە لاتیندا واتای کوولەکەی هەیە و لە بنەماڵەی (Cucurbitaceae) لە نێوان ٩٠ نەژاد و ٧٥٠ جۆر ڕووەکی ئەم بنەماڵەیەدا ناوی ئەم نەژادەیان بەهۆی زۆری کوولەکە لە جیهان، بۆ ئەم بنەماڵە هەڵبژاردووە.

١٦) پرۆسەی گشتگیری ناونیانی لینەیی لە بنکە و زانکۆکانی جیهاندا گەلێک ڕاستکردنەوە و زیادکردن و هەموارکردنەوەی بەخۆیەوە بینیوە، بۆ نموونە ناوی هەندێ لە بنەماڵە ڕووەکیەکان پێشتر بە پاشگری (aceae) دانەنرابوون. لەم ساڵانەی دواییدا ئەم ڕێژە کەمەیش هەموار و چەشنی هەموو بنەماڵە ڕووەکیەکان یەکدەست کرانەوە، وەکوو: بنەماڵەکانی

Hypericaceae = ،Brassicaceae = Cruciferae ،Poaceae = Gramineae ،Lamiaceae = Labiatae ،Apiaceae = Umbelliferae ،Guttiferae Asteraceae = Compositae

١٧) ئەگەر ناوی جۆرێک ڕووەک بە هەر هۆیەک گۆڕدرا، دەبێ ناوی ڕووەکناسی یەکەمی تۆمارکەر پاش ناوی جۆر بخرێتە ناو کەوانە و دواتر ناوی ڕووەکناسی تۆمارکەری تازە بهێندرێت، وەکوو: ڕووەکی خواخورکە *Capsella bursa-pastoris* (L.) Medik. یا زرەبێژان *Tripelurospemum disciforme* (C. A. Mey.) Schultz-Bip.

١٨) ناوی زانستی هەر ڕووەکێک پێک هاتووە لە: ناوی نەژاد، جۆر و ناوی ڕووەکناس

١٩) ناوی جۆری یەک ڕووەک دەبێت لەگەڵ ناوی نەژاددا بهێنرێت، ئەگینا بە تەنیا هیچ واتایەکی نییە. دەکرێ ناوی نەژاد بە تەنیا ئاماژەی پێ بکرێت بەڵام تا ناوی نەژاد نەبێ ناوی جۆر هیچ واتایەک نادات.

٢٠) زمانی فەرمی و بەکار هێنانی وشەکان لەباری ڕێزمانەوە لەسەر ناوی لاتینە، بۆیە هەندێ جار ناوی زانستی بە ناوی لاتین دەناسرێت. واتای وشەی جۆر دەبێ تایبەتمەندیەک لە ڕواڵەت یان ناوەرۆکی نەژادی پێوە بێت. وشەی سەرەتا کە نەژادە دەتوانرێت کەمتر بگۆڕدرێت بەڵام بۆ وشەی جۆر پێوەندی هەیە بەوەی کام ڕووەکناس و لە کام وڵات جۆری تازەی ئەو ڕووەکەی دیوەتەوە. کاتێ ڕووەکناسێک لە کوردستان جۆرێکی تازە لە ڕووەکێک دەبینێتەوە بە ئارەزووی خۆی ناوێکی کورت و ڕوون و ڕەوانی بۆ دائەنێت و ئەینێرێت بۆ بنکەی ڕووەکناسی جیهانی تا تۆمار بکرێت. خۆشبەختانە لەم دۆزراوە تازانەدا زۆربەی ڕووەکناسانی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان ناوی وڵاتی کورد و ماد و کوردستان دادەنێن یان ڕووەکناسانی دیکە ناوی شار و کێو و دەشتی ژینگەی ئەو ڕووەکەی بۆ دەسنیشان دەکەن.

وەکوو: گوڵەشلێرەی کوردی (*Fritillaria kurdica* Boiss. & Noe.)، پیوازی خارپووتی یا پیوازی زاگرۆسی (*Allium kharputense* Freyn & Sint)، هەنگەونی

کـاردۆکی یـا گوێنی کوردسـتـانی (Astragalus carduchorum Boiss. & Hausskn.)، هەنگەونی مەریوانی (Astragalus marivanensis Podlech & Maassoumi.)، جوالدڕەی ئەلوەندی (Cousinia elwenensis Bornm.)، جوالدەڕی قەرەداغی یا جوالدڕەی سلێمانیەیی (Cousinia kopi–karadaghensis Rech. f.)، جوالدڕەی سەردەشتی (Cousinia sardashtensis Rech. f.)، شەکرۆکەی ئیلامی (Echinops elymaiticus Bornm.)، تەنانەت لە ئاستەکانی خوارەوەی جۆریشدا بەم شێوەیە ئەنجام دەبێت، وەکوو گۆزروانی کوردی (Anchusa italica Retz. var kurdica Gusuleac.)

(٢١) ناوی ڕوەک دەبێ لەگەڵ ناوی ڕوەکناسی بنووسرێت، چونکە ناوی ڕوەکناس پێناسەیەکی سەرەکیە بۆ ناوی ڕوەک

(٢٢) ناوی نەژاد: لە باری ڕێزمانی لاتینەوە هەمیشە ناوی تاکە. دەکرێت لە هەموو سەرچاوەیەکی زمانەکانی دیکە ئەم ناوە تاکە وەربگیردرێت بە مەرجێک یاسای زمانی لاتین تێک نەدات. بۆ نموونە دەکرێت ناوی کەسایەتیەکی گەورەی ڕوەکناسی بێ وەکوو: Linnaea بە ناوی لینە، Dioscorea بە ناوی دیسکۆردۆس و Jeffersonia بە ناوی جێفرسۆن. هەندێ ناوی نەژاد ڕاستەوخۆ لە زمانی لاتین وەرگیراوە وەکوو: Narcissus (نێرگز) و Viola (وەنەوشە). هەندێ جار ناوی نەژاد لە ڕووی شێوازێکی تایبەتیەوە وەردەگیردرێت وەکوو Hepatica بەهۆی ئەوە کە گەڵاکانی ئەو نەژادە چەشنی جەرگی مرۆڤە و لە زمانی لاتیندا هێپاتیک یانێ جەرگ

(٢٣) پیتی سەرەتای ناوی نەژاد هەمیشە دەبێ بە گەورە بنووسرێت، وەکوو: بەڕوو (Quercus)، سوێسنە (Lilium)، هەڤرست (Acer)، وەنەوشە (Viola) و بی (Salix).

(٢٤) ناوی جۆر: وشەیەکە لە سەر یاسای ڕێزمانی لاتین کە زۆرتر تایبەتمەندی جۆر نیشان ئەدات بەڵام بە تەنیا ناوێکی نامۆیە وەکوو وشەی (alba) بە واتای لاتینی سپی لە ناوی بەڕووی سپی (Quercus alba) یان (rubens) بە واتای

ســوور لە ناوی کاژی نوئێل یا کاژی ســوور (*Picea rubens*)، یان وشــەی جۆر دەتوانێت نـاوی شـــوێنێک بێت وەکوو Kurdistanica، Persica و Afghanica خاڵێکی گرینگ ئەوەیە ئەگەر ئاخری وشـــەی جۆر پیتی دەنگدار یان (er) بوو پیتی (i) پێ زیاد دەکرێ وەکوو *Bromus rechingeri* و ئەگەر پیتی بێدەنگ بوو (ii) زیاد دەکرێ وەکوو *Caesalpinia gilleesii*

٢٥) ناوی جۆر هەمیشـە دەبێ بە فۆنتی ئیتالیک بنووسـرێت یان ئەوەیکە هێڵێک بە ژێریدا بکێشرێت، وەکوو <u>*Onobrychis ardalanica*</u> Bornm. (خاشەی ئەردەڵانی یا خاشەی سنەیی) و <u>*Verbascum assurense*</u> Boiss. & Hand-Mzt. (گادەمەی ئاسووری).

٢٦) ئەگەر بۆ دانانی تایبەتمەندی وشـــەی جۆر دوو وشـــە پێویســـت بێت، لەم دۆخەدا لە نێوان دوو وشـەکەدا هێڵێک چکوولەی سـەرخەت دادەنرێت. ئەم دۆخە لە نـاوی زانســـتیـدا زۆر دەگمەنە. وەکوو: ڕووەکی زیزڕەمەرزە *Ziziphus spina-christii* (L.) Wild.

٢٧) ناوی ڕووەکناس: پیت یان وشــەیەک کە دوای وشــەی جۆر یان ئاســتەکانی خوارەوەی جۆر دێت ئەوە پیتی یەکەم یا کورتکراوی ناوی ئەو ڕووەکناســـەیە ئەو ڕووەکەی یەکەم جار لە جیهاندا تۆمار کردووە، وەکوو لینە (L. Linnaeus)، هادسۆن (Huds. Hudson) و بێنتام (Benth. Bentham). پاش ناوی ڕووەکناس پێویســـتە خاڵ (.) دابنرێت. ناوی ڕووەکناس زۆرتر بە شـێوەی کورت دەنووسـرێت بۆ نموونە لە جۆرەکـانی نەژادی گوڵەزیوا (زەمبەق) چەنـدین ڕووەکنـاس جۆرەکـانیـان تۆمـار کردووە:

*Iris pseudocaucasica* Grossh.، *Iris meda* Stapf.، *Iris ochroleuca* L.، *Iris reticulate* M. B. var. *bakerana* Foster.، *Iris acutiloba* C. A. May.

٢٨) پیتی یەکەمی نەژاد و ناوی ڕووەکناســـان بە فۆنتی گەورە دەنووســـرێت،

وەکوو: دارعەناو .*Ziziphus jujube* Mill یا گوڵە پەپووی هەولێری *Taraxacum neo-spurium* V. S.. بەڵام لە نـاوی جۆردا وشـــەی جۆر بە فۆنتی بچووک دەنووســـرێت مەگین ناوی جۆر ناوی کۆنی یەک نەژاد بێ (ئەم حاڵەتە زۆر کەمە). وەکوو: ڕووەکی گەنمەشامی (*Zea Mays* L)، توتن (*Nicotiana Tabacum* L.) و تاتووڵە (*Datura Stramonium* L.). دەیشـــکرێت وەک زۆرینە پیتی یەکەمی ناوی ئەم جۆرانەش بە پیتی بچووک بنووسرێت.

٢٩) چەندین تایبەتمەندی ناوی زانستی بۆ وشەی جۆری ڕووەک:

- جۆری دەرمانی (officinalis) و کشتوکاڵی (sativum, sativus, sativa)
- پێکهاتەی دەرمانی یا مادەی کیمیایی ناو جۆر (mannifera)
- ڕەنگی تایبەتی گوڵ یا ئەندامانی دیکە جۆر، وەکوو ســـپی (alba) و ڕەش (nigra)
- ژینگەی سەرەکی ڕسکانی جۆر، وەکوو دەشت (arvensis) و چیا (montana)
- جۆری گشتی و ئاسایی جۆر (vulgaris)
- وڵاتی ژینگەی جۆر (kurdistanica)
- شوێنی کۆکردنەوەی یەکەم نموونەی تیپی جۆر (elymaitica) ئیلام
- تایبەتمەندی ڕواڵەتی جۆر (monophyllum) واتا یەک گەڵا
- ئەندازەی ڕواڵەتی جۆر وەکوو (minus) بۆ بچووک و (major) بۆ گەورە
- لە زمانی لاتینیدا تایبەتمەندی و سیفەتی وشەی جۆر بە نێر (us)، مێ (a) و بێلایەن (um) دەسنیشان دەکەن، وەکوو *Arum acolantum*، *Medicago sativa* و *Carthamus tinctorius*
- کاتێک لە وتار و نووسراوێکدا پێویستە چەندین جار ناوی زانستی جۆرێک دووپات بکرێتەوە، دەکرێت یەکەم جار ناوەکە بەتەواوی بنووســـرێت و دواتر پیتی یەکەمی نەژاد و ناوی تەواوی جۆر بهێندرێت، وەکوو: *A. macolamtum*
- sp. لە پـاش نەژادەوە یـانێ جۆرێکی نەنـاس و نـامۆ لەو نەژادە، وەکوو (*Poa* sp.) لێرەش تەنیا ناوی نەژادەکە بە ئیتالیک دەنووسرێت
- spp. لە پـاش نەژادەوە یـانێ چەنـد جۆر لە نەژادێکی ڕووەک، وەکوو

(*Cousinis* spp.) لێرەش تەنیا ناوی نەژادەکە بە ئیتالیک دەنووسرێت

٣٠) بۆ یەکەی بنەماڵە، ناوی نەژادێک هەڵدەبژرێن کە زۆرینە و تایبەتمەندی بەرچاوی ناو نەژادەکانی هەبێت، وەکوو (viola) لەگەڵ پاشگری بنەماڵەیی (aceae) دەبێتە (Violaceae). لە زمانەکانی دیکەشدا بۆ ناوی بنەماڵە کارێک هاوچەشن دەکرێت بەشێوەی خۆماڵی تا ڕوەکەکان بۆ خەڵکی ئاسایی ئاسانتر بناسرێن و جیا بکرێنەوە.

بۆ نموونە لە فارسیدا بە چەندین پاشگرەوە لەپاڵ نەژادێکی زۆرینە بنەماڵەی ڕوەکەکان دەناسرێن:(گندمیان، نعناعیان، مرکبات، پیازسانان، کلمسانان، بنفشەسانان، جعفریسانان، بقولات، کدوئیان، ارکیدەسانان). لە زمانی کوردیش هاوچەشنی فارسی بەم شێوازە دەکرێت: چیمەنیەکان[١]، پوونگەییەکان[٢]، پرتەقاڵیەکان[٣]، پیازیەکان[٤]، کەلەرمیەکان[٥]، وەنەوشەییەکان[٦]، مەندییەکان[٧]، دانەوێڵەییەکان[٨]، کوولەکەییەکان[٩]، سالمەییەکان[١٠] و هتد

## پێشینەی پۆلێنبەندیەکانی ڕوەکناسی

- **پۆلێنبەندی کۆن[١١]**

ئەم پۆلێنبەندیە لەسەر یەک یا دوو سیفەت و تایبەتمەندی ڕوەک دامەزراوە. بۆ

١. Poaceae
٢. Lamiaceae
٣. Rutaceae
٤. Liliaceae
٥. Brassicaceae
٦. Violaceae
٧. Apiaceae
٨. Fabaceae
٩. Cucurbitaceae
١٠. Orchidaceae
١١. Artificial Classification

نموونە پۆلێن کردن بەپێی ژمارەی ئەندامانی نێر و مێ، شـــێوازی گەڵاکان، تەمەنی ڕووەک، بەکـارهێنـان (ژەهراوی، دەرمـانی، خۆراکی، جوانکـاری، گەشـــتیـاری و پیشە سازی)، وەرزی پشکوتن و هتد. سەرەتا لینە ئەم پۆلێنبەندیەی دانا بەڵام پاش ماوەیەک کەوتە بەر ڕەخنە و پێشـنیاری زۆری ڕووەکناسـانەوە. بۆ نموونە ڕەخنەی ئەوە کە داری بی[1] و گیای شـیرنۆکە[2] لە دەسـتەی Diandria پۆلێن دەکرێن کەچی لە دوو بنەماڵە و جنس و ڕیزی جیاوازن. ئێستاکە ئەم شێوازە تەنیا بۆ دانانی کلیلی ڕووەکناسی و جیاکردنەوەیەکی کەم لە فلۆرای یەک ناوچەدا بەکار دەبرێت.

- **پۆلێنبەندی سروشتی[3]**

لەم شـــێوازەدا هەوڵ دراوە ئەو ڕووەکـانەی کە خـاوەنی زۆرترین وێکچوونی دەرەکی و نـاوەکین بخرێنە یەک دەســـتەوە وەکوو وێکچوونی ڕواڵەتی ڕووەک، کۆندامی گەشـە، شـێوازی جێگیربوونی گەڵاکان لەسـەر لاسـک، پان و باریک بوونی گەڵا و هتد. بنەمای سـەرەکی ئەم پۆلێنە جۆری ڕووەکە. بۆ دانانی یەک جۆر چەندین نیشـــانە و دروشـــمی ڕواڵەت و ناوەرۆکی ڕووەک ڕەچاو دەکرێت. ڕووەکناســـی فەڕەنسی Dejussieu و Decandole سویدی ئەم شێوازەیان دامەزراند. لە ئاخرین گۆڕانکاری ئەم شـێوازەدا ڕووەکناسـانان Hooker و Bentham تاکوو ئێسـتا ٧٠٠٠ نەژاد و ٩٧٠٠٠ جۆر ڕووەکیان پێی پۆلێنبەندی کردووە. لەم شـــێوازەدا دەســـتەی (Gymnosperms) کەوتووەتە نێوان ڕووەکەکـانی گەڵاپـان و گەڵابـاریـک کە ئەمە ڕەخنەیەکی گەورەیە لەســـەر ئەم پۆلێنبەنـدیە. زۆربەی ڕێکخراوە و بنکەکـانی ڕووەکناسـی جیهان ئێسـتاکە سـوود لەم شـێوازە وەردەگرن. بنەمای ئەم پۆلێنبەندیە لەســـەر ئەوە دامەزراوە کە جۆرەکـان هەمیشـــە نەگۆڕن[4] و جۆری تـازە و ژێرجۆرەکانی دیکە لە جۆری کۆن نابووژێن و جیا نابنەوە.

---

١. *Salix spp.*

٢. *Veronica kurdica* Benth.

٣. Natural Classification

٤. Fixism

- **پۆلێنبەندی فیلۆژێنێتیك**[1]

هەندێک جار فیلۆژێنێتیک بە تەنیا چەشنی لقێکی سەربەخۆ لە زانستی ڕووەکناسی و زیندەناسـیدا خۆی نیشـان دەدات، بەڵام زۆرتر چەشـنی درێژەی قۆناغەکانی پۆلێنبەندی سـەیری دەکەن. ئەوڕۆکە زۆرێک لە ڕووەکناسـان لە ڕووی نەخشـە و یاسا و زانیاریەکانی بەدەستهاتوو لە فیلۆژێنێتیک خەریکن بناغەی پۆلێنبەندی کۆن دەگۆڕن بە ئەم پۆلێنبەندییە، بەتایبەت زانکۆ و تاقیگەکانی ڕووەکناسـی فەڕەنسا. ئەم شـێوازە زۆرتر لە ڕووی کـاری تـاقیکردنەوە و تەکنیکی نـاو خـانە و سـەر مولکوولەکانی DNA ئەنجام دەبێت و کۆدی تـایبەت بۆ هەموو ڕووەکەکان تۆمار دەکەن تا زنجیرەی کار و توێژینەوە لە سەر ڕووەکەکان ئاسانتر بێتەوە. بۆ نموونە لە ڕووی ئەو کۆدە تایبەتیانە کە بۆ هەر ڕووەکێک دانراوە، سـەنتەر و بنکەکانی توێژینەوە لە یەک شـار و وڵات دەتوانن زانیاری و ئەنجامی توێژینەوەی سەنتەر و شـوێنەکانی دیکە وەربگرن و لە درێژەی ئەواندا کار و توێژینەوە بکەن نە ئەوەیکە کاری دووبارە و چەند بارە ئەنجام بدرێت. بەم شـێوە هەموو زانیاریەکان چەشـنی تەزبێحێک پێکەوە دەبەسرێنەوە و پێیان زیاد دەکرێت یان لێیان کەم دەکرێتەوە.

فیلۆژێنێتیک دەتوانێت پێوەندی گەشـە و گۆڕانی نێوان جۆر و نەژادەکان بەدەست بهێنێت و سـەرهەڵدانی تازەی یەک جۆر یان مۆتەیشـن[2] و هیبریدەیشـنی[3] جۆرەکان نیشـان بدات و ڕوونکردنەوە بدات. هەروەها بەم شـێوەیە بەپێی گۆڕانی کرداریی ژێنێتیکی سیلوول، جۆر بە جۆر و نەژاد بە نەژادی ڕووەکەکان پۆلێنبەندی دەکرێت.

زانسـتی پۆلێنبەندی چەشـنی هەموو زانسـتەکانی مرۆڤ تاکوو ئێسـتە گەلێک ئاڵوگۆڕی بە سـەردا هاتووە و گەشـەی کردووە. پسـپۆڕان بەپێی جیاوازیە دەرەکیەکان (گوڵ، گەڵا، لاسـک و ڕیشـە) و ناوەکیەکان (فیلۆژێنێتیک: بواری سـەر مولکوول و ناو خانەکان) هەمیشە هەوڵیان داوە قەتارەی سەرهەڵدان و بووژانەوەی هەموو جۆرەکانی ڕووەک بە دەست بهێنن و بزانن کام جۆر سەرەتا سەری هەڵداوە و پاشـان ڕێچکەی دوایی تا کوێ هاتووە. ئەوڕۆکە لەسـەر بنەمای فیلۆژێنێتیک

١. Phylogenetics Classification
٢. Mutation
٣. Hybridisation

ڕوەکەکان بە تەمەنی پیر و جوان دابەش دەکرێن. بۆ نموونە ماگنۆلیا و چنارەکەڵە پیرترین ڕوەکەکانن.

لامارک[1] ڕوەکناسی فەڕەنسی بیرۆکەی ئەم پۆلێنبەندیە دامەزراند، پاشان ئەنجامی کەلەخەبەردەکانی گیایی[2] و توێژینەوەکانی بواری گووران بیرۆکەکەی تۆکمەتر کرد. قسەی سەرەکی ئەم بیرۆکەیە ئەوەیە کە جۆرەکان بەپێی گەشە و گوورانی ڕۆژگار بەدی هاتوون. لەم بیرۆکەیە هەموو جۆرەکان ڕەگەزنامەی[3] خۆیان هەیە و هەر چڵێکی بە یەک (Phyllum) دەناسرێت.

لە ڕووی گەشەی فیلۆژێنێتیکی ڕوەکە سەرەتاییەکانەوە وەکوو جۆرەکانی قەوزە و کرێژەبەرد تا دەگاتە ڕوەکە تازەکانی ئاستی ژێرجۆر و ڤارایەتی دەیان قۆناغ و پلە تێپەڕیوە تا ڕوەک بەم ئاستەی ژێنێتیکی ئەورۆ گەیشتووە.

ئێستاکە پۆلێنبەندی فیلۆژێنێتیکی بووە بە سێ شێوازی جیاوازەوە:

شێوازی (Engle-Prantle):

لەم شێوازەدا سەرەڕای قەبووڵ کردنی تایبەتمەندیەکانی پۆلێنبەندی سروشتی، بنەمای فیلۆژێنێتیکیش زیاد کراوە. لێرەدا ڕوەکەکانی (Angiosperms) دەبن بە دوو بەشی گەڵاپان و گەڵاباریک بەڵام لە پۆلێنبەندی سروشتی سێ بەشی گەڵاپان و گەڵاباریک و (Gymnosperms) بوون.

شێوازی (Bessey) یا بیرۆکەی ڕانالی[4]:

پاش ئەوەی کە بیرۆکەی (Engle-Prantle) لای زۆربەی ڕوەکناسان جێی پەسەند بوو، ڕوەکناس Bessey بنەماڵەی چنارەکەڵەییەکانی[5] کرد بە سەرچاوەی

---

١. Jean-Baptiste Lamarck

٢. Paleobotanic

٣. شەجەرە

٤. Ranaly Theory

٥. Ranunculaceae

سەرەکی سەرجەم ڕووەکەکانی (Angiosperms). لێرەدا چنارەکەڵەییەکان بوون بە سێ چڵ: یەک چڵ بۆ گەڵاباریکەکان و دوو چڵ بۆ گەڵاپانەکان.

شێوازی (Hutchinson) یا بیرۆکەی ماگنۆلیایی[1]:

لێرە سەرجەم ڕووەکەکان بوون بە دوو بەشی ئالیکی[2] و چێوی[3]. لەم شێوازەدا سەرجەم ڕووەکە ئالیکیەکان لە گەشە و بووژانی بنەماڵەی (Ranunculaceae) و ڕووەکە داریەکانیش لە بنەماڵەی (Magnoliaceae) سەرچاوەیان گرتووە. ئەم شێوازە لەچاو شێوازەکانی دیکەی فیلۆژێنێتیکی کەمتر پێشوازی زانستی لێ کراوە.

بەگشتی بەپێی پۆلێنبەندی فیلۆژێنێتیکی ڕووەکەکان دابەش دەکرێن بە سەر ٤ زنجیرەی خوارەوە:

- Tallophytes: ئەندامەکانی ڕیشە و پەلک و لاسکیان گەشەی نەکردووە، وەکوو قەوزە، کرێژەبەرد و کارگ
- Bryophytes: ئەندامەکانی لاسک و گەڵایان گەشەی کردووە بەڵام ڕیشەیان نییە، وەکوو گیاکەڤس[4] و هێپاتیکا
- Petridophytes: ئەمدامەکانی ڕیشە و پەلک و لاسکیان گەشەی کردووە بەڵام ئەندامی گوڵ گەشەی نەکردووە، وەکوو گیای پەلەکەرگ و گیافیزۆک
- Spermatophytes: ئەندامەکانی گوڵ، گەڵا، لاسک و ڕیشە گەشەیان کردووە. زۆربەی ڕووەکەکان سەر بەم ئەم زنجیرەیەن، وەکوو سەرجەم ڕووەکەکانی Gymnospermes و Angiospermes:

١. Magnolia Theory
٢. Herbraize
٣. Lignosae
٤. Mosses

✓ دەستەی Gymnospermes: وەکوو بنەماڵەی کاژ[١] و ئەسروو[٢]
✓ دەستەی Angiospermes: ڕووەکەکانی گەڵاباریک[٣] و گەڵاپان[٤]

▪ ژێردەستەی گەڵاباریک: وەکوو بنەماڵەکانی پیواز[٥]، گەنم[٦]، خورما[٧]، زافەران[٨]
▪ ژێردەستەی گەڵاپان: بریتیە لە سێ ڕیزی بێ گوڵپەڕەکان[٩]، جیا گوڵپەڕەکان[١٠] و گوڵپەڕە یەکپارچەکان[١١]

❖ ڕیزی بێ گوڵپەڕەکان: وەکوو بنەماڵەکانی فنەق[١٢]، گوێز[١٣]، وزم[١٤]، دارتوو[١٥]، سپیناخ[١٦]، ترشۆکە[١٧]
❖ ڕیزی جیاگوڵپەڕەکان: وەکوو بنەماڵەی گەز[١٨]، چنارەکەڵە[١٩]، وەنەوشە[٢٠]،

---

١. Pinaceae
٢. Cupressaceae
٣. Monocotyledon
٤. Dicotyledon
٥. Liliaceae
٦. Poaceae
٧. Palmaceae
٨. Iridaceae
٩. Apetales
١٠. Dialypetales
١١. Gamopetales
١٢. Corylaceae
١٣. Juglandaceae
١٤. Ulmaceae
١٥. Moraceae
١٦. Chenopodiaceae
١٧. Polygonaceae
١٨. Tamaricaeae
١٩. Ranunculaceae
٢٠. Violaceae

هێرۆ[١]، زریشک[٢]، نۆک[٣]، سماق[٤]، ترێ[٥]، بەڕەزا[٦]

❖ ڕیزی گوڵپەڕە یەکپارچەکان: وەکوو بنەماڵەی گوڵ مێخەک[٧]، کوولەکە[٨]، ژاڵە[٩]، زەیتوون[١٠]، چەقچەقە[١١]، پوونگە[١٢]، گوزروان[١٣]، پەتاتە[١٤]

➢ بنەماڵە: دەتوانێ خاوەنی یەک یا چەندین نەژاد بێت وەکوو بنەماڵەی (Rosaceae): نەژادەکانی بەهیڤ یا بایەم[١٥]، گوڵەباخ و شیلان[١٦]، هەرمێ[١٧]، سێو[١٨]، هەڵووچە و قەیسی[١٩]، تووترک[٢٠]، تووفەرەنگی یا شلیک[٢١]، براڵووک و گێلاس و

١. Malvaceae
٢. Berberidaceae
٣. Fabaceae
٤. Anacardiaceae
٥. Vitaceae
٦. Apiaceae
٧. Caryophyllaceae
٨. Cucurbitaceae
٩. Apocynaceae
١٠. Oleaceae
١١. Asteraceae
١٢. Lamiaceae
١٣. Boraginaceae
١٤. Solanaceae
١٥. Amygdalus
١٦. Rosa
١٧. Pyrus
١٨. Malus
١٩. Prunus
٢٠. Rubus
٢١. Fragaria

کۆخ[1]، بەهێ[2]، گویژەمازەنی یا هەنگی دنیا[3] و گۆیژ[4]

➢ نەژاد: دەتوانێ خاوەنی یەک یا چەندین جۆر بێت وەکوو نەژادی بەهێڤ: دار بەهێڤ[5]، تەنگس[6]، بایەمە شینکە[7]، بەهێڤە ڕەواندزی[8]، هەرجن[9] و بایەمە کێوی[10]

➢ جۆر: دەتوانێ خاوەنی یەک یا چەندین ژێرجۆر[11]، کۆلتیوار[12] (ڕەقەم)، ڤارایەتی و فۆرم بێ. ئەمانە هەرکام لە ئاستی خوارتر لە جۆر دەتوانن بەهۆی نیشانە و تایبەتمەندییەکەوە جیاواز دەربکەون.

○ ژێرجۆر: لەگەڵ جۆری سەرەکی زۆر لەیەک دەچن بەڵام ژێرجۆرەکان لە ڕووی DNA ناو خانەکانەوە لێک جیاوازن. کەواتە هۆکارەکانی دووری لە یەکتر، کات و شوێنی ڕسکان، جۆری سەرەکی و ژێرجۆرەکان لەیەک جیا ئەکاتەوە. بۆ نموونە ژێرجۆری خاشەی بیابانی خیزەڵانی[13] تێتراپلۆئیدە و ۳۲ کرۆمۆزۆمی هەیە بەڵام ژێرجۆری خاشەی بیابانی تارانی[14] دیپلۆییدە و خاوەنی ١٦ کرۆمۆزۆمە.

○ کۆلتیوار[15]: لە جۆری ڕوەکی کشتوکاڵیدا کۆلتیوارەکانی یەک جۆر ڕوەک بەپێی شوێنی جۆگرافیایی، کەش و هەوا، خاک و ئاو ڕێژەی بەرهەمیان جیاواز دەبێت. توێژەران هەوڵ ئەدەن هەمیشە کۆلتیواری تازەتر پێشکەشی جوتیاران

---

١. Cerasus
٢. Cydonia
٣. Mespilus
٤. Crataegus
٥. *Amygdalus communis*
٦. *Amygdalus lycioides*
٧. *Amygdalus haussknechtii*
٨. *Amygdalus carduchorum*
٩. *Amygdalus wendelboi*
١٠. *Amygdalus scoparia*
١١. Sub Species
١٢. Cultivar: مستنبت نباتی
١٣. *Onobrychis aucherri* Boiss. subsp. *psammophila* (Bornm.) Rech. F.
١٤. *Onobrychis aucherri* Boiss. subsp. *teheranica* (Bornm.) Rech. F.
١٥. Cultivar

بکەن. بۆ نموونە دەیان کۆلتیواری جیاوازی ڕوەکی گەنم[1] لە ئێراندا بە ناوەکانی (بێستوون، ئازادی، کاوە، ئەڵوەند، سەرداری، چورەک، نەوید، زەڕین و خەزەر) هەیە کە هەرکام بۆ بەدەســـت هێنانی بەرهەمی زیاتر بۆ خاک و کەش و هەوای جیاواز، خۆڕاگری بە ســـەرما و گەرما و کەمئاوی، بەرزی و کورتی لاســـک، و هتد تەرخان کراوە.

○ ڤارایەتی[2]: ســـەرهەڵدان و دروســـتبوونی ڤارایەتی تازە بەهۆی دیاردەکانی مۆتەیشـــن (وەرســـووڕانی ژێنێتیکی) و هیبریدەیشـــن (دووڕەگەگیری) دێتە ئاراوە. کەواتە لە یەک یا چەند تایبەتمەندی بەرچاو بەڵام بچووک و کەمبەها لەگەڵ جۆری ســـــەرەکیدا جیاوازە وەکوو شـــێوازی گەڵاکان، بوون و نەبوونی کوڵک، بێدڕک و دڕکدار، ڕەنگی گوڵپەڕە، تاڵی و شیرینی ناوکە، ئەستووری ئێسکی ناوکە و هتد. بۆ نموونە گوڵپەڕەکانی وەنەوشـــە[3] ڕەنگیان بەنەوشـــە بەڵام لە یەک ڤارایەتیدا ڕەنگی مەیلەو ســـــپی دەبێ. یان لە ڤارایەتیەکانی بایەمی شـــــیرین[4] و بایەمی گەڵوازە[5] و بایەمی تاڵ[6] لە ڤارایەتی بایەمی شیرین و بایەمی گەڵوازە ناوک شیرینە، یان پێشەی بایەمی شیرین و بایەمی تاڵ ڕەقە بەڵام بایەمی گەڵوازە، ناسکە.

## باخی ڕوەکناسی[7]

پســـپۆڕانی بواری ژینگە و پزیشـــکی و کشـــتوکاڵ هەمیشـــە هەوڵیان داوە ڕووبەرێکی دیاریکراو دەسنیشـــان بکەن تا ســـەرجەم ئەو ڕوەکانەی کە پێویســـتیان پێیەتی لەوێدا کۆی بکەنەوە، بیانپارێزن و پەرەی چاندن و گەشـــە و توێژینەوەیان پێ بدەن. بەپێی نیاز و پێویســـت باخی ڕوەکناســـی دەتوانێ بۆ ئامانجەکانی خوارەوە

١. *Triticum aestivum* L.
٢. Variety
٣. *Viola odorata* L.
٤. *Amygdalus communis* L. var *dulcis*
٥. *Amygdalus communis* L. var. *fragilis*
٦. *Amygdalus communis* L. var. *amara*
٧. Botanical Garden

دابمەزرێت:

- پەروەردە و گەشەپێدان و توێژینەوە و نیشاندانی هەموو ڕوەکە دەرمانی و کشتوکاڵیەکان
- پەرەپێدانی بواری گەشـتیاری و ژینگەپەروەری بۆ ڕوەکە دەگمەن و ناوازە و جوانکاریەکان
- پاراسـتن و چاندنەوە و پەرەپێدانی ئەو ڕوەکانەی لە ژینگەی خۆیاندا وەبەر هەڕەشەی لەناوچوون و تەواوبوون کەوتوون
- پاراســـتن، چاندن، گەشــــەپێدان و توێژینەوەی جۆر، ژێرجۆر و فۆرمە جیاوازەکانی ڕوەک کە چەشــــنی بانکی ژێنێتیکی دەناســـرێن، وەکوو: فۆرمەکانی هەرمێ ناو باخ و دارســـتانەکانی کوردســـتان[1] (هەرمێ کرووزی، هەرمێ قەمەری، هەرمێ مامســـارمە، هەرمێ ناوشـــینە، هەرمێ کووجیلە، هەرمێ گولاوی، هەرمێ سـوورە، سـێوهەرمێ، هەرمێ پاییزە، هەرمێ باڵەکی، هەرمێ ڕیخنە، هەرمێ زەردە، هەرمێ سـپیکە، شـاهەرمێ، هەرمێ هوودی، هەرمێ ناسـکە، هەرمێ تالاوە، هەرمێ سـوورانی، هەرمێ بلام، هەرمێ بێلووژە، هەرمێ شـــەقۆق، هەرمێ چویلە، هەرمێ دەقە، هەرمێ شـــەلق، هەرمێ شـینکە، هەرمێ خەریبۆک، هەرمێ کۆشـکە، هەرمێ کـارچـک، هەرمێ کۆڵ، هەرمێ تۆمـانی، هەرمێ گەورک، هەرمێ گۆزەڵە، هەرمێ مەلاڤی، هەرمێ کارچین، هەرمێ هەزیرانی، هەرمێ مێهرانی، هەرمێ ورمێیی، هەرمێ تالک و هەرمێ بێلووز)
- پەرەپێدانی و چاندنی هەموو ڕوەکەکانی وڵات، ناوچە، کیشوەر و جیهان بۆ ئامانجی زیادکردن باری زانیاری زانکۆ و تاقیگەکان، گەشـــتیاری و ژینگەپەەری وەکوو باخی ڕوەکناســـی ئێران لقی پارێزگای ئەلبۆرز بانتر لە ٤٠٠٠ جۆر ڕوەکی ئێران و ناوچەکەی تێدایە. بەگشتی چەندین باخی ڕوەکناسی لە ناوچە و پارێزگاکانی

---

١. هەرمێ یەکێ لەو دارە بەردارانەی کوردستانە کە خاوەنی زۆرترین جیاوازی و جۆراوجۆری ڕەنگ و بۆن و تام و ئەندازە و وەرزی گەیشتنە. ئەم جۆراجۆریە زۆرتر لە دەڤەرە کوێستانی و دارستانیەکانی هەورامان، دالاهوو، مانشت، شاهۆ، مەریوان، بانە، پێنجوێن، بیارە، تەوێڵە، خورماڵ، گەرمک، ڕانیە، قەڵادزێ، سەردەشت، خانێ، تەرگەوەڕ، مەرگەوەڕ، چۆمان، بادینان، مێرگەسۆر، ئاکرێ، سەنگەسەر و ڕەواندز بەرچاو دەکەوێت. نووسەر

ئێران دامەزراون کە ڕووەکی ئەم ناوچانەیان لەخۆ گرتووە: ڕووەکەکانی بەشی ناوچە گەرمێن و بیابانەکانی ئێران، زاگرۆس (ڕۆژاوای ئێران)، ئەلبۆرز (چیاکانی ناوەڕاستی ئێران)، خەزەر (باکووری ئێران)، ڕووەکە پیازیەکان، ڕووەکە دەرمانیەکان، گەلاپانە هەمیشەسەوزەکان، ڕووەکی ناوچەکانی نیوەگەرمێن، ڕووەکەکانی ئەورووپا، ئەمریکا، قەفقاز، هیمالایا، چین و ژاپۆن.

- چاندن و پەرەپێدانی کۆمەڵێک ڕووەکی تایبەتی بۆ کارگە دەرمانی و خۆراکسازی و پیشەسازیەکان
- چاندن و پاراستنی کۆمەڵێک ڕووەکی جوان و ناوازە بۆ شوێنی بەڕێوەبردن و کردنەوەی کۆنسێرت و ئاهەنگ و بۆنە فەرمی و نافەرمیەکانی شار، وڵات و ناوچە
- دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی ژینگەیی و باخێکی سروشتی بۆ پێدان و ئامادەکردنی زانیاری پێویست بۆ خوێندکاران و مامۆستایانی زانکۆ و گەشتەکانی زانستیی ناوخۆ و دەرەوەی وڵات، کە دەتوانێت ببێت بە سەرچاوەیەکی داهات و سەرمایەی وڵات

ڕێکخراوەی جیهانی یۆنیسکۆ ژمارەی باخەکانی ڕووەکناسی جیهانی تا وەکوو ئێستا نزیک بە ٢٠٠٠ بنکە، و هەروەها ژمارەیەکی زۆر بنکەی هێرباریۆم لە ١٥٠ وڵاتی دنیا تۆمار کردووە. هێرباریۆم بنکەیکە کە بە شێوازی زانستیی ڕووەکناسی، نموونەی وشککراوی ڕووەکەکان هەڵدەگرێت و دەیانپارێزێت. زانیاریەکانی ڕێژە و ژمارەی نموونەکانی وشککراوی ڕووەکانی هێرباریۆم دەتوانن هەمیشە چەشنی سەرچاوەیەکی زیندووی زانستی بن بۆ کاری توێژینەوە و بەدواداچوونی ڕووەکناسان و پسپۆڕانی ئەم بوارە بۆ سەرجەم ڕووەکی یەک ناوچە یان وڵاتێک.

یەکەم باخی ڕووەکناسی ساڵی ١٥٤٤ زایینی لە لایەن ڕووەکناسی (Luca Ghini) لە زانکۆی (Pisa) لە ئیتالیا دامەزرا. هەروەها یەکەمین باخی ڕووەکناسی مۆدێرن، باخی ڕووەکە دەرمانیەکانی ئەورووپا بوو کە لە ساڵەکانی سەرەتای سەدەی ١٦ زایینی لە ئیتالیا کرایەوە. سەدەکانی ١٦ و ١٧ زایینی کە هاوکات بوو لەگەڵ تۆمارکردنی سەرجەم ڕووەکەکانی ئەورووپا و هەروەها گەشتەکانی ڕووەکناسان بۆ تۆمارکردنی ڕووەکی وڵاتان و ناوچەکانی دیکە لە دەرەوەی ئەورووپا، ئەوەی خستە

بەرنامەی ڕووەکناسان کە باخەکانی ڕووەکناسی ناو ئەورووپا پەرە پێ بدەن و ڕووەکی ناوچەکانی دەرەوەی ئەورووپا بهێنن و زیادی بکەن بە ڕێژەی ڕووەکی باخەکانیان.

دەسەڵاتی پاشایەتی بریتانیا ساڵی ١٧٥٩ زایینی لە زەمینێکی ٦٠ دۆنمی دەستی دایە دامەزراندنی باخی ڕووەکناسی پاشایەتی کیوو[١]. بەرپرسانی کێو ساڵ بە ساڵ ڕووبەر و ناوەڕۆکی باخەکە پەرە پێ دەدەن. ئێستاکە ڕووبەری کیوو گەیشتووە بە ٤٨٤ دۆنم و خاوەنی ٢٢٠ ڕووەکناسی ناسراوی دنیا و ٥٠٠ کارمەندی دیکە وەکوو فیلمساز، مامۆستای زانکۆ، خوێندکاری ناوخۆیی و بیانی و هەروەها ڕاهێنەری ڕووەکناسی و گەشتیارییە. کیوو تا وەکوو ئێستا توانیویەتی ساڵانە نزیک بە ٤٠٠٠ جۆر نموونەی وشککراو و تۆو و سەلکی ڕووەک لە سەرانسەری جیهان کە هەڕەشەی لەناوچوونیان لە سەرە کۆ بکاتەوە و بۆ چاندنەوە و زیندووکردنەوە و بووژاندنەوە بیانپارێزێت. هێرباریۆمی کیوو بانتر لە حەوت ملیۆن نموونەی وشککراوی جۆرەکانی ڕووەکی سەرانسەری جیهانی هاوپێچ لەگەڵ هەموو زانیاریەکانی زانستی و ژینگەیی ڕووەکەکە، هەڵگرتووە و چەشنی بانکێکی هەرەگەورەی ژێنێتیکی دەیپارێزێت و بووەتە مۆزەخانەیەکی گەورەی ڕووەکناسی و سروشتی جیهانی.

ڕووەکناسانی باخی کیوو لە بریتانیا ئەرکی کۆکردنەوە و تۆمار کردنی گەلێک فلۆرای جیهانیان وە ئەستۆ کردووە، وەکوو فلۆرای عێراق و تورکیە. کیوو ساڵانێکە پرۆژەیەکی بە ناوی (پرۆژەی داروین) دەست پێ کردووە و خەریکی کۆکردنەوە و تۆمارکردنی فلۆرای ئەو وڵاتانەن کە کار لە سەر فلۆرایان نەکراوە یان کەمتر گرینگیان پێ دراوە.

باخی ڕووەکناسی کیوو ئێستاکە چەشنی بنکەیەکی باڵای ڕووەکناسی لە دنیا ئەژمار دەکرێت. زۆرترین ڕێژەی نموونەی هێرباریۆم و جۆری زیندووی ڕووەکی چاندراو (٣٠٠٠٠ جۆر) لەم باخەدا تۆمار کراوە و ساڵ بە ساڵ پێی زیاد دەکرێت. ناوەندی باخی ڕووەکناسی کیوو بە هاوبەشی باخەکانی ڕووەکناسی پاشایەتی بریتانیا

١. Royal Botanic Garden Kew

و هێرباریۆمی زانکۆی هاروارد و هێرباریۆمی نیشتمانی ئۆستراڵیا، بنکەیەکیان دامەزراندووە بە ناوی(IPNI The International Plant Names Index). لەم بنکەیەدا سەرجەم زانیاری ناوی زانستی و پێناسەکانی گشتی پێوەندیدار بە سەرجەم زنجیرەی ڕووەکەکانەوە دەست دەکەوێت.

ڕووەکناسانی بەناوبانگی جیهان پێناسەیەکی گشتیان بۆ باخی ڕووەکناسی داناوە کە ئەگەر ڕێکخراوە یان وڵاتانێک نیازی دامەزراندنی یەک باخی ڕووەکناسی تۆکمە و تەواویان هەیە دەبێ بتوانن کۆی تایبەتمەندیەکان وەکوو هێرباریۆم، کتێبخانەی ڕووەکناسی، تاقیگەکان، مۆزەخانە، گوڵخانە، زەمینی توێژینەوە، ڕووبەری پێویست، شوێنی شیاو، هێزی پسپۆڕ و شارەزای ڕووەکناسی، بەشی فێرکاری و پێداویستیەکانی وەکوو بوودجە، ئاو، کارەبا، سووتەمەنی و ڕێگەوبانی یەک باخی ڕووەکناسی دابین بکەن.

باخی ڕووەکناسی دەکرێت ڕاستەوخۆ لە لایەن حکوومەتی یەک وڵات یان ڕێکخراوەیەکی ناحکوومی یان زانکۆیەک دابمەزرێت. پێدانی مۆڵەت و ڕێگەپێدان بۆ دامەزراندنی باخی ڕووەکناسی تەنیا بە ئامانجی بردنە سەرەوەی ئاست و زانیاری ڕووەکناسیە بۆ بوارە پێویستیەکانی کۆمەڵگا وەکوو خوێندنگە، زانکۆ، تاقیگە و توێژینەوە، کارگە، شارەوانی، گەشتیاری و چالاکیەکانی هونەری و هزری و وەرزشییە.

ڕێکخراوەی جیهانی باخەکانی ڕووەکناسی سەر بە یەکیەتی جیهانی بایۆلۆژییە کە ساڵی ١٩٥٤ وەکوو ڕێکخراوێکی سەرتاسەری جیهانی بۆ سەرپەرشتی و فەرمانگەی باڵای باخەکانی ڕووەکناسی لە جیهان دامەزرا. هەروەها چەند ساڵ پێش بە مەبەستی پارێزگاری لە باخەکانی ڕووەکناسی جیهان و پاراستنی جۆراوجۆری ڕووەکەکان لەپێناو خۆشگوزەرانی و هێمنایەتی مرۆڤەکان و ئەم سەر زەوییە، ڕێکخراوی پارێزگاری لە باخەکانی ڕووەکناسی جیهان[١] دامەزرا. ئێستاکە BGCI بانتر لە ٧٠٠ ئەندام -زۆرتر باخی ڕووەکناسی- لە ١١٨ وڵاتی دنیادا هەیە و دەیان بەرنامەی پارێزگاری لە ڕووەک و کۆنفرانسی جیهانی و کتێب و بڵاڤۆکی لە

١. BGCI: Botanic Gardens Conservation International

کارنامەی خۆیدا تۆمار کردووە.

**ژمارەیەك لە باخەکانی ڕووەکناسی جیهان**

- پاشـــای وڵاتی چین ٢٨٠٠ پێش زایین فەرمان دەر ئەکات لە پایتەختی وڵاتەکەی باخێکی ڕوەکی دروست بکەن کە سەرجەم ڕوەکە دەرمانی و بەنرخەکانی چین و ناوچەکانی دەوروبەری تێدا بێ.
- حەکیمی یۆنانی ئەرەســتوو ســاڵی ٣٢٢ – ٣٨٤ پێش زایین بە مەبەســتی توێژینەوەکانی ڕووەکناسـی و ڕوەکە دەرمانیەکان لە کەناری تەلاری وتاربێژی ئاتینا باخێکی ڕوەک ســـاز دەکات یا لەوانەیە ئەم باخە لە لایەن باوکی ڕووەکناســـییەوە (Theophraste) بە ئەرستوو درابێت.
- ساڵی ١٠٧٥ زایین لە سەردەمی دەسەڵاتداری موسڵمانەکان لە ئەندەلوسی ئیسپانیا، پزیشکان و گیادەرمانان باخی هۆرتا دل ڕی لە تولیدۆی ئیسپانیا دروست ئەکەن کە خاوەنی دەیان ڕوەکی دەرمانی و خۆراکی بووە.
- ســاڵی ١٠٨٥ زایینی (ابن البصـل) گیادەرمان و گیاناســی شــاری ئیشــبیلیە (ســیڤیا) لە دەڤەری ئەندەلوس باخێکی ڕووەکناســی دروســت دەکات کە زۆرێک لە ڕوەکە دەرمانیەکانی مەراکش، ئێران، میســر و دوورگەی ســیســیل لە ئیتالیا لەم باخەدا پەروەردە دەکات.
- ســاڵی ١٢٥٠ زایینی پزیشــکانی ئەندەلوســی باخێکی ڕووەکناســی لە زانکۆی پزیشـکی مۆنیلیەی فەڕەنسـا دروسـت دەکەن. ئەم باخە تا سـاڵی ١٥٩٣ هێشـتا هەر بەردەوام بوو.
- زنجیرەی باخەکانی ڕووەکناســـی ئیتالیا: باخی بۆتانیکۆ دی پیزا (١٥٤٤)، بۆتانیکۆ دی پادوا (١٥٤٥)، ئۆرتۆ بۆتانیکۆ دی (١٥٤٥)، دی پاویا (١٥٥٨ زایینی) و دی بولونیا (١٥٦٨)
- زنجیرەی باخەکانی ڕووەکناســـی باکووری ئەورووپا: نەریتی باخەکانی ڕووەکناسـی لە وڵاتی ئیتالیا بەرەو باکووری ئەورووپا بڵاو بووەوە. بۆ نموونە باخی ڕووەکناسـی ڤالێنسـیای ئیسـپانیا (١٥٦٧)، هۆرتۆس بۆتانیکوس لیدن هۆڵەندا (١٥٨٧)، سوید (باخی ڕووەکناسی زانکۆی ئۆیسالا ١٦٥٥ و هۆرتۆس بۆتانیکوس ئامێستێرادم

١٦٣٨)، ئاڵمان (گارتین هایدلبێرگ ١٥٩٣، هێرێنهاوسێر گارتین هانۆفێر ١٦٦٦، بۆتانیسچێر گارتین زانکۆی زووکیل ١٦٦٩ و باخی ڕوەکناسی بێرلین ١٩٧٢)، سویس (باخی ڕوەکناسی زووریخ ١٥٦٠ و باخی بازڵ ١٥٨٩)، بریتانیا (باخی ڕوەکناسی زانکۆی ئەکسفۆرد ١٦٢١ و باخی فیزیای چێلسی ١٩٧٣)، ئێسکاتلەند (باخی ڕوەکناسی ڕۆیاڵ لە ئیدینبۆرگ ١٦٧٠)، فەڕەنسا (باخی ڕوەکناسی جاردین مۆنپلیە ١٥٩٣، باخی ڕوەکناسی زانکۆی پزیشکی ١٥٩٧ و باخی ڕوەکناسی جاردین پاریس ١٦٣٥) و باخی ڕوەکناسی زانکۆی کۆپێنهاگی دانیمارک (١٦٠٠).

- نەریتی دامەزراندنی باخی ڕوەکناسی کە پێشینەی لە وڵاتانی چین، بابل، یۆنان، ئەندەلۆس و ئەورووپادا تۆمار کرابوو گەیشت بە وڵاتانی دیکە. ئێستاکە زیاتر لە ٢٣٠ باخی ڕوەکناسی لە وڵاتانی باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دامەزراون. ساڵی ١٧٣٥ زایینی یەکەمین باخی ڕوەکناسی پەمپلمۆسس لە وڵاتی مووریس دامەزرا، پاشان باخی سەنت ڤینسێت(١٧٦٤) و باخی ڕوەکناسی کەلکەتە (١٧٨٦) لە هیند، سریلانکا (باخی پێرادینیای ١٨٢١، باخی پاشایەتی پێرادینیا ١٨٤٣، باخی ڕوەکناسی هاکگالا ١٨٦١ و باخی هێناراتگودا ١٨٧٦)، باخی ڕوەکناسی یۆگۆر (١٨١٧) و باخی کێبۆن ڕایا (١٨٥٢) لە وڵاتی ئەندەنۆسیا و باخی ڕوەکناسی سەنگاپوور (١٨٢٢).
- باخەکانی ڕوەکناسی لە ئۆستراڵیا: باخی پاشایەتی سیدنی (١٨١٦)، باخی پاشایەتی تاسمانی (١٨١٨)، باخی پاشایەتی مێلبۆرن(١٨٤٥)، باخی ڕوەکناسی ئادێلاید (١٨٥٤)، باخی بریسبان (١٨٥٥) و باخی ڕوەکناسی ئابێرن لە سیدنی (١٩٧٧).
- باخەکانی ڕوەکناسی نیۆزیلاند (باخی دۆنێدین ١٨٦٣، باخی کرایستچێر ١٨٦٣ و باخی وێلینگتۆن ١٨٦٨).
- باخی ڕوەکناسی هۆنگ کۆنگ ساڵی ١٨٧١ و ١٩٧٥ زایینی
- باخی ڕوەکناسی ئۆرمان لە قاهیرەی میسر ساڵی ١٨٧٥ زایینی
- باخەکانی ڕوەکناسی ئافریقای باشوور (باخی دوربان ١٨٥١، باخی نیشتمانی کیرستێنبۆسچ ١٩١٣ و باخی ڕوەکناسی زانکۆی ئێستێنبۆسچ ساڵی ١٩٢٢ زایینی)

- باخەکانی ڕوەکناســـی ئەمریکا: یەکەمین باخی ڕوەکناســـی ئەمریکا باخی بارتێرام فیلادێلفیا ۱۷۳۰، باخی ســـێنت لۆئیس میســـۆری ۱۸۵۹، باخی لۆنگفوود ۱۷۹۸، باخی ئارنۆلد ۱۸۷۲، باخی ڕوەکناســـی نیۆیۆرک ۱۸۹۱، باخی هاتینگتۆن ۱۹۰٦، باخی برووکلین ۱۹۱۰، باخی ئاشتی جیهانی ۱۹۳۲ و باخی فایرچیلد (۱۹۳۸). باخی ڕوەکناســی میســۆری ئێســتاکە یەکێ لە پێشــکەوتووترین و پڕزانیاریترین باخەکانی جیهانە کە لە بواری ڕوەکەکانی ناوچە گەرمێنەکان گەلێک دەوڵەمەندە.
- وڵاتی ڕووســـیە خاوەنی زۆرترین باخی ڕوەکناســـییە، بۆ نموونە باخی ڕوەکناسی فەرهەنگستانی زانست ۱۹٤٥، باخی باتۆمی و سەنت پیترزبۆرگ ساڵی ۱۷۱٤ زایینی
- باخەکانی ڕوەکناســـی یاڵتا (۱۸۱۲) و باخی ڕوەکناســـی کییف لە ئۆکراینا (۱۹۳٦)
- باخەکانی ڕوەکناســـی برازیل: باخی یاردیم بۆتانیکۆ و باخی ڕیۆدۆ ژانیرۆ ساڵی ۱۸۰۸ زایینی
- باخەکانی ڕوەکناســی ئێران: یەکەم جار ســاڵی ۱۹٦۸ زایینی لە ڕووبەرێکی ۵۸۰ دۆنمیدا بناغەی دانانی باخی ڕوەکناســی نیشــتمانی ئێران لە ناوچەی چیتگەری پارێزگای ئەلبۆرز دامەزرا. ئێستاکە باخی چیتگەر سەرجەم ٤۰۰۰ جۆر ڕوەکی تێدا شین دەبێ واتا نیوەی فلۆرای گشت ئێران. ئەم باخە لە ناوچە و پارێزگاکانی دیکەی ئێران چەنـدین لقی هەیە، بۆ نموونە: بـاخی نەوشـــەهر لە مـازنـدەران (ڕوەکی نـاوچەکـانی ئەورووپی)، بـاخی تەورێز (ڕوەکی نـاوچەکـانی ئێرانی و توورانی و هیرکـانی. ئەم بـاخە زۆرێک لە ڕوەکی نـاوچەکـانی کوردســـتـانی تێدایە)، بـاخی خووزســتان (ڕوەکی ناوچە گەرم و بیابانیەکان)، باخی مەشـهەد (ڕوەکەکانی ئێرانی و توورانی) و باخی ڕوەکە دەرمانیەکانی هەمەدان.

**هێرباریۆم**[1]

1. Herbarium: معشب

کۆی هێرباریۆمەکان بە (Herbaria) ناو دەبرێت. هێرباریۆم مۆزەخانەیەکە کە بە بانکی زانیاری و ژێنێتیکی سەرجەم ڕووەکەکان دەناسرێت. لەم مۆزەخانەیەدا نموونەی وشککراوی ڕووەکەکان بە شێوەی زانستی و تایبەتی هەڵدەگرن و دەیپارێزن. هاوپێچ لەگەڵ نموونەی وشککراوی ڕووەک دەبێ وەرەقی نموونەکە ئەم زانیاریانەی لە سەر بێت: سەرجەم زانیاری پێناسەی ڕووەکناسی، شوێنی جۆگرافیایی نموونە، بەرواری کۆکردنەوە و ئەو کەسەی کۆی کردۆتەوە. ئاست و پێگەی یەک هێرباریۆم کاتێک دەر ئەکەوێت کە خاوەنی زۆرترین ڕێژەی نموونە و جۆری ڕووەک بێت. هێرباریۆمەکان بنکەیەکن بۆ پێدانی زانیاری و ڕێنمایی ڕووەکناسان و پسپۆڕانی بوارە جۆربەجۆرەکانی ژینگە و سروشت، هەروەها سەرچاوەیەکی بەنرخن بۆ زانیاریەکانی تاکسۆنۆمیکی ڕووەکەکان، بڵاوبوونەوە و تطوری ڕووەکەکانی یەک ناوچە و دەڤەری جۆگرافیایی.

پێشینەی دامەزراندنی هێرباریۆمەکان لە جیهاندا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شازدە لە ئیتالیا. لۆکا گالینی ڕووەکناسی ئیتالیایی یەکەم جار دەستی دایە کۆکردنەوەی نموونەی ڕووەکان و لە سەر کارتۆن و قاقەزی ئەستوور بە شێوازی لکاندن کەپسی کردن. دواتر فاڵکۆنێر و ڤیلیام تێرنێر سەرەڕای کەپس کردن، نموونەکانیان جۆرێک دالکاند کە شوێنی کەم بگرن تا باشتر بپارێزرێن. ئەوڕۆکە هێرباریۆم بە شێوەی فراوانتر نموونەکان هەڵدەگرێت، وەکوو: نموونەی وشککراوی کەپس، نموونەی سێ ڕەهەندی ڕووەک، تۆو و دەنکە هەڵاڵەی ڕووەکەکان، پارچەکانی ڕووەک (دار، ڕیشە، گەڵا، گوڵ و لاسک)، نموونەی هەڵگیراو لە ناو ئاو و ئەڵکەحۆل و تراوی کیمیاوی، ئەسلایدی مایکرۆسکۆپی، DNA دەرهێنراو لە ڕووەک و هتد.

بانتر لە ١٥٠ وڵاتی دنیا خاوەنی یەک یا چەندین هێرباریۆمی ڕووەکناسین. هەندێ لە وڵاتان زۆرترین بایەخیان بەم بوارە زانستیە داوە، وەکوو ئەورووپا (٥٥٠ دانە)، ڕووسیا (١٥٠ دانە) و باکووری ئەمریکا (٢٠٠ دانە). یەکێ لە هێرباریۆمە چالاک و دەوڵەمەندەکانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوین، هێرباریۆمی باخی ڕووەکناسی (هێرباریۆمی نیشتمانی) و هێرباریۆمی ناوەندی زانکۆی تارانە لە وڵاتی ئێران کە زۆرترین نموونەی ڕووەکەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیان تێدا پارێزراوە.

سەرەڕاى كۆكردنەوەى نموونەى ڕوەكەكان بۆ وشك كردن و داچەسپاندن لە سەر بەرگەى كارتۆن و قاقەز و هەروەها هەڵگرتن لە ڕەفەكانى هێرباريۆم، ڕوەكناسان سەرجەم ئەو بەڵگەنامە و نووسراوە و سەرچاوانە كە پەيوەستن بە ڕوەكناسى لەم مۆزەخانەيەدا هەڵدەگرن وەكوو: فلۆراى ناوچە و پارێزگا و وڵاتانى ديكە، پەرتووكەكانى ڕوەكناسى، دەستنووسەكان، وێنە، فتۆمايكرۆگرافەكان، ڕاپۆرتە چاپكراو و چاپنەكراوەكان، نەخشە و نيگارەكانى ڕوەكناسى و هتد. بەپێى ڕووبەرى ژێردەستى هێرباريۆم لە ناوچە يا وڵات يا جيهان، دەتوانرێت هەزاران تا مليۆنان نموونەى ڕوەك لە هێرباريۆمى ڕوەكناسى هەڵبگيردرێت.

## فلۆراى كوردستان[1]

فلۆرا بە دوو واتا لە جيهانى ڕوەكناسيدا بەكار دەچێت: يەكەم، سەرجەم جۆرەكانى ڕوەك لە ناوچەيەكى جۆگرافيايى يا سياسى. دووهەم، سەرجەم جۆرەكانى ڕوەك لە يەك ناوچە يا وڵاتێك.

وەك هەموو بابەتێك بۆ سەربەخۆيى نيشتمانى و نەتەوەيى، فلۆراى كوردستانيش دەتوانێت خاڵێكى ئەرێنى بێت بۆ پێداويستيەكانى بناغە و دامەزراندنى دەسەڵاتێكى نيشتمانى و نەتەوەيى لە كوردستان. نەتەوەكانى خاوەن دەسەڵاتى سەربەخۆ، كاتێ فلۆراى وڵاتەكەيان ئامادە دەبێت چەشنى شانازيەكى نەتەوەيى و نيشتمانى جەژنى بۆ دەگرن و شايى دەكەن بۆ لادانى تارا لە سەر ڕوومەتى پەرتووكى فلۆراى سروشت و ژينگەى نيشتمانەكەيان. چلۆن نەخشە و ئاڵا لاى جەماوەر و دانيشتوانى وڵاتێك گرينگە، هێندەش فلۆراى دياريكراوى سروشتى يەك وڵات گرينگى هەيە. كاتێ سروشتى وڵات يا نەتەوەيەك خاوەنى فلۆراى تايبەتى خۆى دەبێت، واتاى ئەوە دەگەيێنێت كە سروشتى ئەو وڵاتە ناسنامە و پێناسەى تۆماركراوى خۆى هەيە و هەموو جيهان بەو فلۆرايە دەيناسن.

بە بۆچوونى پسپۆڕى شارەزاى بوارى ڕوەكناسى ئێران دكتۆر موزەفەريان

[1]. Kurdistan of Flora

هەموو جۆرەکانی ناو فلۆرای هەر وڵاتێک هاوچەشـــنی بوونەوەرێکی زیندووی ناو سروشتی ئەو وڵاتە مافی ژیانی و ڕێگەی شینبوون و گەشە و سەرهەڵدانی لاسک و گەڵا و گوڵی هەیە. یەکێ لە بابەتەکانی ڕێزلێنان و گرنگیدانی خەڵکی یەک وڵات بەتایبەت چینی پسـپۆڕ و لێزانی ڕووەکناسـی بەرامبەر بە سـروشـت و ژینگەکەیان تۆمار کردن و ناسینەوەی جۆر و جنسە تازەکانی ناو فلۆراکەیانە تا وەکوو هەموو جۆرەکانی ڕووەکی ناو سـروشـت و ژینگەی ئەو وڵاتە وەبێ ناسـنامە و پێناسـی شـاراوە نەمێنێتەوە. بۆ نموونە دکتۆر موزەفەریان تا وەکوو ئێسـتا بانتر لە ٨٠ جۆر ڕووەکی تـازەی زیـاد کردووە بە ئـامـاری فلۆرای ئێران. بەگوێرەی وتەکـانی ئەم پسپۆڕە لە ماوەی ٤٠ سـاڵ گەڕان و پشکنین بە ناو هەموو سروشتی ئێراندا بانتر لە ٥٥ هەزار نموونەی ڕووەکی کۆ کردووەتەوە تا وەکوو توانیویەتی ئەم ٨٠ جۆرە نەناسراوە بدۆزێتەوە و پێناسەی فارسی و جیهانیان بۆ تۆمار بکات[١].

نموونەیەکی دیکە لە تێکۆشـەری ڕاسـتی ئەم بوارە بەڕێز ئەندازیار حوسـەین مەعرووفی توێژەر و ڕووەکناسـی فەرمانگەی توێژینەوەکانی ژینگە و کشـتوکاڵی سـنەیە کە زیاتر لە ٣٠ سـاڵە خەریکی ئامادەکردنی فلۆرا و پێناسـەدار کردنی سـروشـتی پارێزگای سـنەیە تا وەکوو ئێسـتا بانتر لە ١٥ جۆر ڕووەکی تازەی لە سـنووری پارێزگای سـنە دۆزیوەتەوە و تۆماری کوردی، فارسـی و جیهانی بۆ وەرگرتووە و ناسـاندوویە بە جیهان. کەواتە پێویسـتە هەموو ڕووەکناسـان و توێژەرانی ڕووەکی لە چوار پارچەی کوردسـتان هاودەسـت و هاریکار بن تا وەکوو شـانازیەکانی فلۆرای کوردسـتانی گەورە لە تۆماری جۆر و جنسـی ڕووەکی تازە بکەوێتە بەر دیـدی خوازیـاران، توێژەران و خوێنەرانی زانکۆ و کتێبخـانەکـانی کوردستان و هەموو جیهان.

فلۆرای سەرزەمینی کوردستان کەوتووەتە ناو سنووری فلۆرای وڵاتانی تورکیە، ئێران، عێراق، سـووریە و ئەرمەنسـتان. ئەم وڵاتانە هەر کام فلۆرای تایبەتی خۆیان هەیە. دانانی فلۆرای ناوچە یان وڵاتێک گەلێک سـەرمایەی دارایی، زانسـتی، تاقیگەیی

---

١. پاش چاپ و دەرکردنی پەرتووکی پێناسەی ڕووەکە دەرمانی و عەتردارەکانی ئێران لە لایەن دکتور ولی الله مظفریان، ماڵپەری تێبیان وتووێژێکی پڕ زانیاری لەگەڵ ئەم پسپۆڕە ساز کردووە و بڵاو کردووەتەوە (www.tebyan.net)

و زانکۆیی پێویستە، بەڵام کاتێ سروشتی ئێمەی کورد کەوتووەتە ژێر دەسەڵاتی چەند وڵاتێک و ئەو چەند وڵاتەش بۆ خۆیان فلۆرای تەواوی سروشتی ژێر دەسەڵاتیان بە بەشەکانی کوردستانیشەوە ئەنجام داوە، ئیدی جیاکردنەوە و دەرهێنانی بەشی فلۆرای کوردستان لە دووتوێی فلۆرای ئەو پێنج وڵاتە بۆ دەسەڵاتێک وەک هەرێمی کوردستان کارێکی زۆر درێژخایەن و سەرمایەبەر نییە. لەوانەیە بە ئەنجامدانی ئەم کارە سەرنج و ڕوانگەی گەلێک کەڵەزانا و پسپۆڕی جیهانی لە بواری کشتوکاڵ، ژینگە، ڕوەکناسی، گیادەرمانی و پزیشکی بەرەو کوردستان ڕابکێشرێت و بۆ جەماوەری دیکەی پارچەکانی دیکەی کوردستان سێبەرێکی یەکگرتوویی و یەکبوون بێتە ئاراوە. هەروەها ئەم کارە دەتوانێت هێزێکی هاوکاری و هەرەوەزی بخاتە هزر و هەناوی هەموو ڕوەکناسانی کورد لە پارچەکانی کوردستاندا بۆ تۆمارکردنی پاشماوەی ڕوەکە تۆمارنەکراوەکان و پاڵاوتنی سەرجەم ڕوەکە تۆمارکراوەکان لە بواری دروستی پێناسەی ڕوەکناسیەوە.

تۆمارکردنی یەک بە یەکی جۆرەکانی ناو فلۆرا ڕەنج و ئەنجامی دەیان گەشت و کێوماڵی مامۆستایان و خوێندکارانی ڕوەکناسییە بە شاخ و دەشت و بیابان و شیو و ڕووبارەکاندا. ڕوەکناسان سەرەتا هەموو فلۆراکانی وڵاتانی دەوروبەریان لەگەڵ کلیلی ناسین و جیاکردنەوەی نەژاد و جۆرەکان ئامادە دەکەن پاشان دەست دەکەن بە گەشت و کێوماڵی. بەرەبەرە دەڕۆنە پێش، بۆ نموونە سەرەتا دەشت و بیابانەکان و شوێنەکانی بە بەرزایی کەمتر لە ۱۰۰۰ مەتر لە ئاستی دەریا، پاشان داوێن و بەرزاییەکان بەپێی ئاستی دەریا و نهۆمی[۱] دارستان یا کێو.

پلەی گەرما و بەرزی لە ئاستی دەریا لە سەر جۆراوجۆری ڕوەکەکان لە چیایەک یان دارستانێک کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە. هەرچی بەرزی لە ئاستی دەریا زیاتر دەبێت ماوەی گەشە و پشکوتنی ڕوەکەکان کورتتر دەبێتەوە و گەشەی ڕوەکە وەرزی و کەم تەمەنەکان زیاتر دەبێت. بۆ نموونە لووتکەی چیابەرزەکانی هەڵگورد و پیرەمەگروون و قەندیل ژینگەی دارە بەرزەکان نییە و زۆرتر ڕوەکە وەرزیەکان یان بە ڕێژەیەکی کەمتر دەوەن و دارچکەکان گەشە

۱. Layer: Stratum

دەکەن.

## فلۆرای ڕۆژهەڵاتی کوردستان

یەکەم جار بە شێوەی تۆکمە و تەواو لە سەرەتاکانی سەدەی شازدەی زایینی لە ئەورووپا ئامادەکردن و دانانی فلۆرای سروشت دەستی پێ کرا. پاشان ئەم نەریتە زانستیە بەرەو وڵاتانی دیکە بەتایبەت ئاسیا و ڕۆژهەڵاتی ناوین بڵاو بووەوە. ساڵی ١٦٨٥ ڕوەکناسانی ئەورووپی گەشتێکی کێوماڵی دەشت و چیاکانی ئێرانیان کرد و یەکەم ڕاپۆرتی فلۆرای ئێرانیان ئامادە کرد. ساڵی ١٩٣٧ دکتۆر ئەحمەدی پارسا فلۆرای ئێرانی لە ژێر ناوی (Flora de L´Iran) بە زمانی فەرەنسی و لاتین چاپ کرد. دیسان ساڵی ١٩٦٣ بە سەرپەرشتی (Rechinger) فلۆرای ئێرانیکای دەرکرد. یەکێ لە تایبەتمەندیە بەرچاوەکانی پرۆژەکەی ڕشینگر ئەوە بوو زۆربەی ڕوەکەکانی ناو سنووری عێراق وەکوو باشووری کوردستان و هەروەها ئەفغانستان و ڕۆژاوای پاکستان لە فلۆرای ئێرانیکا تۆمار کراوە. ساڵی ١٩٧٥ دکتور ئەحمەد قەهرەمان بەرنامەی داڕشتنی فلۆرای ئێرانی لە ٨٠ بەرگدا داڕشت. تا وەکوو ئێستا بانتر لە ٨٠٠٠ جۆر، ژێرجۆر و ڤارایەتی ڕوەکی ئێران لە ٢٥ بەرگ بە ناوی فلۆرای ئێران دانەری ئەحمەد قەهرەمان چاپ بووە. لە کۆی ئەم ٨٠٠٠ جۆرە ١٧٥٠ دانەی جۆری ئێندێمیکی[١] ئێرانە، واتا تەنیا لە سنووری ناوخۆی ئێراندا دەڕوێن. دکتۆر قەهرەمان ساڵی ٢٠٠٩ کۆچی دوایی کرد و درێژەی کار و بەرنامەکەی مایەوە بۆ هاوکار و شاگردانی.

بە گشتی ئەوڕۆکە فلۆرای هەموو ناوچە و پارێزگاکانی ئێران بە هەوڵی ڕوەکناسانی فەرمانگەی توێژینەوەی ژینگە و کشتوکاڵی ناوەندی پارێزگاکان ئامادە و چاپ بووە. بۆ نموونە:

- فلۆرای پارێزگای سنە (ئەندازیار حوسەین مەعرووفی، ساڵی ٢٠١٣، چاپ نەکراوە): خاوەنی ١١٣ بنەماڵە، ٦٢٩ نەژاد و ٢١٠٠ جۆر ڕوەکە، واتا ٢٥ لەسەدی

١. Endemic

فلۆرای ئێران.

- فلۆرای پارێزگای ئیلام (دکتۆر موزەفەریان، ســـاڵی ٢٠٠٩، چاپ کراوە): خاوەنی ١٥٠٠ جۆر ڕوەکە واتا ١٥ لەسەدی فلۆرای ئێران.
- فلۆرای پارێزگای کرماشـــان (ئەندازیار مەنووچێهر ئەردەشـــیری، ســـاڵی ٢٠١٣، چاپ کراوە): خاوەنی ١٨٠٠ جۆر ڕوەکە واتا ١٨ لەسەدی فلۆرای ئێران.
- فلۆرای پارێزگای ورمێ و مەهاباد (ســاڵی ١٩٨٩ عەباس ســەیامی بە ناوی فلۆرای ئازربایجان چاپی کرد، هەروەها دواتر فەرمانگەی توێژینەوەی کشـتوکاڵی و ژینگەی ورمێ دەســتی بە دارشــتنی کردووە و تا وەکوو ئێســتا درێژەی هەیە): تا وەکوو ساڵی ١٩٨٩ خاوەنی ١١٠٠ جۆر ڕوەک بووە واتا ١١ لەسەدی فلۆرای ئێران.

گۆڤاری ڕوەکناســـی ئێران بە ناوی (The Iranian Journal of Botany) لە ســاڵی ١٩٩٤ تا وەکوو ئێســتا ٤١ ژمارەی چاپ بووە. ئەم گۆڤارە گەلێک ڕاپۆرت و تۆمارکراوی تازەی ڕۆژهەڵات و تەنانەت باشوور و باکووری کوردستانی تێدا چاپ کراوە.

## فلۆرای باشووری کوردستان

ساڵی ١٩٦٥ زایینی باخی ڕوەکناسی کیوو لە بریتانیا لەگەڵ وەزارەتی کشتوکاڵی ئەوکاتەی عێراق گرێبەســتێک دەبەســتێت و تێکڕا دارشــتن و ئامادە کردنی فلۆرای عێراق دەســـت پێ دەکەن. ئەو جۆرەی باســـی لێو دەکەن و هەروەها تایبەتمەندی ســروشــتی دەوڵەمەندی باشـــووری کوردســـتان لەچاو بیابانەکانی ناوەڕاســـت و خوارووی عێراق، زۆربەی گەشتەکانی ڕوەکناسان بۆ دانانی فلۆرای عێراق لە خاکی باشووری کوردستاندا جێبەجێ کراوە. لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٦ تا وەکوو ١٩٨٥ بە ســەرپەرســتی ڕوەکناســان شــاهین غەزەنفەر و (John Edmondson) کۆی ٣٣٠٣ جۆر ڕوەک تۆمار کرا و لەم ڕێژەیە ٩٠٠ جۆری ئێندێمیک بوون. ســـەرجەم ١٧٨٣ جۆر ڕوەک لە بەرگەکانی ١، ٢، ٣، ٤(بەشـــی ١ و ٢)، ٨ و ٩ بە ناوی فلۆرای عێراق ســاڵی ١٩٨٥ چاپ بوو. هەروەها ســاڵی ٢٠١٢ کۆی ١٥٢٠ جۆری تۆمارکراوی ئەو کاتە لە بەرگی ٥ (بەشــی ١: بنەماڵەکانی Chenopodiaceae و Caryophilaceae)

و (بەشـــی ٢: بنەماڵەی Apiaceae)، بەرگی ٦ (بنەماڵەی Asteraceae) و بەرگی ٧ (بنەماڵەکانی Boraginaceae، Convolvulaceae و Lamiaceae) چاپ بوو.

کاریگەریەکانی شـــەڕی بەردەوام بە ســـەر وڵاتی عێراق تا وەکوو ئێســـتا وای کردووە فلۆرای عێراق چەشـــنی پرۆژەیەکی داخراو هەر دەم چـاوەڕێی هەڵێکی ڕەخســـاو بێت تا وەکوو دیســـان کێو ماڵی و ڕاپۆرت و تۆمارکراوە تازەکانی ڕووەکناســـی پێ زیاد بکرێت و ڕووەکناســـانی ناوخۆی درێژە بە پرۆژەکە بدەن. زۆر جار ڕووەکناســـانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردســـتان ڕاپۆرتە تازەکانیان لە ســـەر جۆرەکانی تازەی ســـنووری هاوبەش لەتەک باشـــووری کوردســـتان، لە گۆڤاری ڕووەکناسی تورکیە و ئێران چاپی دەکەن.

ساڵی ٢٠١٢(Tony Miller) بەرپرســی بەشـی فلۆرای ڕۆژهەڵاتی ناوین لە باخی کیوو لە ژێر ناوی (پرۆژەی داروین لە باخی ڕووەکناســـی کیوو) بۆ تۆمارکردنی ڕووەکە تۆمارنەکراوەکانی ســـروشـــتی عێراق پێوەندی بە ڕێکخراوی ســـروشـــتی عێراقەوە دەکات. لقی ئەم ڕێکخراوەیە لە شاری سلێمانی شاخی پیرەمەگروونی پێ پێشنیار دەکەن. ئەم شاخە یەکێ لە دەوڵەمەندترین شاخەکانی کوردستانە لە بواری چری جۆر و نەژادی ڕووەکەوە. بەرنامە و بڕیاری ئەم ڕووەکناســـە ئەوەیە ســـاڵی ٢٠١٥ فلۆرای چیا و دەڤەری شاخی پیرەمەگروون ئامادە بکات.

(هەواڵی کار و بەرنامەی ئەم ڕووەکناســـەم لە هاوڕێی خۆشـەویسـتم کاک ئاوارە حەمەخان مامۆسـتای پەیمانگای تەکنیکی کشـتوکاڵی سـلێمانی-بەکرەجۆ وەرگرتووە کە خۆیان لەگەڵ تۆنی میلێر پێوەندیان هەیە و پێکەوە گەشـــتی ڕووەکناســـییان بۆ چیای پیرەمەگروون کردووە).

### فلۆرای باکووری کوردستان

بەپێی ڕووبەری زەمینی یەکێ لە دەوڵەمەندترین فلۆراکانی دنیا، فلۆرای وڵاتی تورکیایە. بە گوێرەی دوایین ڕاپۆرتی فەرمی تا ســـاڵی ٢٠٠٠ زایینی ڕێژەی ٩٣٠٠ جۆر ڕووەک لە سروشتی تورکیە تۆمار کراوە. ڕووەکناسان فلۆرای تورکیە چەشنی بانکێکی ژێنێتیکی دەناسن بۆ چری ڕووەکە کێویەکان. گوایە فلۆرای تورکیە ئەجدادی وەحشـی و کێوی زۆربەی ڕووەکە کشـتوکاڵیەکانی تێدایە و زۆربەیان ئێندێمیکن. بۆ

نموونە گەنمی کێوی[1] (٣٠ جۆر)، جۆرەکانی کێوی و وەحشـی جۆ[2]، نۆک[3]، نیسک[4]، قەیسـی[5]، هەنجیر[6]، گێلاس[7]، زۆربەی چەرەســات (وەکوو فەنەق[8]، بایەم[9]، بایەم زەمینی[10] و شابەڕوو[11])، گوڵی زەمەق[12]، شلێر[13]، زەعفەران[14] و گوڵی بەفری[15].

ســاڵی ١٩٦٥ ڕوەکناســانی لقی باخی کیوو لە زانکۆی ئێدینبۆرگی ئێســکاتلەند گرێبەستێکیان لەگەڵ وەزارەتی کشتوکاڵی تورکیە کرد. سەرپەرشتیار و بەرپرسی فەرمی ئەم پرۆژەیە ڕوەکناســی گەورە (Peter Davis) بوو. پیتر و هاوکارانی توانیان تا ســاڵی ١٩٨٨ ڕێژەی ٩٠٠٠ جۆر ڕوەکی تورکیە تۆمار بکەن و لە ژێر ناوی فلۆرای تورکیە لە ١٠ بەرگ چاپیان کرد. پیتێر دەیویس ســاڵی ٢٠٠٠ پاشماوەی ٣٠٠ جۆری تازە تۆمارکراوی پاشکۆی فلۆرای تورکیەی کرد. واتا کۆی گشــتی فلۆرای توکیە بوو بە ٩٣٠٠ جۆر ڕوەک. ئەم ڕوەکناســە پێش ئامادەکردنی فلۆرای تورکیە، بۆ کاری توێژینەوە و دارشــتن و کاری تازە ســەردانی ڕووســیا و کوردستانی کردبوو. بەهۆی ئەو هەموو ڕاژە و خزمەتەی کە بە پێناسەی سروشت و ژینگەی جیهانی کردبوو ساڵی ١٩٥٩ لە لایەن ڕێکخراوەی پاشایەتی جۆگرافیا لە لەندەن خەڵات دەکرێت. ساڵی ٢٠٠١ ڕوەکناسی تورک (Adil Guner) ڕێژەی ٢٠٠٠

---

١. *Triticum spp.*
٢. *Hordeum spp.*
٣. *Cicer arietinum* L. = *C. sativum* Schkuhr.
٤. *Lens culinaris* Medicus.
٥. *Prunus armeniaca* L.
٦. *Ficus carica* L.
٧. *Cerasus avium* (L.) Moench. = *Prunus avium* L.
٨. *Corylus avellana* L.
٩. *Amygdalus communis* L.
١٠. *Arachis hypogaea* L.
١١. *Castanea sativa* Mill.
١٢. *Iris spp.*
١٣. *Fritillaria kurdica* Boiss. & Noe.
١٤. *Crocus sativus* L.
١٥. *Galanthus nivalis* L.

جۆر ئێندێمیکی تورکیەی لە بەرگی ١١ چاپ کرد.

فلۆرای وڵاتی تورکیە دابەش دەبێ بە سێ بەشی: ١) یۆرۆ - سیبیری، ٢) مەدیتەرانە (ئاناتوولی ڕۆژاوا، کێوەکانی تۆرۆس و کێوی ئامانۆس)، ٣) ئێرانی - توورانی (ناوچەکانی دیکەی تورکیە). هەموو فلۆرای بەشی باکووری کوردستان دەکەویتە ناو فلۆرای ئێرانی- توورانی. زۆربەی سروشتی بەشی باکووری کوردستان کوێستان و شاخاوییە و پێشبینی دەکرێت زۆرترین ڕێژەی ڕووەکی کوردستان لەو بەشەدا بێ واتا بانتر لە ٢٥٠٠ جۆر.

پاش ساڵی ١٩٨٨ کە زۆربەی کارەکانی فلۆرای تورکیا کۆتایی هات ڕووەکناسانی ناوخۆی تورکیا گۆڤارێکی ڕووەکناسیان بە ناوی (Turkish Journal of Botany) دانا. تا وەکوو ئێستا ٣٩ ژمارەی چاپ بووە. ساڵانە ڕاپۆرت و تۆمارکراوەکانی ڕووەکناسی تورکیە لەم گۆڤارە چاپ دەبێت و ئامادە دەکرێ بۆ تۆکمە کردنی چاپی بەرگەکانی داهاتووی فلۆرای تورکیا.

### فلۆرای ڕۆژاوای کوردستان

ساڵی ١٨٣٠ ڕووەکناس (P. M. R. Aucher-Eloy) هەموو ناوچەکانی باکووری سووریە وەکوو ڕۆژاوای کوردستان کێوماڵی کرد و ڕووەکەکانی ئەم دەڤەرەی تۆمار کرد و بە ناوی خۆیەوە بڵاوی کردنەوە. ساڵی ١٨٤٦ ڕووەکناس (P. E. Boissier) سەرجەم ڕووەکەکانی کێوی سینا، فێلستین، ئیسرایل، لوبنان و سووریەی کۆ کردەوە و لە پێنج بەرگدا بە ناوی (Flora Orientalis) چاپ و بڵاو کردنەوە. ساڵەکانی ١٩٣٠ تا ١٩٣٥ ڕووەکناسان (R. Gombault و J. Thiebaut) فلۆرای لوبنان و سووریەیان دیسان ئامادە و چاپ کردەوە. یەکێ لە توێژینەوە گرینگەکان لە سەر فلۆرای سووریە کاری ڕووەکناس (Pere P. Mouterde) بوو کە ساڵی ١٩٥٣ فلۆرای سووریە و لوبنانی ئامادە و چاپ کرد. بەپێی ئەم فلۆرایە تا ساڵی ١٩٥٣ سەرجەم ڕووەکەکانی وڵاتی سووریە ٣٠٧٧ جۆر تۆمار کراوە کە بریتیە لە ١٣٣ بنەماڵە و ٩١٩ نەژاد. پاش ئەم فلۆرایە یەکێ لە ڕووەکناسانی ناوخۆی سووریە بە ناوی نەهال توێژینەوەیەکی زۆری لە سەر فلۆرای سووریە ئەنجام دا هەروەها

توێژینەوەکانی ساڵەکانی ١٩٩٦ و ١٩٩٨ بە شێوەی وتاری زانستی و نامیلکەی دوکتۆری و ماستەر بۆ فلۆرای سووریا لە زانکۆکانی سووریە وەکوو شام لە بەردەستدا هەیە. یەکێ لە تایبەتمەندیەکانی فلۆرای سووریە ئەوەیە کە زۆرترین ڕێژەی ڕووەکەکانی ئێرانی- تووڕانی لە دەشت و کێوەکانیدا بەرچاو دەکەوێت. ئەم خاڵە بەتایبەت بۆ بەشی ڕۆژاوای کوردستانیش دەگرێتەوە. فلۆرای مۆتارد ڕێژەی جۆرەکانی ئێندێمیکی سووریەی ٢٤٣ جۆر تۆمار کردووە.

## تایبەتمەندی "فەرهەنگی ڕووەکناسی" بۆ فلۆرای کوردستان

سەرەتا کە ساڵی ٢٠٠٥ بە شێوەیەکی تۆکمە و زانستی دەستم دایە یاداشت هەڵگرتن و خوێندنەوەی پەرتووک و وتارە زانستیەکان لە سەر جەماوەری ڕووەکی کوردستان، بە نیاز بووم فلۆرای کوردستان ئامادە بکەم. پاشان چەندین هۆکار هاتنە پێش کە ئەم کارەم لە ڕێچکەی ئامادە کردن و نووسینی فەرهەنگی ناوی ڕووەکەکانی کوردستان ئەنجام دا و کاری فلۆرای کوردستانم بۆ نەکرا:

- ئەندازەیەک لە بواری زانستی، خوێندنەوە و توێژینەوەی فلۆرا و وتارە زانستیەکان، گەشت و کێوماڵی، ئەنجامی توێژینەوەی کەسێتی، لقی خوێندنی ماستەر (شەهادەی ماستەری زانستی گیابژارەکانم هەیە) یا دکتۆرا، دابین نەبوونی فلۆرای عێراق و تورکیە و سووریە، بنکە یان لایەنێکی فەرمی بۆ پشتگیری، کات و بواری بژیوی ژیان، کە پێویستە هەموو ڕووەکناسێک هەیبێت تا بتوانێ کاری فلۆرای ناوچە یان وڵاتێک بکات ئەمن ڕێژەی دەرچوونم لەم تاقیکردنەوەدا بە دەست نەدەهێنا.
- فلۆرا کاری ناوەند و بنکەیەکی تایبەت بە ڕووەکناسیە کە ڕووەکناس لە کاتی پێویستدا بتوانێ فلۆرای وڵاتانی دیکەشی لە بەردەستدا بێ یان یارمەتی بخوازێت لە ڕووەکناسانی ناوخۆ و دەرەوە. ئەم کارە بەتایبەت دابین کردنی فلۆرای وڵاتانی دراوسێ بڕە پارەیەکی زۆری پێویستە و بە کەسێک ڕووەکناس یا شارەزا و هۆگری بواری ڕووەکناسی لە دەرەوەی ناوەندی فەرمی ڕووەکناسی دابین ناکرێت.
- هەوڵی زۆرم خستە گەڕ کە بتوانم لە نێوان خوێندکارانی ماستەر و

شارەزایانی بواری ڕووەکناسی بەتایبەت لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەرپرسیارەتی بۆ دانان و ئامادەکردنی فلۆرای کوردستان نیشان بدەم، بەڵام تەنیا بە هاوکاری و یارمەتیەکی کورت لە دانشتنێک یان دۆزینەوەی ناوی یەک یان چەند ڕووەک کوتایی دەهات.

هەرچیک بێت بە بۆچوونی خۆم بەردی بناغەی فلۆرای کوردستانم داناوە و قسە لە سەر بەرپرسیارەتیمان بۆ ئامادە کردنی فلۆرای تایبەت بە چوار پارچەی کوردستان، بەهۆی ڕچەشکێنی ئەم فەرهەنگە دەکەوێتە بەرنامە و کاری هاوکارانی بەڕێز و هێژا بەتایبەت ڕووەکناسان لە هەرێمی کوردستان. چونکە ئەوان دەتوانن بە ئاسانی قسە لە سەر ئەم بابەتە بکەن و دەسەڵات بە پیلانێکی سیاسی سەیری نەکات. ئەو کارانەی ئێمە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان وەکوو کاری فەرهەنگی ڕووەکە دەرمانیەکانی کوردستان (شەهاب خزری، ساڵی ۲۰۰۲) و فەرهەنگی ڕووەکناسی کوردستان (ئیرەج مورادی، ساڵی ۲۰۱۵) و هەروەها لە باکووری کوردستان وەکوو کاری فەرهەنگا ناوێن نەباتان ئە کوردی (ئەحمەد درهی، ۲۰۱۳) و فەرهەنگا ناوێن ڕووەکێن ب کوردی (مەهمەت فیرات، ۲۰۱۳)، تەنیا دەتوانێت هەوڵدانێک بێت بۆ ناساندن و دەرخستنی چالاکیمان لە ژێر دەستی دەسەڵاتدارانی ناوەندی، بەڵام هەبوونی دەسەڵاتی کوردی لە باشووری کوردستان ڕێخۆشکەرە بۆ وەرگرتنی بەرنامەیەکی تۆکمە و تەواو بۆ کۆکردنەوە و لەچاپدانی فلۆرای کوردستان.

ناوەندەکانی فەرمانگەی توێژینەوەی ژینگە و کشتوکاڵی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان (ورمێ، سنە، کرماشان و ئیلام) توانیویانە سەرجەم ڕووەکی ئەو پارچەیەی کوردستان بە ناوی پرۆژەی تایبەت بە فلۆرای ئێران ئامادە بکەن و چاپی بکەن. هەر چەند کاری ئەم چوار ناوەندە زۆرتر بە شێوازی تەواو زانستیە و کەمتر ئاوڕیان داوەتەوە لە بەشی ناوی خۆماڵی و کوردی ڕووەکەکان یان هەر گرینگیان پێ نەداوە وەکوو فلۆرای پارێزگای سنە، بەڵام کەسانێک وەک دانەری فەرهەنگی ڕووەکە دەرمانیەکانی کوردستان و فەرهەنگی ڕووەکناسی کوردستان بە سوود وەرگرتن لە ئەنجامەکانی فلۆرای هەر چوار ناوەندی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بەشی ناوی خۆماڵی و کوردیمان بەم کارە زیاد کردووە.

کارەکانی فلۆرای ناوچەی باکووری کوردستانیش هاوچەشنی کاری ڕۆژهەڵاتی

کوردســـتانە. کارەکانی ئەحمەد درهی و مەهمەت فیراتیش زۆر بە ســـەرکەوتوویی ئەنجام دراون و ئەمن بۆ ئامادە کردنی چاپەکانی داهاتووی فەرهەنگی ڕوەکناســـی کوردستان چەشنی سەرچاوەیەکی سەرەکی سوودیان لێ وەردەگرم و دڵنیام بە زیادکردنی ناوەرۆکی ئەم دوو پەرتووکە بەنرخە، ڕوەکەکانی باکووری کوردســـتان تۆکمە و تەواو ئامادە دەبێت. بەداخەوە بۆ چاپی یەکەمی فەرهەنگی ڕوەکناســـی کوردســـتان ئاگەداری چاپی کارەکانی ڕوەکناســـی کوردی باکووری کوردســـتان نەبووم.

ڕێژەی ڕوەکە تۆمارکراوەکانی ناو فەرهەنگی ڕوەکناسی کوردستان سەرووی ۲٥۰۰ جۆر ڕوەک دەبێت. بە شێوەی خەمڵێندراو ئەم فەرهەنگە داگری لەسەدا ۹٥ فلۆرای بەشی ڕۆژهەڵات، ٥٥ بەشی باشوور، ٤۰ بەشی باکوور و ۲٥ لەسەدی فلۆرای ڕۆژاوای کوردستانە.

## باسی یەکەم

### پێشینەی گیادەرمانی و دەرمانگەری لە جیهان

سـەبارەت بە دۆزینەوە و ڕوونکردنەوەی مێژووی ڕوەکە دەرمانیەکان پێویستە سـەرەتا پێشـینەی دەرمانناسـی[1] بزانین. لە سـەرەتای ژیانی شـارسـتانیەتی مرۆڤ ئەرکی دەرمان و چارەسـەری بە زۆری لە سـەر بەرهەمە دەرمانیەکانی ڕوەک هەڵسووڕاوە، بەڵام پاش ساڵەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمی زایینی مرۆڤ چووە قۆناغی بەکارهێنانی دەرمانە سـەنتێتیکانی بواری کیمیا و فایتۆکیمیا. بە واتایەکی دیکە پاش سەدەی بیستەمی زایینی بواری گیادەرمانی و بەگشتی ڕێبازی پزیشکی کۆن و خۆماڵی بوو بە ڕێبازەکی پاڵەکی و لاوەکی ڕێبازی دەسەڵاتداری پزیشکی تازە.

بە بۆچوونی زۆربەی پسـپۆڕان و شـارەزایانی مێژووی ئەم بوارە، لەوانەیە دۆزینەوەی تایبەتمەندی دەرمانی ڕوەکەکان بگەڕێتەوە بۆ قۆناغی گەشـەی هەستی غەریزی و خۆماکی دەروونی مرۆڤەکان. واتا مرۆڤەکانیش هاوچەشنی زیندەوەرانی دیکە بە یارمەتی هێزی خۆماکی[2] دەروونییان، بەرهەمی خۆراکیان لە مەوادی ژەهر و بەرهەمی ناخۆراک جیا کردووەتەوە. چونکە هیچ زیندەوەرێک بە ویسـتی خۆی

---

[1]. Pharmacology

[2]. غریزی

خۆراکی ژەهراوی و کوشـــندە ناخوات. مرۆڤەکانیش هاوشـــێوە کاریان کردووە و گەیشـــتوون بە زنجیرەی جیاوازی خۆراک و ناخۆراک. لای پســـپۆڕانی بواری خۆراک، دەرمان بەشێکی گرینگە لە خۆراکەکان.

لە لایەکی ترەوە مرۆڤ هەمیشـــە هەوڵی داوە ژمارەی زۆرتری زیندەوەرانی دەوروبەری خۆی بکێشـــێتە ژێر ڕکێفی خۆی و ســـوودی یەک ئاراســـتە یا دوو لایەنە یان لێ وەربگرێت. مرۆڤ بە واتایەک هاوڕێیەتی کار و گوزەرانی خۆی بە زیندەوەرانی دیکە پڕ کردەوە و توانی ئەزموونی خۆماکی زیندەوەرانیش بۆ خۆی وەربگرێت. بۆ نموونە زۆربەی ئەو ڕوەک و بەروبوومانەی کە ئەســـپ و گوێدرێژ دەیخۆن کەمتر بۆ مرۆڤەکان ژەهراوین. چونکە پێکهاتەی گەدە و ددان و کاوێژ نەکردنی ئەم ئاژەڵانە هـاوشـــێوەی مرۆڤەکـانە. یـان ئەوەیکە مرۆڤ ژیـانی بوونەوەرەکانی دیکەی خستووەتە ژێر چاوەدێری خۆی و گەیشتووە بە زۆر خاڵی خۆدەرمـانی ئاژەڵ و پەلەوەرەکـان. کە ئەم بـابەتە دەبێت بە ســـەرەتـایەک بۆ دۆزینەوەی دەرمان و هەڵسوکەوتی چارەســـەری نەخۆشـیەکانی خۆی. بۆ نموونە گیانداری پشـــیلە کاتێ هەســـت بە ژەهراوی بوونی خۆی دەکات ڕوەکی هەرێز[1] دەخوات و دەڕشێتەوە تا وەکوو ژەهرەکەی ناوسکی بێتەوە دەرێ، یا بزنەکێویەکان بۆ کەمکردنەوەی ژانی زایین، پێش منداڵبوون بەر و گەڵای ڕوەکی گووژاڵک دەخۆن و ئازاری زایینیان دەشـکێ، یان ورچە کێویەکان بۆ هێمن کردنەوەی ئێش و ژانیان ڕوەکی هاز دەخۆن یا کەڵەکێویەکان بۆ ئەســرەوتن و هێورکردنەوەی ژانی برین و برینیان، جەستەی خۆیان هەڵدەسوون بە ڕوەکی ژێئۆم[2].

مرۆڤ بە درێژایی هەزاران ســـاڵ ژیانی لەگەڵ ئەم ســـروشـــت و زیندەوەرانە بەردەوام هەگبە و پرێســـکەی ئەزموونەکانی دەوڵەمەند کردووە و ڕۆژبەڕۆژ لە بواری دەرمان و خۆراک ئەزموونداتر دەبێت. هەروەها هەمیشـــە بەهۆی هەســـتی پشـــکنین و کەنوکۆی هزری مرۆڤـایەتی خۆی، بەروبوومی ڕوەکەکـانی تـاقی کردووەتەوە و بۆ گەیشـتن بە دنیای نهێنی و ڕواڵەتی ڕوەکەکان تەنانەت مەترسـی مەرگ و کوشتنی خۆیشی قەبووڵ کردووە.

---

١. *Agropyron repens*

٢. *Geum chiloense*: علف مبارک

مرۆڤ پاش قۆناغی بەدەســت هێنانی زانیاری لە ڕێگەی هەسـتی خۆماکی خۆی و زیندەوەرانی دیکە، زۆرتر ڕووی کردە بواری هزر و لۆژیک. کەواتە هێزی ژیری و بیری خۆی خسـتە کار و بۆ چاکسـازی شـێوازی ژیان و کەمکردنەوەی ئاسـتی دەرد و ژانی ژیانی بەردەوام توێژینەوەی کرد تا وەکوو بگات بە ئارەزووەکانی کە ژیانێکی کەم ژان و بێ ناخۆشی بێت.

بڵاوبوونەوەی مرۆڤ بە ڕووی ئەم زەمینە پـان و بەرینە و جێگیربوونی مرۆڤەکـان بە دەســـتە و هۆزی جیـاواز بە دەشـــت و دۆڵەکـان، بوو بە هۆی ســــەرهەڵدانی کۆڕ و ماڵباتی گەورە تا وەکوو وردە وردە بوو بە نەتەوە و گەل و شــــارســـتانیەت. کەواتە هەر هۆز و نەتەوەیەک هاوشــیوەی جیاوازی ئاســـتی ڕۆشنبیری و زمان و هەڵسوکەوتی ڕۆژانە، ئاست و ڕێژەی ئەزموونەکانی خۆراک و دەرمانیشـــی جیاوازتر بوو، تا وەکوو ئەوەی نەتەوە گەورەکان بوون بە خاوەنی ڕێباز و ڕێچکە ئەزموونی دەرمانی و پزیشکی خۆیان.

سـەرەتای بەکارهێنانی بەروبوومەکانی ڕوەک بۆ بواری تەندروسـتی و پزیشـکی دەگەڕێتەوە بۆ ٥٠٠٠ ســـاڵ پێش زایین کە لە لایەن ســــوومەریەکانی مێزۆپۆتامیا تۆمار کراوە، پاشان میسریەکان کە بە شێوەیەکی بەربڵاوتر ڕوەکە دەرمانیەکانیان خستە ناو بەرنامە و ڕەچەتەکانی دەرمانی و چارەسەری نەخۆشیەکانیان.

پێگەی گیادەرمانی لای نەتەوەکانی جیهان

**میسریەکان**

مێژووی میسـر باس لەوە دەکات کە بەدیهێنەری دەرمان و چارەسـەری ئازار و نەخۆشـیەکانی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ خوداکانی کەوناراییان کە ئیزیس[١] و هێرمێس[٢] بووە. نووسراوە کۆنەکانی میسر دەگێڕنەوە کە پزیشکی ناوداری میسیر ئیمهۆتێپ[٣] بەهۆی شارەزایی و لێزانی پزیشکییەوە خەڵکی ئەوکاتە چەشنی بۆتێک دەیانپەرست.

---

١. Isis

٢. Hermes

٣. Imhotep

نووسراوە و ڕەچەتەکانی ئەم پزیشکە سەرچاوەیەکی خوێندن و ئەزموونی بوقراتی حەکیم بووە.

میســــریەکانیش چوار توخمی ئاو، خاک، با و ئاوریان لا پیرۆز بوو، بەڵام ئەم نەتەوەیە ســـێحر و جادوویان تێکەڵی پزیشـــکی کرد کە دوایی بوقراتی حەکیم لێکی جیا کردنەوە. لە وڵاتی میســـیر هەندێ بەڵگەی پاپیرۆســـی کۆنیان دۆزیوەتەوە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ١٥٥٠ ســاڵ پێش زایین. لە ســەر ئەم بەڵگانە پێناســەی چەندین نەخۆشی و دەرمانی برین و شکاوی نووسراوە. هێرۆدۆت مێژوونووسی کۆنی یۆنانی سەبارەت بە میسیریەکان دەڵێت: ژمارەی پزیشکانی میسر گەلێک زۆر بوون. هەندێ لە پزیشـــکان تەنیا لە بوارەکانی چاو، ددان و یا گەدە کاریان کردووە. هەروەها زانســـتی پزیشـــکی میســـر ســـەرەتا بەهۆی پیشـــەی مۆمتاوی کردنی مردووەکانەوە دروست بووە کە دوایی پیشەوەرانی مۆمتاوی بوون بە پزیشکان و نەشتەرگەرانی شیاوی ناو کۆشکی پاشاکان و خەڵکی ئاسایی.

ساڵەکانی پێش ئێستا پشکنەرانی مێژووی کۆنی میسر چەندین بەڵگەی بەنرخی پاپیرۆســیان دۆزیەوە کە یەکێ لەم پاپیرۆســانە بە ناوی ئێبریز[١] ناوی حەوتســەد دەرمانی نەخۆشی لە سەری نووسراوە و هەروەها پاپیرۆسی کاهوون (١٨٥٠ پێش زایین) ناوی هەندێ شـــیافی هێناوە کە بۆ بەرگری کردن لە ســـکپڕبوونی خانمان نووسیوە.

### ئاسوور و بابل

پاشای بابلیەکان حەموورابی لە سەرزەوینی عێراقی ئەوڕۆ نزیک بە ٢٢٠٠ ساڵ پێش زایین چەندین یاســای بواری پزیشـکی بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتەکەی دەرکردووە، وەکوو کرێی چاوپێکەوتنی پزیشـــک لە نەخۆش، غەرامە کردنی پزیشـــکان لە کوێر کردنی چاوی نەخۆش بە کوێر کردنی چاوی پزیشـکەکە و هەروەها دایەنی تاوانبار بۆ مردنی منداڵ بە برینەوەی مەمکی دایەن. تۆکمە کردن و بناغەدانانی زانســـتی پزیشـــکی لە وڵاتی بابل نزیک بە ٤٠٠٠ ســـاڵ پێش ڕێبازی پزیشـــکی یۆنانی بووە.

---

١. Ebers

یەکەم زانیاری تۆمارکراو لە سەر پزیشکی لە ناوچەی میزۆپۆتامیا دۆزراوەتەوە کە پارچەیەکی گڵینەیە و هی ۲۱۵۰ ساڵ پێش زایینە. لە سەر ئەم پارچە گڵینەیە سەبارەت بە شۆردن و تیمارکردنی برینەکان نووسراوە. یان چەندین پارچەی شوێنەواری مێژوویی شارستانیەتی ئاسوور (۷۰۰ ساڵ پێش زایین) سەبارەت بە پێناسەی نەخۆشییەکان و پێرستێک لە سەدان ڕوەک و زیندەوەر و کانزا بۆ چارەسەر و دەرمان بە نووسراوە ماوەتەوە.

لە کۆی ۲۸۲ یاسای ناو دەستوورنامەکەی حەموورابی پاشای بابیل دە یاسا دەربارەی بواری پزیشکی و دەرمانەوە دانراوە. ئەم دەستوورنامەیە ساڵی ۱۹۰۱ لە تەپۆڵکەیەکی لای شووش[۱] دۆزراوەتەوە و ئێستاکە لە مۆزەخانەی پاریس دانراوە.

**هیند**

نەریتی پزیشکی و دەرمان لە وڵاتانی هیند و چین هاوکات لەگەڵ نەتەوەکانی میزۆپۆتامیا و میسر دروست بووە. یەکێ لە ناودارترین ڕێکخستنەکانی مێژوویی بواری پزیشکی لە وڵاتی هیند، نەریتی خوێندەواری پێویست بۆ ژیان و تەمەنێکی زۆرتر بە ناوی ئایۆرڤیدا[۲]. ئەم نەریتە لە سەر بیر و باوەڕەکانی ئایینی هیندوویسم و بووزیسم دامەزراوە. یەکێ لە پەرتووکە پیرۆزەکانی سانسکریتی هیندی بە ناوی ڤیدا[۳] بە چڕی باسی مێژووی پزیشکی هیند دەکات. ئەم پەرتووکە کۆنترین نووسراوەی لقی زمانەکانی هیندوئەورووپییە کە ۵۰۰ تا ۱۰۰۰ ساڵ پێش زایین نووسراوە. سەرچاوەکانی پزیشکی لە وڵاتی هیند سەرەکیترین سەرچاوەی پزیشکی ئێران و وڵاتانی دیکەی جیهان بووە.

پەرتووکی سوشرۆتا سەمهیتا[٤] ساڵی ٦۰۰ پێش زایین، یەکێ لە گەورەترین سەرچاوەکانی پزیشکی کۆنی هیندیە کە سەرچاوەیەکی نووسراوی سانسکریتیە، بەڵگەیەکەی مێژوویی گەورەیە بۆ پزیشکی و چارەسەری لە ڕۆژگارانی کۆن. بۆ

۱. شووش شارێکە لە پارێزگای خووزستانی ئێران

٢. Ayurveda

٣. Veda

٤. Sushruta Samhita

نموونە ئاماژەی بە ٧٦٠ ڕوەکی پزیشکی کردووە بۆ کاری دەرمان و چارەسەری لە بواری پزیشکی مرۆڤ. ئەم پەرتووکە یەکەمین ئەزموونەکانی نەشتەرگەری پزیشکی مرۆڤی تێدا تۆمار کراوە، وەکوو نەشتەرگەری ئاو مرواریدی چاو، دوورینەوەی قێرەبوونی گون و سک، شێوازی منداڵبوونی سیزاریەن، دەرهێنانی بەردی میزڵدان، نەشتەرگەری جوانکاری، بەکارهێنانی مەگناتیس لە بواری نەشتەرگەری و هتد، هەروەها ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی گەورەیە بۆ ڕاهێنانی پزیشکان و نەشتەرگەران. هەروەها کتێبی (شاراکا سەمهیتا) کە ئەم کتێبەیش ٥٠٠ دەرمانی ڕوەکی لە ٥٠ پۆلی جیاوادا هێناوە.

دێنۆنتری شاگردی سوشرۆتای حەکیم (٥٥٠ پێش زایین) دەڵێت: هەوێنی نەخۆشی هاوڵە (مێکوتە) بە نووکی نەشتەر لە گوانی مانگا بگرە و دوایی لە ماسوولکەی نێوان ئەنیشک و ئەستۆی دەست نەشتەری بکە تا وەکوو خوێنی لێ بێت، تا بەم شێوەیە تای هاوڵە دروست ببێت. ئەم کارە بۆ کوتان دژی نەخۆشی هاوڵە کراوە و یەکەم ئەزموونی کوتانە. سەدەی ١٨ی زایینی کوتان لە ئەورووپا ناسێندرا بەڵام هیندیەکان هەزاران ساڵ پێش ئێستا ئەم کارەیان کردووە. ٦٠٠ ساڵ پێش زایین لە وڵاتی هیند دەیان خەستەخانە بۆ دەرمانی نەخۆشەکان کرابوونەوە کە بەردەوام لەگەڵ خەستەخانەکانی کۆنی ئێران پێوەندیان هەبووە.

دوتو گامنی[١] پاشای دوورگەی سەیلان (١٣٧ پێش زایین) هەژدە خەستەخانەی کردەوە و پزیشکانی پێویستی بە مووچەی تایبەت دامەزراند.

### یۆنان و ڕۆم

چیرۆکە کۆنەکانی یۆنان کاتێ باس لە سەرهەڵدانی زانستی پزیشکی دەکەن، گوایە ئاسکولەپیووس[٢] یەکەم چەشنی خوای پزیشکی و دەرمان هاتووتە سەر زەوی. ئاسکولەپیووس لە مێژووی ئەفسانەیی یۆنان دروشمی چارەسەری زانستی پزیشکی بووە کە کوڕەکانی پزیشک بوونە و کچەکانی هیگیەیا نیشانەی هێزەکانی تەندروستی، مێدیترینە نیشانەی پزیشکی و پاناسیئا نیشانەی دەرمانی دەرد

١. Dootoo gameny

٢. Aesculapius

ناسـێندراون. هەندێک لە مێژوونووسـان دەڵێن: ئاسـکولەپیووس شـاگردی حەکیم هێرمێسی میسری بووە. لە وڵاتی یۆنان زانستی پزیشکی بە هەشت حەکیمی گەورە بە میرات گەیشتووە.

١) ئاسـکولەپیووس: بوقراتی یەکەم دەڵێت ئاسـکولەپیووس گۆچانێکی لە داری هێرۆ هەبووە کە نەخشـی مارێکی بە گۆچانەکەوە هەڵکەندبوو. هەروەها حەکیم چالینووس دەڵێت: ئاسکولەپیووس گۆچانەکەی لە هێرۆ دەستنیشان کردبوو. چونکە گەرمی و سـاردی هێرۆ مامناوەندە. کەواتە پێویسـتە کاروباری ژیانیش مامناوەند بێت. ئەم حەکیمە هیچ کات گۆچانی لە دارێک کە مامناوەند نەبوو، هەڵنەدەگرت. هەروەها نەخشـی ماری سـەر گۆچانەکە نیشـانەی ئەوە بوو کە تەمەنی مار لە زیندەوەرانی دیکە زۆرترە. کەواتە پزیشکی زانستێکە کۆن نابێت و لەناو ناچێت.

ئەوڕۆکە گۆچانەکەی ئاسـکولەپیووس و نەخشـی مارەکەی بووە بە نیشـانەی پزیشکی و دەرمانسازی. سەبارەت بەم گۆچان و مارە گەلێک چیرۆک باس کراون. یەکێ لەو چیرۆکانە ئەمەیە: ئاسـکولەپیووس خەریکی دەرمانی کەسـێک بووە کە بە هەورەبریسـکەی زێئووس[١] بریندار بووە. ئەو کاتە مارێک وە ژوور دەکەوێت. ئاسـکولەپیووس مارەکە دەکوژێت. دیسـان مارێکی دیکە وە ژوور دەکەوێت و گیایەک ئەخاتە دەمی مارە کوژراوەکە. بەم شـێوە مارەکە زیندوو دەبێتەوە. دوایی ئاسـکولەپیووس ئەو گیایە بۆ دەرمانی نەخۆشـەکەی بەکار دەهێنێت. ئەم چیرۆکە نیشان ئەدات کە ڕێچکەی حەکیم ئەسکولەپیووس بەپێی وەرگرتنی زانیاری دەرمان و چارەسەری لە ئەزموونی سروشت بووە.

٢) غۆرس: ئەم حەکیمە شـاگردی بوقراتی یەکەم بووە کە ٨٥٠ سـاڵ دوایی ئاسـکولەپیووس دەسـتی بە کاری پزیشـکی کردووە. ئەم حەکیمەیش هاوشـێوەی ئاسکولەپیووس زانیاری دەرمان و چارەسەریی لە ئەزموونی سروشت وەرگرتووە.

٣) مینس: سـێهەمین حەکیمی گەورەی یۆنانی کۆن بووە. جیاوازی ئەم حەکیمە لەگەڵ حەکیمانی پێش، ئەوە بووە کە مینس باوڕی وابووە کە هەندێ جار ئەزموون

---

١. خودای خوداکانی یۆنان

بە تەنیا مەترسی گەورەی لێ ئەکەوێتەوە. بۆیە شێوازی قیاس زیادە ئەکات بە پزیشکی واتا ئەزموون و قیاس پێکەوە.

٤) برمانیدس (پارمنیدس یا بارمنیدس): ئەم حەکیمە لە نێوان ساڵەکانی ٥٤٥ بۆ ٥١٥ زایین ژیاوە. برمانیدس پزیشک و فەیلەسووفی پێش سوقرات بووە کە ڕێچکەی پزیشکی تەنیا لە سەر قیاس داناوە. ئەم حەکیمە بە دەسپێکەری بەکارهێنانی مەنتق لە بواری (مابعدالطبیعە) دەناسرێت. برمانیدس باوڕی وابووە کە تەنیا هێزی ناسین و پێناسە کردن بۆ مرۆڤ عەقڵە و هەستەکان هیچ دەورێکیان لەم بابەتەدا نییە.

٥) ئەفلاتوون: ئەم حەکیمە لە نێوان ساڵەکانی ٤٢٧ بۆ ٣٤٨ پێش زایین ژیاوە. ئەرەستوو مامۆستای ئەفلاتوون بووە. ئەفلاتوون لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا ڕێبازێکی فەلسەفی بە ناوی ئاکادمی دادەمەزرێنێت کە زانستەکانی ئەستێرەناسی، زیندەوەرناسی، هێندەسە، ڕەوشت و کەلام لەم ئاکادمیایە ئەخوێندرا. شاگردانی ئەفلاتوون بریتی بوون لە: کەسنۆفان و میرۆنس (پسپۆڕی نەخۆشیەکان)، فۆرۆنۆس (پسپۆڕی بەرنامەی جەستەکان)، فۆرلیس (پسپۆڕی خوێنبەردان[1])، سافرۆرس (پسپۆڕی نەشتەرگەری)، سرجس (پسپۆڕی چاو) و وەفانیس (پسپۆڕی شکان و دەرچوونی ئێسکەکانی لەش). شێوازی کاری ئەم حەکیمە گەورەیە لە سەر ئەزموون و قیاس بووە. ئەفلاتوون هەروەها سەرجەم نووسراوە و بەرهەمی حەکیمانی پێش خۆی کە تەنیا لە سەر ئەزموون یا قیاس بووە، هەمووی سووتاندوون.

باوکی ئەرەستوو یەکێ لە شاگردانی ئەفلاتوون بووە. ئەرەستوو (٣٤٨ پێش زایین) ڕاوێژکاری ئەسکەندەر بووە بۆ زۆربەی شەڕەکانی جیهان. ئەم حەکیمە چەندین دۆزینەوەی لە بواری پزیشکی بە دەست هێناوە، بۆ نموونە ترپەی دڵ کە کاری دەمارەکانە و ئەنجامی میز کاری گورچیلەیە.

یەکێ لە حەکیمانی سەردەمی ئەرەستوو، حەکیم سوقرات بوو کە حیکمەت لە فیساغوورس و ئەرسالادووس فێر دەبێت. فیساغوورس لە سەردەمی پێغەمبەر

---

١. فصد

سولەیمان (د.خ) ژیاوە و دەڵێن حیكمەت لە سولەیمان فێر بووە. سوقرات دەڵێت: ڕۆحی مرۆڤ پێش جەستە دروست بووە و جەستە قاڵب و ئامێرێكە بۆ ڕاگرتنی ڕۆح. كەواتە جەستە نامێنێت و ڕۆح زیندوو دەمێنێتەوە.

٦) ئاسكولەپیووسی دووهەم: مامۆستای بوقراتی حەكیم بووە و ڕێبازی پزیشكی ئەم حەكیمەیش لە سەر ئەزموون و قیاس بووە.

٧) بوقراتی دووهەم (ئەپووكراتس): ساڵی ٤٦٠ بۆ ٣٧٥ پێش زایین ژیاوە. ئەم حەكیمە بە باوكی پزیشكی ناوبانگی هەیە. باوڕی ئەم حەكیمە ئەوە بووە كە هەر نەخۆشییەک هۆكارێكی سروشتی هەیە و نابێت سەرچاوەی دانانی نەخۆشی بگەڕێنیەوە بۆ خودا. چونكە ئەم بۆچوونە نیشانەی نەزانین و بێ ئەزموونی خەڵكە كە وا بیر دەكەنەوە، هەروەها دەڵێت پیشە و هونەری پزیشكی دەبێتە هۆی پەرەستینی خودا و خۆشەویستی بەرامبەر بە مرۆڤەكان. بوقرات قسەیەكی بەناوبانگی هەیە، دەڵێت: زۆر جار نەنووسینی هیچ ڕەچەتەیەک باشترین دەرمانە بۆ نەخۆش.

٨) جالینووس[١]: ساڵەكانی ١٣١ تا ٢٠٠ زایینی ژیاوە و خەڵكی برگامای ئێستای توركیایە. بۆچوونەكانی ئەم حەكیمە نزیک بە هەزار ساڵ زاڵ بووە بە سەر پزیشكی ئاسیا و ئەورووپا. جالینووس ١٦ كتێبی سەبارەت بە پزیشكی نووسیوە. پزیشكان و حەكیمانی ئیسلامی وەكوو ڕازی و بیروونی و ئەبووعەلی سینا سوودی زۆریان لە بەرهەمەكانی حەكیم جالینووس وەرگرتووە.

جالینووس بنەمای دروستكردنی دەرمانی بەپێی پێوەری پلەی گەرمایی (ساردی و گەرمی) داناوە. ئەم حەكیمە لە كۆی نووسراوە دەرمانیەكانی ٤٧٣ دەرمانی ڕووەكی بەكار هێناوە.

## چین

١. Claudius Galenus

حەکیم شـێن نۆنی[1] بە باوکی پزیشـکی چینی دەناسـرێت کە ۲۸۰۰ پێش زایین ژیاوە و کتێبێکی هەیە بە ناوی ڕووەکنامە[2] کە کۆنترین کتێبی پزیشـکی جیهانە. بۆ نموونە لەم کتێبەدا باس لە خوێنی ناو دەمارەکان دەکات. حەکیم شـێن نۆنی و تەنانەت حەکیمانی دیکە تا ۳۰۰۰ ساڵ پێش زایین بنەمای باوڕی پزیشکیان لە سەر (یین و یانگ) بووە. واتا هەموو ڕووداوێکی مرۆڤ دەرەنجامی دژایەتی نێوان دوو مـادەی یـانـگ (مـادەی نێر کە ڕووناکیبەخش و پتەو و داهێنەرە) و یین (مـادەی مێینەیە، نەرم، وەرگر، تاریک و پووچەڵە) داناوە کە تەندروسـتی مرۆڤ بەندە بە هەماهەنگی ئەم دوو مادەیە. پین چیو (۵۰۰ تا ٦۰۰ پێش زایین) حەکیمی ناوداری پزیشـکی کۆنی چین و داهێنەری زانسـتی ترپەی دڵ، توانی لقی پزیشـکی دەرزیاژن گەلێک فراوانتر و پێشکەوتوو بکات. ئەم پزیشکە چەندین کاری گەورەی تۆمار کرد وەکوو کوتانی هەوێنی هاوڵە لە ناو لووت، ڕەچەتەی گۆشـتی ئەسـپی دەریایی بۆ نەخۆشی گواتر، پۆلێنبەندی ۵۱ بەش بۆ ترپەی دڵ و ۷ گۆڕانکاری لە سەر زمان و ۹ بەش دەرزی جیاواز بۆ یەک خاڵی دیاریکراوی لەش. چینیەکان گرینگی زۆریان بە ترپەی دڵ داوە بۆ ناسینی مرۆڤەکان.

چینیەکان باوڕیان بە ٥ توخمی سـەرەکی ژیان هەیە، واتا ئاو، ئاور، خاک، کانزا و دارستان[3]. ئەم ٥ توخمە پێوەندی بە ٥ ئەندامی لەشی مرۆڤەوە هەیە، وەکوو: ئاو بۆ گورچیلە، ئاور بۆ دڵ، کانزا بۆ سی و ناوپەنچک، خاک بۆ سپڵ و چێو بۆ جەرگ.

چەندین دەرمانی سەرەکی لە پزیشکی کۆنی چین بەکار هاتوون وەکوو: قەوزەی دەریایی، ڕێواسی چینی (ڕیوەند)، ئاقونیتۆن، شادانە، کافوور، جەوڕنە، ئاسن، گۆگرد و جیوە. سـاڵەکانی ۲۰۰ تا ۱۰۰ پێش زایین بنەماکانی پزیشـک خۆماڵی چینی لە کتێبێک نووسرا بە ناوی (دیاری ئیمپراتۆری زەرد لە پزیشکی ناوخۆی هاوینگ دی نی جینگ) کە پێکهاتووە لە دوو بەشـی سـەرەکی یین و یانگ و هەروەها پێنج توخمی سەرەکی وی یۆسینگ. کتێبی (خەڵاتی زەویە کشتوکاڵیەکانی خودا) یەکێکی دیکەیە لە بەرهەمەکانی پزیشـکی خۆمـاڵی چینی کە سـەدەی یەکەمی زایینی

١. Shen-Nuny

٢. Pen Tsao

٣. چێو و دار

نووسراوە و ٢٥٢ دەرمانی ڕووەکی پێناسە و شرۆڤەیان بۆ کراوە.

پزیشـــکی کۆنی چینی و ژاپۆنی بەهۆی دوورەپەرێزییەوە بەڕێژەیەکی کەم کاریگەری داناوە لە سەر لقی پزیشکی کۆن لە وڵاتانی هیند، یۆنان و ئێران. ڕێبازی پزیشـکی تازە بەڕێژەیەکی کەم کاریگەری داناوە لە ســەر ڕێبازی پزیشـکی چینی، چونکە سـاڵی ١٩١٢ کە لقی پزیشـکی ڕۆژاوا (پزیشـکی تازە) دەڕواتە وڵاتی چین، هاوکات هەر دوو شـێوازی پزیشـکی خۆماڵی چین و پزیشـکی تازە بە شـێوەی بەرابەر ئەخوێندرێت و گرینگی پێ دەدرێت.

سـاڵی ١٩٧٧ فەرهەنگنامەی گەورەی پێکهاتە دەرمانیەکانی پزیشـکی خۆماڵی چینی ئامادە کرا و بە زمانی ئینگلیزی بڵاو کرایەوە. ئەم بەرهەمە گەورەیە داگری ٥٧٥٧ دەرمانە کە بەشی سەرەکی و زۆرینەی سەرچاوە ڕووەکیەکانە.

**جوولەکە**

نەتەوەی جوولەکە خودای پەروەردگـار بە یەکەم حەکیم و پزیشـــکی مرۆڤ دەزانن. مێژوو باس لەوە دەکات کە کاتێ بەختولنەسـر پاشـای بابێل جوولەکەکانی بە دیل گرت و بەم شێوە جوولەکە لە بابێل و مێزۆپۆتامیا پەرەیان سەند. ساڵەکانی ٢٠٠ تـا ٣٠٠ زایینی جوولەکە ئـاوارە و دیلەکـانی وڵاتی بـابێـل بە فەرمـانـدەیی ڕێشـجالووت[١] کۆمەڵێکیان پێک هێنا و دەسـتیان کرد بە بڵاوکردنەوە و پەرەپێدانی بەرنامەکانی پێغەمبەر مووسـا (د.خ) و قسـە و باسـەکانی نەتەوەی یەهوود. پاشـان سـەرەتای سـەدەی سـێهەمی زایینی خوێندنگەیەکیان دامەزراند بە ناوی سـوورا و زانـایانی یەهوود[٢] دەسـتیـان کرد بە خوێندنی زانسـتەکان و هەواڵ و ڕێبـازە جۆربەجۆرەکـان کە دوایی بە تەلموود نـاوی دەرکرد. لە عەهـدی عەتیق خودا بە مووسـا دەڵێت: ئەگەر یەهوود فەرمان و دەسـتووراتی من جێبەجێ بکەن، هیچ کام لەو نەخۆشـیانەی کە بۆ میسـریەکانم ناردووە بۆ ئێوەی نانێرم. کەواتە کاتێ لە ڕوانگەی ئەم ڕێبازە ناردنی نەخۆشـی لە لایەن خودا بێت، واتە پزیشـک دەورێکی

١. Resh-galuta

٢. Amoraim

لاوەکی هەیە بۆ نەخۆش و دەوری سەرەکی پێشەوا ئایینیەکانی جوولەکە دەبینن.
بە گشتی عێبریەکان زۆر پێشتر لە ئێرانیەکان خاوەنی شێوازی پزیشکی تایبەت بە خۆیان بوون. کەواتە دیارە نزیکایەتی شوێنی نیشتەجێ جوولەکەکان بە وڵاتی ئێران و هەروەها هاتنی ئایینی جوولەکە پاش مادەکان بۆ ناو ئێران توانیویە کاریگەریەکانی خۆی لە سەر پزیشکی ئێران دابنێت. بۆ نموونە نەریتی خەتەنە کردن کە پێشتر لە میسریش هەبووە یەکێ لە ئەرکە دینیەکانی جوولەکەیە و تەورات ئاماژەی پێ کردووە.

## سووریێستەکانی[1] ئەمریکا

ساڵی ١٤٧٦ زایینی کریستۆف کولۆمب[2] گەشتیاری ئیسپانیایی دەچێتە خاکی ئەمریکای ناوەڕاست لە وڵاتی مەکسیک، پاشان ساڵی ١٥١٨ هێرنان کۆرتس[3] پاشایەتی ئەزتەکەکانی[4] لە مکزیکۆسیتی شکست پێ دێنێت و بە فەرمی دەچێتە ژێر ئاڵای وڵاتی ئیسپانیا. کۆرتس گوزارشتی بۆ پاشای ئیسپانیا نارد کە ئێمە لەم وڵاتە پێویستمان بە دەرمان و پزیشکانی ئەورووپی نییە چونکە کاروباری پزیشکی و دەرمان و چارەسەری شارستانیەتی نەتەوەکانی ئێرە وەکوو ئازتەک و مایا[5]، گەلێک پێشکەوتووترە لە ئەرووپا. هەروەها بارودۆخی تەندروستی و خاوێنی مکزیکۆسیتی زۆر چاکترە لە شارەکانی ئاسیا و ئەورووپا.
پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵی شارستانیەتی ئازتەک و ماياکان، توێژەرانی ئەورووپی دەستیان کرد بە گەڕان و پشکنین بە سەرزەوی سووریێستەکاندا و سەدان و هەزاران دەسکەوت و هەوێنی ئەم وڵاتەیان پێناسە و تۆمار کرد. بۆ نموونە گەرماوی هەڵم و گەرماوی تەڕ[6] بۆ دەرمانی ڕۆماتیزم[7]، بانتر لە ١٢٠٠

١. Indigenous peoples of the Americas: امریکیون اصلیون
٢. Christopher Columbus
٣. Hernán Cortés
٤. Aztec
٥. Maya
٦. حمام تعریق
٧. Rheumatism

ڕوەکی دەرمانی، کۆمەڵێک دەرمانی سەرخۆشکەر و موخەدیرات و ژەهراوی، خواردنەوە هێزبەخشەکان (گیراوە لە کاکائوو[1]، ڤانیل[2]، بیبەر و هەنگوین)، تووتن، کۆکا[3]، کائۆچۆ[4]، نەشتەرگەری منداڵبوون، دەرزی تایبەت بۆ هۆقنە و عیماله کردنی دەرمان (دروستکراوە لە لاستیکی کائۆچۆ)، بەرنامەی خواردنی دروست، دەرمانی شکان و دەرچوونی ئێسک، ئەندامی دەسکرد وەکوو دەست و پێ، دەرهێنان و لابردنی لک و لووی ناو ئەندامەکانی جەستە، کۆڕبەندی سەرتاسەری ساڵانە بۆ تەندروستی، بەرنامەکانی پارێزگاری لە بەساڵاچوان و کەمەندامان، خەستەخانە و دەرمانگە تایبەتەکان.

---

١. *Theobroma cacao*

٢. *Vanilla planifolia*

٣. *Erythroxylum coca*

٤. کائۆچۆ (لاستیکی سروشتی یا Rubber or Caoutchouc): شیلەیەکی لاستیکیە کە بەرهەمی زیاتر لە ٤٠٠ جۆر ڕوەکە، بەڵام زۆرترین بەرهەمی لە داری *Hevea brasiliesis* بە دەست دێت

## باسی دووهەم

### پێشینەی ڕوەکناسان و گیادەرمانانی کوردەواری

ئەوسا لە هەموو جێگەیەکی ئەم نیشتمانە بەتایبەت لادێ و هەوارەکان خەڵکی بۆ ڕاپەڕاندن و چارەسەرکردنی کاری ڕۆژانە و گیر و گرفتەکانی بەردەم ژیان و گوزەرانیان، فێری پیشە و ئیشەکانی پیشەسازی سادە و کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و ماڵداری دەبوون. فێربوونی پیشەی چارەسەرکردنی نەخۆشی و ناکۆکیەکانی جەستەی مرۆڤ و ئاژەڵەکان بە ئەستۆی حەکیمان و گیادەرمانان بوو. هەموو دایک و باوکێک وەک کۆمەڵە ڕێنماییەکانی فریاکەوتن و پەرستاری کۆمەڵێک بابەتی پێویست لە حەکیمان و کەسانی شارەزا فێر دەبوون یان ئەزموون و ئەنجامی تێبینی و کاری خۆیان لە بیر هەڵدەگرت، بەڵام هەمیشە کەسانێک لەم ڕێگایەدا خاوەن ئەزموون و لێزانی زۆر و تایبەتی بوون و چارەسەر و دەرمانی جۆراجۆریان بۆ گەلێک نەخۆشی لە قاقەز و یاد و سینگی خۆیاندا هەڵدەگرت.

بۆ کاری چارەسەر کردن و فریاکەوتنی ژان و برینی نەخۆشان بەتایبەت پیرەژنان دەستی تواناتر و خاوەن ئەزموونی زۆرتر بوون، بەڵام هەمیشە لە ناو گوندێک یا ناوچە و شار و وڵاتێکدا حەکیمێکی نموونە کارە سەخت و گرانەکانی ئەنجام دەدا. ئەم حەکیمە بە حوکمی ئەوە کە هاوڵاتیانێکی زۆرتر لە دەوروبەری ڕوویان تێ دەکرد، ئاشنایەتی و شارەزایی لەسەر ڕوەک و بەرهەمە دەرمانیەکانی دەرەوەی سنووری خۆیشی بە دەست دەهێنا. کەواتە حەکیمی گەورە زۆرترین پێناسەی لە جۆر و دەرمانی ڕوەکی دەزانی و تێکڕا گیادەرمان و گیاناس بوو. زۆر جار بە حەکیمی سەرباشقە ناوی لێ دەبرا.

ئەورۆکە کەســـانێکی ناشـــارەزا تیر و تانەی ناڕەوا و نەشـــیاو فڕێ دەدەن بە ئەنجام و ئەزموونی پێشـــینیان، و هەروەها حەکیمان و شـــوێنکەوتوانی بواری گیادەرمانی و پزیشکی سروشتی و خۆماڵی کوردەواری بە کۆنەپەرست و گەڕاوە ناودێر دەکەن. بۆ نموونە بە تەشـــقەڵە و گاڵتەجاڕی دوکتەر بان قووڵینە و دەرمانی کوردیاتی ســـەرتەنووریان پێ دەڵێن. داخەکەم نازانن ئەم کەســـانە میراتی بەنرخی پێشینیانن و سامانی دوارۆژی نیشتمان. پێویستە کەسانی پسپۆڕ و شارەزا لەم بوارەدا زۆرتر ڕۆشـنگەری و ڕۆشـنبیری بکەن هەتا ئەم میراتە بەنرخە مەزلوومانە لەناو نەچێت. ڕەنگە ئەگەر ئەزموون و ئەنجامەکانی پێشینانمان چەشنی زۆر بابەت و تەوەری دیکە لە دەرەوە بهاتبایە، ئەوە وەک پەندی «گڵی دوور دەرمانە» خێرا پێشوازیان لێ دەکرد و پەرەیان پێ ئەدا.

لە کوردستان کەسانێک وەکوو (سمایل حەکیمی سلێڤانی، بورهان حوسەینی، جەلال سـەید کەریم گەڕاوی، میرزا سـدیق چنگیانی، سـاڵح سـروشـت، هەردەوێڵ کـاکەیی، کەمـاڵ جەلال غەریـب، ئەمیر ئەمینی، شـــەهـاب خزری و نوورەدین سـەدرەدین) چەشـنی ڕچەشـکێن هەندێ ئەرکی کۆکردنەوە و نووسـینی ئەنجام و ئەزموونی پزیشـــکی خۆماڵی کوردەوارییان ئەنجام داوە، بەلام پێویســـتە ئەم کارە تەواوتر و پوختەتر و زانسـتیانەتر بکرێت. دەکرێ ئەمانە چەشـنی بنەما و ئەلفوبێی ئەم بوارە چاو لێ بکەین. هیوادارم کەســـانێک ڕوو دەکەنە نووســـینی ئەم بوارە، زۆرتر بچنە ناو بابەتی ئەزموون و ئەنجامەکانی تایبەت بە پزیشـــکی خۆماڵی و سروشتی کوردەوارییەوە و بابەتە سەزارەکیەکان بکەن بە نووسراوە.

## چەند نموونە لە حەکیمانی مێژووی کوردەواری

نموونەیەک لە پیاوانی کورد کە لە مێژوودا بۆ کاری گیادەرمانی و دەرمانگەری خزمەتیان بە گەلی خۆیان و گەلانی دراوسێ کردووە[1]:

---

١. بابەتەکانی ئەم بەشە لە پەرتووکی «مێژووی ناودارانی کورد – ٣ بەرگ» نووسینی بابەمەردۆخی ڕۆحانی سنەیی، نامیلکەی «معرفی شفا: پێشینە و ناساندنی ناوەندی گیادەرمانی شەفا»، ماڵپەڕی (penusakan)

- ئەبووحەنیفەی دینەوەری (٣٠٠ کۆچی) گیاناس و گیادەرمانی ناوچەی دینەوەری کرماشان و خاوەنی بەرهەمی «كتاب النبات»
- ئیبنولکوردی شارەزووری (٧٨١ کۆچی) خاوەنی نۆرینگە و دەرمانگەی پڕ ئەزموونی گیاناسی و گیادەرمانی لە شاری مەککە
- شەمسەدین شەنگالی (٨٠٠ کۆچی) نووسەر و پزیشک و گیادەرمان لە شاری قاهیرە
- سەیدی هەورامی(١٥٠٠ زایینی) شاعیر و گیادەرمانی ناوچەی هەورامان
- عەلائەدین تەبیبی هەولێری (١٠٠٠ کۆچی) خەڵکی دەڤەری حەڵەب لە ڕۆژاوای کوردستان
- زەکی ئەفەندی سۆرانی (١١٠٠ کۆچی) حەکیم و گیادەرمانی ناوچەی سەردەشت و خاوەنی نامیلکەی (مختصر قانون در طب ابن سينا)
- نۆژدار سمایل حەکیمی سلێڤانی دهۆکی (١٨١٠ زایینی) حەکیمی بەناوبانگی سەردەمی عوسمانی و دانیشتووی ناوچەی سلێڤانی دهۆک و خاوەنی پەرتووکی «گیابەند»
- حاجی عەلی ئەدیب بۆکانی (١٢٩٥ هەتاوی) حەکیمی تایبەت لە بواری نەخۆشیەکانی پێست. ئێستاکە بنەماڵەی ئەم خوالێخۆشبووە کاریان لە سەر یەکێ لە مەڵهەمەکانی کردووە و بە ناوی «مەڵهەمی ئەدیب» لە وزارەتی تەندروستی و پیشەسازی ئێران تۆمار کراوە و کارگەی دروستکردنیان بۆ داناوە. چەند ساڵ پێش ئەم مەڵهەمە مەداڵیای برۆنزی ئەڵمانی وەرگرت
- ماڵباتی سەید ڕەحمانی باینچۆیی سنە بەتایبەت سەید حەمەحەکیم (١٣٥٢ کۆچی)
- شێخ عەولای هەزارکانیانی دیواندەرە (١٣٥١ کۆچی) حەکیمی بەناوبانگی ناوچەی سارال
- شێخ عەلادینی نەقشبەندی تەوێڵە
- شێخ عوسمانی دووڕۆ و شێخ موحەمەد سوورکەوڵ حەکیمانی ناوچەی

---

بابەتی گەشتێک بە بناری شاخی سەرکەشی قەندیل لە شاسوار هەرشەمی و هەروەها یاداشتەکانی خۆم، وەرگیراوە . نووسەر

مەریوان و سەوڵاوا

- بنەماڵەی حەکیمانی سەیدەکانی گوندی سەبەتڵووی بانە
- حەکیمانی گوندی کۆییلە لە دۆڵی باڵەییانی قەندیلی سەربەرز[1]
- ئەشرەفولحوکەما و بنەماڵەی ئەلیاسیەکانی شاری سنە
- مەلا خدری ڕواری هەورامی (١١٣٨ کۆچی) خاوەنی پەرتووکی «ئێقباڵنامە» کە مەلا عەبدولکەریمی مودڕس لە شێوەزاری هەورامیەوە کردوویە بە سۆرانی. ئەم پەرتووکە گەلێک ئامۆژگاری تەندروستی و پارێز و خاوێنی تێدایە
- حاجی برایم خاوەری ئاساوڵەیی، حەکیمی شاری کرماشان و مامۆستای کاک بورهان حوسەینی
- حەکیمە کوڵەی گردەکشانی (١٣٧٠ هەتاوی) ناوچەی دەشتی لاجانی پیرانشار
- بورهان حوسەینی، حەکیم و دەرمانگەری ناوەندی گیادەرمانی شەفا لە شاری سنە و خاوەنی بیرۆکەی کۆکردنەوەی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری « Kurdish Tradishnal Medicen:KTM»
- خەیاڵ عەبدوڵلازادە، خەڵکی گوندی هەمزاوای مەهاباد خاوەنی نۆرینگەی گیادەرمانی و کارگەی بەرهەمە ڕوەکیەکان، هەروەها چالاکوانی کۆمەڵەی ژنانی مەهاباد
- کۆمەڵەی ڕوەکناسانی کوردستان (٢٠٠٤ زایینی) لە باشووری کوردستان کە خاوەنی بەرنامە و پەیڕەوی تایبەتی خۆیانن و لە بواری پزیشکی تەواوکار و گیادەرمانی کار دەکەن، هەروەها کۆکردنەوە، نووسینەوە و پوختەکردنی ئەزموون و ئەنجامەکانی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی کوردەواری لە بەرنامەی ئێستا و داهاتوویاندا هەیە.

**چیرۆك و مژارە مێژوویەکانی گیادەرمانی لە کوردەواری**

لە خوارەوە هەندێک بابەتی ڕوەک و بەروبوومەکانی لە مێژووی کۆنی

---

١. لە قەندیل خەڵکی ئەم گوندە بە بلیمەتی و ئازایی و بوێری بەناوبانگن و دەڵێن قەد سەریان بۆ هیچ میر و دەسەڵاتێ نەخەواندووە. هەمیشە لە خزمەت دەرمان و هەتوانی خەڵک بەتایبەت پێشمەرگەدا بوونە (شاسوار هەرشەمی)

کوردستاندا باس دەکەین[١]:

- سەردەمی دەسەڵاتداری ئاسووریەکان نیشتمانی مادەکان بە ناوی حەکیمی گەورە «حەکیم نەمری و نیشـان» دەناسـرا. نۆرینگەی حەکیم نەمری لە شـاری سـازان (پاوەی ئەورۆ) و ئالان (ناوچەی سـەردەشـت) بووە. مێژووی دیمورگان و هێرۆدۆت ناوی ئەم شـارانەیان هێناوە. لە ئەنجامی شـەڕی نێوان ماد و ئاسـوور، حکیم نەمری بە هەموو بەرهەم و ڕەچەتە دەرمـانیەکـانی دەگوازرێتەوە بۆ وڵاتی ئـاسـوور. نەمری لە تێکەڵاوی شـیلەی ڕوەکەکـانی گوڵەدەوری[٢]، هومێو[٣] و هەسـەبەگی[٤] هەتوانێکی بەهێزی بە ناوی «سـارێژ» دروسـت کردووە و بۆ کاری دەرمانی هەناردەی یۆنان و ڕۆم و ئاسوور کردووە. لە هێرشی سارگۆنی دووهەم بۆ سـەر مادەکان، خەڵکی ناوچەکە دەڕفێندرێن بۆ لای هەمەدان و ئاسـووریەکانیش حەکیم نیشـان دەبەنە پایتەختی ئاسـوور. هەر لەم شـەڕەدا سـەربازانی ماد بۆ بەرگری لە نەخۆشـی نۆگە (مالاریا) و تاوبردوویی ڕوەکی وەردینە بەکار دەهێنن. هەروەها حەکیم نیشان گەلێک گیراوە و دەرمانی بە پێکهاتەی سەرەکی گوڵ نیشان[٥] دروست کردووە و بەکاری هێناوە.
- سـەردەمی مادەکان خەڵکانێک بەرهەمی سـێوەخووگانە[٦]یان چەشـنی کاڵایەکی بازرگانی بەهێز بۆ وڵاتانانی دەرەوە هەنارده کردووە.
- دیمورگانی فەڕەنسـی نووسـیویەتی کە یەکەم جار حەکیمی ماد «تائیل» لە ناو ئاسـووریەکاندا بۆ دەرمانی نەخۆشـیەکانی زەردۆیی و لاڕەشـە، دەرمانێکی لە داری تایله[٧] ساز کرد و بەکاری هێنا. وێدەچێ وشەی کوردی تایله لە هەمانی ناوی

---

١. بابەتەکانی ئەم بەشە بە زۆری لە پەرتووکی (فرهنگ گیاهان دارویی، امیر امینی) وەرگیراوە. بە بۆچوونی خۆم زۆرێک لە بابەتە مێژوویەکانی پەرتووکی ناوبراو لە چیرۆک و داستان دەچن و پێویستە بەڵگەمەندتر بن و سەرچاوەکانی دیسان وردبینی بۆ بکرێت. نووسەر

٢. *Parietaria officinalis* L.

٣. *Bryonia dioica* Jacq. = *B. multiflora* Boiss. & Heldr.

٤. *Mandragora officinarum* L.

٥. *Bellis perennis* L.

٦. *Atropa belladonna* L.

٧. *Celtis caucasica* Willd.

تائیلەوە هاتبێت.

- لە هێرشـــی سـەربازانی ڕۆم بۆ ســەر دەڤەری کوردەواری، مێهردادی دووهەم پاشای ئێرانی ئەگاتە فریای سنووردارانی کورد و ئەوانیش بە تاجەگوڵینەی گوڵەوەنەوشە[1] دەچن بە پێشوازیەوە.
- لە مێژووی ئێزەدیەکاندا هاتووە کاتێ نەیاران هێرەش دەکەنە ســەر یارانی شـــێخ ئۆدەی، گەلێک پیاوی ئایینی و خەڵکی ئاســـایی ئێزەدی لە ناو مووچە و کێڵگەکانیاندا دەکوژرێن. لەو کاتەوە ئێزەدیەکان خۆیان لە خواردنی کیوەر، کەلەرم[2] و لووبیا[3] دەبوێرن.
- لە پەرتووکی «دائرەالمعارف مذاهب» باســی ئەوە هاتووە یەکێ لە پێغەمبەرانی ئێزەدی ناوی خاســیە بووە. وشـــەی خاس هاوناوە لەگەڵ ڕووەکی کیوەر[4].
- ئاســـەوارەکانی تەپەی شــنۆ و زیویەی ســەقز دەریدەخەن کە ڕووەکی گوڵەبەڕۆژە[5] سەردەمانێک نیشانەی ڕووناکی و پشتبەستن بە کشتوکاڵەوە بووە.
- سەردەمانی کۆن لە ئایینی زەردەشتدا کاتێ نوێژکەران ئەچوونە نزا، تووی گیاکانی قانگ[6] و خەربەنگ[7]یان ئەکردە ســەر کڵی ئاتەژگە و پێیان وابوو ئەهریمەن بەو دووکەڵە دوور دەکەویتەوە. ئێستاکەش سووتاندنی قانگ لای خەڵکی ناوچەکە باوە.
- لە پەرتووکی «نفحات الانس» جامیدا هاتووە کوردەکان لە تێکەڵەی هاڕاوەی تووی قانگ و ڕۆنی زەنگ دەرمانێک بە ناوی «نەجار»یان دەگرتەوە. هەمزە برای سوڵتان سەهاک پیری ئایینی یارســـانەکان بە بازرگانی نەجاڕەوە

---

١. *Viola odorata* L.

٢. *Brassica spp.*

٣. *Phaseolus vukgaris* L.

٤. *Lactuca sativa* L.

٥. *Helhanthus annus* L.

٦. *Peganum harmala* L.: ئەسپەند

٧. *Hyoscyamus kurdicus* Bornm.

خەریک بووە.

- مانی پێغەمبەری کەونارای نەتەوەکانی کورد و فارس لە ئێران، شەوێک لە خەویدا فریشتەیەک چەپکێ ڕەشەڕێحانەی[1] پێشکەش دەکا. بەیانی دەستبەجێ دەست بە کێشانەوەی وێنای خەونەکەی دەکات و دەیکا بە نەخشی سەر پەرتووکی ئایینەکەی[2].
- لە پەرتووکی «تقویم الابدان»دا هاتووە کاتی هێرشی ئەسکەندەر بۆ سەر ناوچەی دەڤەری ئێستای خانێ سەربازان بۆ بەهێزکردنی ورەی دەروونیان لە بەرامبەر هێزی داگیرکار تووی ڕوەکی (پێچن)[3]یان دەخوارد.
- مێژوونووسی کۆن گیرشمەنی فەڕەنسی دەڵێت: کوردانی لای ئاتەژگەی شیز لە دەڤەری ئێستای سەقز و بۆکان لە سەردەمی ساسانیەکاندا بۆ هەتوان و دەرمانی نەخۆشی نۆگە هەموو کوگاکانیان ئاخنیبوو لە توێکڵت داری بی.

بابەتەکانی سەرەوە لە پەرتووکی «گیاهان دارویی» نووسینی ئەمیر ئەمینی وەرگیراوە کە هەندێ بابەتی مێژوویی کوردستانی لە توێی سەرچاوەکانی مێژووی کۆنی ئێراندا دەرهێناوە. ئەکرێ چەشنی بەرچاو ڕوونییەک خوێندنەوەی بۆ بکرێت.

- مامۆستا هەژار لە چێشتی مجێوردا باسی لێو دەکا کە لەناو ئێزەدیەکاندا دەستەی مەلەکەتاوس باوڕیان وایە کە کاتێ بابادەم بەهۆی فریوی شەیتانەوە دەرکرایە سەر زەوی، خوا لە شەیتان ڕەنجیا. شەیتان خۆی لە بن چڵێ کیوەر شاردەوە بەڵام دوایی ئاشکرای کرد، جا بۆیە لای ئەمانیش ڕوەکی کیوەر حەرامە.
- ساڵی ١٩٤٥ لە ناوچەی هەورامان لە کونە ئەشکەوتێکدا هومبەیەکی پڕ لە هەرزن[4] دەدۆزرێتەوە کە کۆنترین بەڵگەی سەردەمی ئەشکانیەکانە بە زمانی پاڵەوی. ئەم بەڵگەیە قەواڵەی فرۆشی پارچەیەکی ڕەزە بە پێداویستی سیستەمی ئاودێرانی گۆزەیی. مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ٢٠٠٠ ساڵ پێش ئێستا.
- لای هەموو نەتەوەکانی دنیا زۆر جاران نەتەوە و وڵاتانی دیکە بە هێما و

---

١. *Ocimum basilicum* L.

٢. هەندێ لە مێژوونووسان باس لەوە دەکەن پەرتووکی پیرۆزی ڕێبازی مانی بە ئەرژەنگ ناسراوە.

٣. Ruta graveolens L.

٤. *Panicum miliaceum* L.

نیشانەی بەرهەمی ڕووەکی ئەو وڵاتە دەناسن. بۆ نموونە خورما[1] بۆ عەرەب، پستە[2] بۆ فارس، ئەنبە[3] بۆ هیند و برینج[4] لای گیلەک و مازەنیەکان. سەبارەت بە هێمای ڕووەکی نەتەوەی کورد بە حوکمی ئەوە کورد لە چەندین ژینگەی جیاوازە یان دەسەڵات و وڵاتیکی سەربەخۆی نەبووە دوو هێمای ڕووەکی بۆ هاتووە. کاتێ دەسەڵاتی بەعس هێرشی کردە سەر کەرکووک، سەرەتا بۆ گۆڕانی سیمای سروشتی ناوچەکە بەپێی فەرمانی حکوومەتی ناوەند دەستیان کرد بە بڕینەوەی دارەکان بەتایبەت داری گوێز[5] و توو[6]، جا دوایی نمامی خورمایان چاند. لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان داری توو بە هێمای کورد دەیناسن، هەرچەند کەسانێک باسی داری گوێز و بەڕوویش دەکەن. هەروەها ساڵی ٢٠١٢ شارەوانی ئامەد لە باکووری کوردستان لەپێناو ئاوەدانی شارەکەیان فەرمانی دەرکرد کە زۆرتر گرینگی بدرێ بە چاندنی داری سپیدار[7] چونکە گەلانی دیکەی تورکیە، سروشتی کوردستان لە ڕووی زیادی داری سپیدار دەناسنەوە.

هەموو سەرچاوە مێژوویەکان باس لەوە دەکەن کە وڵاتی کوردەواری هەمیشە خاوەنی دەشت و کێو و کوێستانی پڕ گژ و گیا و دار بووە. بۆیە مرۆڤی کورد هزر و هەناوی لەگەڵ چڵ بە چڵ و بنچک بە بنچکی ڕووەکەکاندا گرێ داوە و پێی ئاسوودە و ئارام بۆتەوە. مرۆڤ هەمیشە خۆشترین شوێنی حەسانەوە و پشوودانی ناو باخ و سەوزەڵانێ و دارستان بووە. شا و شوان ئارەزووی دابین کردنی گۆڕەپان و باخێکی پڕ گوڵ و گیا و درەخت بوونە. ڕەنگە کەمتر ئەم ئارەزووە بۆ هەژار و شوانەکان هاتبێتە دی، بەڵام پاشا و دەسەڵاتداران بەردەوام تێکۆشاون گۆڕەپان و دەوروبەری کۆشکەکانیان بە زۆرترین و جۆراوجۆرترین ڕووەکەکان

١. *Phoenix dactylifera* L.

٢. *Pistacia vera* L.

٣. *Mangifera indica* L.

٤. *Oryza sativa* L.

٥. *Juglans regia* L.

٦. *Morus alba* L.

٧. *Populus alba* L.

برازێننەوە. هەر لە پاشاکان و دەسەڵاتدارانی کۆنەوە تا وەکوو ئێستاش یەکێ لە میراتەکانی کۆشک و قەڵای پاشا و سەرۆکەکان، باخەکانی پڕ لە گوڵ و گیای جوان و ڕەنگاوڕەنگ و داری بەردار و بەرز بووە. ئەگەر سەیری پەرتووکەکانی مێژوونووسانی یۆنانی[1] بکەین کە سەبارەت بە باخە هەڵواسراوەکانی بابل باسیان کردووە، گرینگی و بایەخی باخ و ڕووەکمان بۆ دەر ئەکەوێت هەر لە کۆنەوە تا بگات بە ئێستاش.

باخە هەڵواسراوەکانی بابل[2] بە یەکێک لە حەوت عەجایەبی مێژوویی دنیا تۆمار کراوە. گوایە ساڵی ٦٠٠ پێش زایین بە فەرمانی پاشای بابل بەختولنسەری دووەم بنیات نراوە. کاتێ هەر دوو وڵاتی ماد و بابل بڕیار دەدەن ئاشتی و ئارامی نێوانیان بپارێزن و دەست لە شەڕکردن هەڵبگرن، ئامیتیس نەوەی هوەخشتەر پاشای ماد لەگەڵ بەختولنەسری بابلی هاوسەرگیری دەکەن. ئامیتیس لە وڵاتێکی کوێستانی و پڕ گوڵ و گوڵستان دەگوازرێتەوە بۆ ناو بیابان و وشکانیەکانی بابل لە باشووری عێراقی ئەوڕۆ. مێژوونووسان دەڵێن گوایە ئامیتیس خاتوون لە دووری وڵاتەکەی نەخۆش دەکەوێت و بەختولنەسریش فەرمان دەر ئەکات بۆ چاکبوونەوە و خۆشگوزەرانی ژیانی ئامیتیس کۆشک و باخێکی چەند نهۆمی دروست بکەن کە شاژن پێی دڵخۆش بێت و لە نەخۆشیەکە ڕزگاری بێت. تایبەتمەندی ئەم کۆشکە چەند قاتیە ئەوە بوو کە قات بە قاتی پڕ بووە لە دار و گوڵی جۆراوجۆر و بۆنخۆش، هەروەها جۆگەلەیەک لە ئاوی ڕووباری فوراتیان تا پۆپەی کۆشکەکە بردبوو.

---

١. وەکوو ئێسترابۆ، دیۆدورۆس و سیکۆلۆس

٢. باخە هەڵواسراوەکانی سەمیرامیس لە سەرزەمینی شارستانیەتی بابل لە شوێنی ئەوڕۆی خاکی وڵاتی عێراق کە ئێستاکەش لە یادگەی دیرۆک و مێژوودا چەشنی یەکێ لە عەجایەبی حەوتەوانەی جیهان ئەژمار دەکرێت. پسپۆڕی کەونینەناسی بریتانیایی ئێستێفان داڵی لە زانکۆی ئەکسفۆرد چەندین ساڵ ژیانی خۆی بە دۆزینەوەی شوێنی ئەم باخە تەرخان کرد تا ئەوەیکە دەشتی نەینەوا (مووسڵ) یا هەمان بابلی کۆن وەک دۆزراوەیەکی دیرۆکی بووە شوێنی باخە هەڵواسراوەکانی سەمیرامیس. (سەرچاوە ویکیپیدیای فارسی)

## باسی سێهەم

### پێوەندی نێوان ڕوەکناسی و گیادەرمانی لە کوردستان

کوردستان نموونەی سروشتێکی دەوڵەمەندە بۆ شینبوونی جەماوەرێکی زۆر نەژاد و جۆری ڕوەک. پێویستە پسپۆڕانی ئەم بوارە نیازی توێژینەوە و پشکنینان بخەنە گەڕ و هەموو ڕوەکناس، گیادەرمان، ڕوەکخۆر، دەرمانگەر، هەتوانساز، شاخەوان، تەڕەوان، گیاپزیشک، جووتیار، ژینگەوان و کیمیازانێک هەوڵی خۆیان یەک بخەن و پێناسەی سروشتی کوردەواری باشتر و تۆکمەتر نیشان بدەن و بەرهەمەکانی ڕوەکناسی و خۆراک و پیشەسازی و گیادرمانی هەناردەی بازاڕەکانی ناوخۆ و دەرەوەی بکەن.

خوێنەرانی هێژا ئیستاکە ئیدی لە جیهاندا کەمترین شوێن و وڵاتێک بەرچاو دەکەوێت کە سەرژمێری جەماوەری نەژاد و جۆری ڕوەکی بۆ نەکرابێت. پێناسەکردن و سەرژمێری ڕوەک ئەرکی ڕوەکناسانانە. ئەگەر سروشتی وڵاتێک بۆ ناسنامە و وێنەی ڕوەکەکان خاوەنی پەرتووک و پەڕگەیەکی تایبەتی بێت، لە ئاست پاراستنی سروشت و ژینگە ئەوە نیشاندەری پێگەیشتن و پێزانینی دانیشتوانی ئەو وڵاتەیە.

ئەگەر سەیری گەشتنامە و بیرەوەری ئەو گەشتیارانە بکەین وا ئەوسا و ئیستا هاتوونەتە کوردستان، ئەو ڕاستیەمان بۆ دەرئەکەوێت کە خەڵکی حەکیم و مامۆستا

و شاعێر و خوێندکاری ئێمە گرینگایەتیان داوە بە سروشتەکەیان بەڵام لە ئاستێکی شـــیاودا نەبووە. لە لایەکی ترەوە ئەگەر لە ڕابردووی کۆندا زەمینەی نووســـین و خوێنـدنەوە دژوارتر بووبێـت خۆ ئیســـتە بـارودۆخ گۆڕاوە و ئێمەی توێژەر و خوێندکار دەتوانین بچینەوە ناودڵی سـروشـت و لادێیەکان و ئەزموونی پێشـینیان و حەکیمان و مامۆســـتایان گیاناس و گیادەرمان بنووســـینەوە و لە شـــێوازی سەرزارەکی بیکەین بە پەرتووک و نووسراوە.

لەو ڕۆژەوە چارەی ئێمەی کورد وا لێدرا لە تەنگەڵانی کۆســـاران و پـانـایی پێدەشـــتانی ناوچەی ناوچۆمان (مێزۆپۆتامیا) بژین و دەســـپێکی ژیانمان لە چیای مانشـــتی (مادنشـــت) ئیلامەوە ســـەر هەڵبدا، چارەنووســـێکی لێڵ نەبوو بەڵکوو بە قازانجی خەڵک و خێڵ بوو. ئەگەر هەموو کوردســـتان یەکدەســـت دەشـــت و بیابان بوایە ئەم هەموو ڕەنگاوڕەنگی و فرەفەرهەنگییە لە کوردســـتاندا نەدەبوو. خەڵکی هەر ناوچە و هۆز و زاراوەیەک دەیان ئەزموون و دەســـکەوتی مێژوویی تایبەت بە خۆیان هەیە و هەموو مۆرک و واژۆی نەتەوایەتی کوردی لە ســـەرە. هەمیشـــە مرۆڤی کورد لە گەنجی تا سەرەوپیری ئەزموونەکانی ژیان و گوزەرانی بە شێوەی یادەوەری و سـەرزارەکی کۆ کردۆتەوە. لە بواری سـروشـتیشـدا هەمیشـە پیاوان و ژنـانی کوردەواری نـاوی ڕوەکەکـانیـان بە بۆنەی ئـامـانجەکـانی گیـادەرمـانی، گوڵی ئینجانە، گیابرژۆکە، گیای ناو چێشـت، هەروەها تفاق و گزرەی ئاژەڵ پاراسـتووە و گرینگیان پێ داوە و سینە بە سینە گواستوویانەتەوە.

وێڕای لاوازی و نەبوونی خوێندن و نووسـینی کوردی لای پێشـینیان هەمیشـە تۆمارکردن و هەڵگرتنی ناو و ئەزموون و دەســـکەوتەکانی ڕوەک کارێکی پیرۆز و گرینگ بووە و ئێســـتاکە بووەتە هۆی ئەوە زمـانی کوردی دەوڵەمەندتر بێت بە وشـــەدانی ڕوەکناســـی و گیادەرمانییەوە. ئەم باســـە زۆرتر لای خەڵکی گوند و هەوارنشین بەرچاوتر دیارە تا وەکوو شارەکان. جا ئەگەر کەسێک ئەوڕۆکە بە نیاز بێت ســـەردەمیانە ئەزموونی کۆنی گیاناســـی و گیادەرمانی بخاتە پاڵ زانســـتی ســـەردەم، دەبێ قۆڵی لێ هەڵبماڵێت و ڕوو بکاتە دیوەخانی تۆزاوی و ڕەشـــماڵی لادێ و هەوارەکان. شـــەوان و ڕۆژان لای پیر و زورهانی شـــوانکارە و ئاژەڵدار و جوتیار و باخدار دابنیشێت و چەشنی شاگردێکی چوست و چالاک وانە وەربگرێت

و بنووسێت و تۆمار بکات و فێر ببێت.

خوێنـــدەوارینە! وەرن بـــا ڕێبواری ئەم ڕێبـــازە پیرۆز و پڕ خزمەتە بین و خزمەتکاریی شیاو بەرامبەر بە نیشتمان و بەرەکانی داهاتوو بسەلمێنین. ئەگەر ئێمە دەســـت هەڵگرین لە دوورەپەرێزی و گۆشــــەگیری کاری ڕۆژانەمان و هەندێک لە تێکۆشـانی ژیانمان ڕاسـتیانە بخەینە بواری خزمەت بە نیشـتمان و بچینە بواری ئەم رووبـارە، ئەوە بە پریســـکە و کۆڵەبـارێکی بەنرخ و پڕ ئەزموون و ئـامـادە بۆ پوختەکردنی زانســـتی داهاتوو، خێرا لەم پردە دەپەڕینەوە. خۆشــــەویســـتینە ئەوە بزانین کە هەموو ئەزموونێکی پێشـینیان نەپوخت و نازانسـتی نییە، بەڵکوو دەتوانین هەمووی کۆ بکەینەوە و بە پێوەری زانســـــت و زانکۆ و تاقیگەی ئەورۆ دابێژین و بەرهەمێکی خاوێن و نرخدار پێشـــکەشــی دایکی نیشــتمان بکەین. بەڕاســتی پەند و پەیڤی پیرەمێردی شــاعیر لێرە خۆی دەر ئەخات و پەیامی خۆی دەگەیێنێت: «نامرن ئەوانەی وا لە دڵی میللەتا ئەژین».

کوردســتان نیشــتمانێکە شـیاوە دانیشــتوانی بە چاوی پیرۆزترەوە لێی بڕوانن. مێژوو نیشـانی داوە ئەم نیشـتمانە مەڵبەندی زانیاری و خەبات و بووژانەوەی ژیان مرۆڤـایەتی بووە. کۆنترین بەڵگەی کشـــتوکـاڵی ســــەبارەت بە چـانـدنی گەنم لە کوردســتان دۆزراوەتەوە. دەڵێن چیای جوودی شـوێنی گیرسـانەوەی کەشـتیەکەی پێغەمبەر نوحە. ئەمانە و گەلێک مێژووی پرشـــنگدار هانمان ئەدات نیشـــتمانەکە و بەتایبەت ســروشــت و ژینگەکەمان خۆش بوێت و بەرنامە و بەرهەمی خزمەتکارانی ئەوسا و ئیستای بواری سروشت و ژینگە و کشتوکاڵ زۆرتر بناسین.

هەموو شـــوێن و شــــاخێکی کوردســــتان ئاوەدانە و لە هەر گوند و هەوار و شــــارێکیدا دەیان و هەزاران جوتیار و باخەوانی بەئەزموون و کەســـی ئاشـــنا بە ڕوەکی ســروشــت و حەکیمی گیادەرمانیان تێدا بووە و ئێســتاکەش نموونەیان هەیە. هەوڵی دەوێت و هێمنی بەردەوامبوون لە ســـەر ڕێپێوان و بڕینی ئەم ڕێگە پیرۆزە. ئەگەر ئێســـتاکە خۆمانیش ئەو بەشــەی کە لە کاری ڕوەکناســی کوردســـتان ماوە، نەیکەین وەک پەنجا ســـاڵی ڕابردوو کەســـانێک دێن و ئەم کارە بە ناوی خۆیانەوە ئەنجام دەدەن. جا زەرەرمەندی ئێمە لەوەدایە پێناسـەی ڕوەکی کوردسـتان بە ناوی کەســــانێکی بیانیەوە تۆمار دەکرێت و گەلێک ناوی ڕەســــەنی کوردی ڕوەک لە

یادەوەری زمانی کوردی دەسڕێتەوە، هەروەها کاری کۆکردنەوە و پێناسە کردنی ئەزموون و دەسکەوتی دەرمانی و پزیشکی نەتەوەیی بە ناوی «پزیشکی خۆماڵی کوردەواری» تێکۆشانی تێروتەسەلی خەڵکی خۆمانی پێویستە چونکە ڕێژەی حەکیم و مامۆستای ئەم جۆرە پزیشکیە ئەوڕۆکە زۆر کەم بۆتەوە و ئەگەر فریای خۆمان نەکەوین بەرەو لەناوچوون دەچێت.

ئەڕۆکە هەوڵی گەلانی دیکە بۆ ناساندنی پزیشکی خۆماڵییان لە ئێمەی کورد گەلێک زۆرترە. کاتێ شێوازی «پزیشکی دەرزیاژن» لە وڵاتی چین باسی لێوە دەکرا وڵاتانی دیکە چەشنێ شێوازێکی بەڕبەرپەت و بێبنەما هەڵوێستیان دەگرت، بەڵام چینیەکان دڵسارد نەبوونەوە و بۆ هەموو دنیا هەناردەیان کرد و ئێستاکە تەنانەت لە کوردستانی خۆمانیش کەسانێک بۆ فێربوونی ئەم شێوازە پزیشکیە ڕوو لە چین دەکەن و پاشان نۆرینگە و دەرمانگەی دەرزیاژن دائەمەزرێنن.

نموونەیەکی دیکە بۆخۆم دوو ساڵ پێش حەکیم کاک بورهان حوسەینی گێڕایەوە کە جارێک بۆ باسی گیادەرمانی بانگێشت دەکرێن بۆ دانشتنێکی کۆمەڵەی گیادەرمانانی ئێران لە شاری تاران. هێشتا ناکۆکی نێوان وەزارەتی تەندروستی و کۆمەڵەی گیادەرمانان بەتەواوی کۆتایی پێ نەهاتبوو و لقی زانکۆکانی پزیشکی سروشتی و خۆماڵی لە تاران نەکرابوونەوە. قسە لەسەر پزیشکی خۆماڵی دەکرێت و کاک بورهانیش نموونەی ناوک کەوتن و ناوک گرتنەوە دەکات کە تایبەتە بە ئەزموونی دەڤەری کوردستان. دەیگوت کاتێ ئەم باسەم کرد هەموو ئامادەبووان سەریان سووڕ ما و پێکەنین، بەڵام پاش چەند ساڵی دیکە کە زانکۆی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی[1] لە تاران دامەزرا هەر ئەم کۆمەڵەیە یارمەتی داڕشتنی وانەکان دەدەن و وانەی ناوک گرتنەوە «نافگیری»[2] دەخەنە ڕیزی خوێندنی ئەم زانکۆیە. ئەم بابەتە دواتر کە بەدوداچوونی بۆ دەکرێ، بە ئەزموونی ناوچەی لەک و لوڕستان تۆمار کرابوو.

کۆڵەکەیەکی سەرەکی لە بابەتی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی کوردستان، ڕوەکناسی و گیادەرمانییە. کاتێ باس لە گیادەرمان دەکرێ ناتوانین وانە و ئەزموون

---

[1]. دانشگاه طب سنتی تهران

[2]. بە واتای ناوکگرتنەوە

و توێژینەوەی گیاناسی جیا بکەینەوە لە گیادەرمانی. ئەوساکە شوان و جوتیار و باخەوان و پیاوان و ژنانی کوێستانچی بۆ دۆزینەوە و کۆکردنەوەی ڕوەکە دەرمانیەکان هاوکار و یارمەتیدەری حەکیمان و گیادەرمانان بوون. فەرهەنگ و مێژووی ئێمە ناوی گەلێک بنەماڵە و کەسایەتی و هۆزی حەکیم و پزیشکی کۆنی تێدایە کە ناوداریان تا دەرەوەی سنوورەکانی کوردستانیش ڕۆیشتووە، وەکوو سمایل حەکیمی سلێڤانی دهۆکی، شێخانی هەورامان، سەییدەکانی سەبەتلووی بانە، حەکیمانی گوندی کۆییلەی قەندیل و هتد. یان ئەگەر سەیری پەرتووکی مێژووی ناودارانی کورد[1] بکەین ناوی کۆمەڵێک گیادەرمان و حەکیمی ناوچەی کوردستانی هێناوە و باسیانی کردووە، بەڵام بەرهەمی زۆر کەم لەم زانایانە بەجێ ماوە و بە چیرۆکی سووتان، فەوتان، پردووکان و تاڵان بەرهەمەکانیان نەگەیشتوونەتە کتێبخانەی کوردی.

تەنیا بۆ نموونە یەکەم کەس کە لە مێژووی شارستانیەتی ئیسلامدا دەستی دایە کاری گیادەرمانی و گیاناسی «ابوحنیفە دینوری» بوو کە لە کۆی پێنج بەرگی بەرهەمی «کتاب النبات»[2] تەنیا یەک بەرگی ئێستا لە کتێبخانەکانە و ماوەتەوە. ڕەنگە دەیان بەرهەمی دیکەی حەکیمان و دەرمانگەرانی کورد چیرۆکی هاوشێوەیان بێ یان هێشتا لەناو نەچوونە بەڵام لە سووچی بەرچاو تەنگی و پردووکانی میراتبەرانیان ڕۆژبەڕۆژ چارەنووسی ئەو بەرهەمانە دەکەوێتە مەترسی.

یەکێ لە حەکیمانی سەردەمی دەسەڵاتداری عوسمانی بە ناوی «سمایل حەکیم سلێڤانی دهۆکی» نزیکەی ١٥٠ ساڵ پێش پەرتووکێکی نووسیوە کە نوسخەی ئەو نووسراوەیە ئێستاکە لای یەکێ لە نەوەزادەکانیە بە ناوی دکتۆر سالم حەکیم. خۆشبەختانە ٥ ساڵ پێش بە ڕێکەوت هەواڵی ئەم پەرتووکە بە حەکیم کاک بورهان حوسەینی دەگات. پاش پێوەندی و دیداری نێوانیان، دکتۆر سالم بە ئامادەبوونی یەکێ لە بەرپرسە دڵسۆزەکانی وزارەتی تەندروستی هەرێمی کوردستان بە ناوی

---

١. نووسینی بابە شێخ مەردۆخ ڕۆحانی "شیوا" وەرگێڕانی: ماجد مەردۆخ ڕۆحانی، لە کتێبەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠١١ ز. چاپی یەکەم

٢. نوسخەیەک لە کتاب النبات لە کتێبخانەی ناوەندی گیادەرمانی شەفا لە شاری سنە هەیە و هێشتا لە سەر زمانی عەرەبی ماوەتەوە و کەس وەرینەگێڕاوەتەوە سەر فارسی یا کوردی. نووسەر

«کاک جەماڵ مەولوود» ئەرکی ڕاستکردنەوە، ڕێکخستن و وەرگێڕان لە فارسیەوە بۆ کوردی سـۆرانی بە کاک بورهان دەسـپێردرێت. چونکە لە سـەر نوسـخە دەستنووسەکە سەرناوی پەرتووکەکە نەهاتووە، بە پێشنیاری وەرگێڕان و قەبووڵ کردنی لە لایەن ماڵباتی سـمایل حەکیم، ناوی «گیابەند» لە سـەر ئەم کتێبە دانرا. ئێسـتاکە خۆشـبەختانە گیابەند خەریکە وەرگێڕانەکەی تەواو دەبێت و خوا یار بێت بۆ ساڵی داهاتوو دێتە بازاڕەوە.

## ڕێکخستنی ڕوەکناسی بۆ کاری گیادەرمانی

لە خوارەوە هەوڵ دەدەین زنجیرەی سـەربەخۆی ڕوەکناسـی دەبەسـتینەوە بە بواری گیادەرمانی:

- کۆکردنەوەی نموونەی وشـککراو و وێنەی سـەرجەم جۆری ڕوەکەکان و هەڵگرتنیان بە شیوازێکی زانستیانە لە هێرباریۆمدا
- ئامادەکردنی بەرچەسـپی (لەیبڵی) نموونە کۆکراوەکە. ئەم بەرچەسـپە ئەم شـتانەی لەسـەر بنووسـرێت: ناوی گیاکە بە کوردی و یا بە زمانەکانی دیکەیش، ناوی زانسـتی، ناوی بنەماڵە، تەمەنی ڕوەک (وەرزی، یەک، دوو یا چەند سـاڵان)، کاتی سـەوزبوون و پشـکوتنی گوڵ، شـوێنی کۆکردنەوە لەگەڵ بەرزایی لە ئاسـتی دەریای ئەو شـوێنە، بەرواری کۆکردنەوە، تایبەتمەندی ئاو و هەوا و نەختی و بەپیتبوونی خاکی شوێنەکە، ڕێژەی سەوزبوونی جۆری ڕوەکەکە لەو شوێنە، ناوی کەسێ کە کۆی کردۆتەوە و هەروەها ناوە کوردیەکەی لە کێ بیستووە.
- کۆکردنەوەی تۆو و سەلک و پیوازی وشککراوی نموونەکان
- گەڕان و پشـکنین بۆ ڕێژەی چڕی جۆری ڕوەکەکە. ئەگەر هاتوو ڕێژەی شینبوونی زۆر لە خوار بوو ئەوە هەوڵی دووبارە چاندنەوە و سەوز کردنی بدرێت هەتا لەناو نەچێ
- دەسـنیشـانکردنی سـوودی ڕوەک لە سـەر کشـتوکاڵی، خۆراکی، دەرمانی، پیشەسازی، گەشتیاری، جوانی و ژەهراوی
- نووسـینەوەی هەموو سـوودە خۆراکی و دەرمانیەکانی ڕوەک لە بەرهەمی

ئەزموونەکانی پێشینیان و ئەنجامی توێژینەوە تازەکان

- دەستنیشانکردنی ڕێژەی دەرمانی و خۆراکی ڕوەک بۆ یەک ژەمی خواردن
- توێژینەوە بۆ کەمکردنەوەی مادە ژەهراوی و زیانبەخشــەکان لەپاڵ مادەی دەرمانی ڕوەکەکان[1]
- توێژینەوە لەســەر ڕێژەی مادە و ســوودی دەرمانی جۆری ڕوەکەکان لە ژینگەی جیاوازدا وەکوو ژینگەی کشتوکاڵی و خۆڕسک
- دەسنیشانکردنی وەرز و کاتی کۆکردنەوەی نموونەی ڕوەکە دەرمانیەکان
- توێژینەوە و پشــکنین بۆ زیـادکردنی ســوودی خۆراکی و جوانی و دەرمانیەکانی ڕوەک
- گەڕان و پشــکنین بۆ دەرهێنان و دەرکێشــانی مادەی کاریگەر و زۆرینە و سەرەکی ناو ڕوەک
- کردنەوە و دامەزرانـدنی کـارگە و تـاقیگە بۆ بەدەســـت هێنـانی بەرهەمی خۆراکی یان مادەی دەرمانی ڕوەک
- شـــیوازی هەڵگرتنی ڕوەک بۆ خۆراک یـان دەرمـان وەکوو هەڵگرتن لە شـــووشـــە، قاقەز، گوێنی بەن، کوتاڵی پەشـــمی و خوری، گۆزە و هومبەی گڵینە، پلاستیکی ڕەنگ ئاوی یا ڕەنگ ڕەش، ناو سەلاجە، ژێرزەمین، هەوای ئازاد، یا هتد
- دەسنیشانکردنی ئەندامی دەرمانی ڕوەک وەک گوڵ، گەڵا، لاسک، توو، مێوە، چرۆ، ڕەگ و ڕیشـە، چەکەرەی توو، سـەرچڵ، توێکڵ، شـیلە، ڕۆن، ئاوتک، جەوی و تووڵ
- دەســـنیشـــانکردنی شـــێوازی گرتنەوەی دەرمان وەکوو هاڕاوە، ماجووم، گیراوە، شـــەربەت، کوڵاندن، پیشـــاندن، برژاندن، ســـووتاندن، دەمکێشـــان، دووکەڵ، هەویربەســـتن، نیمەنمەک، هەنوون، بەڕۆنەوە، بەئاوەوە، بەشـــەکر و هەنگوینەوە، بەساردی، بەگەرمی و هتد
- کـاتی بەکـارهێنـان وەکوو بەیـانیـان، نیوەڕۆ، شـــەو، پێش خەوتن، پێش

---

[1]. بۆ نموونە کارگەی گیادەرمانی شەفا بۆ گرتنی ئاوتکی (عەرەق) هەڵاڵەسوورە (شقایق) پیگمانە ژەهراویەکانیان لابردووە و ئاوتکی دەرمانیان بە دەست هێناوە. نووسەر

نانخواردن، لە نێوان خواردندا و پاش نانخواردن

- ڕێژەی خواردن وەکوو یەک کەوچک چا، یەک کەوچک چێشـــت، یەک کەوچک دۆ، یەک کەوچک مەرەبا، یەک پەرداخ، یەک پیاڵە چا، یەک کاسەی چێشت، یەک نۆک، یەک نیسک، یەک گوێز، یەک لاگوێل، یەک مست، یەک قوم، یەک پاروو، یەک بانەنینۆک، و هتد
- ژەمی خواردن وەکوو ڕۆژێک چەند جار، هەفتەی چەند جار، مانگێ چەند جار و تەنانەت ساڵی چەند جار.

## پێناسە و پێگەی گیادەرمانی

گیادەرمانی شێوازێکی دەرمانی سەردەمی کۆن و نوێی یاساداره کە مرۆڤ بۆ بەرگری و چارەســەری نەخۆشــیەکان کەڵکی لێ وەردەگرێ. یەکێک لە بنەماکانی پزیشــکی گیادەرمانی ئەوەیە کە گرینگی دەدرێت بە پێوەندی و نزیکایەتی نێوان مرۆڤ و ڕوەک بۆ چارەســەری نەخۆشـیەکان. واتا ئەو ڕوەکانە کە لە دەوروبەری ئێمەدا ڕواون زۆرترین ئەگەری دەرمان و چارەسەری نەخۆشیەکانی تێدایە بۆ ئێمە. چونکە هەر بەهۆی یەک یـان کۆمەڵە هۆکـارێکی نـاو ژینگەی دەوروبەرمـانەوە هۆکاری نەخۆشی چووەتە ناو جەستە و دەروونی نەخۆشەوە. کەواتە نەخۆشییەک کە لە ژینگەی کوردســتان تووشــی من دەبێت دەرمان و چارەســەرەکەیشــی لە ژینگەی و خاکی کوردستان دەست دەکەوێت.

موحەممەد زەکریای ڕازی (٨٣٠ زایینی) حەکیم و فەیلەســووفی ئێرانی دەڵێت: دەرمان یەکەم بە خۆراکی پەتی، دواتر بە دەرمانی خۆراکی، پاشــان بە دەرمانی پەتی، و هاتوو چارەســەر نەکرا بە نەشتەرگەری[١]. هەر لە سـەر ئەم قسـەی حەکیم ڕازی، ئەبووعەلی ســینا (١٠٣٧ زایینی) باس لەوە دەکات کە: هەر کەســێک بە ڕوەکەکانی ناوچەی زێدی خۆی باشتر چارەســەر دەبێتەوە. یان شـاعێری گەورەی ئێرانی نزامی گەنجەوی (١٢٣٣ زایینی) دەڵێت: لە ســەر هەموو گەڵایەکی ڕوەک

١. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە سەیری بابەتی "تایبەتمەندی دووهەمی پزیشکی خۆماڵی، ڕیزبەندی خۆراک، دەرمان و ژەهر" بکە لە بابەتی سێهەمی ئەم پەرتووکە

دەرمانی نەخۆشیەک نووسراوە.

ئەورۆکە بە کەڵک وەرگرتن لە پێشکەوتنەکانی بواری پزیشکی و تەندروستی، پزیشکانی گیادەرمان دەتوانن سوود لە بوارەکانی شێوازی پزیشکی سەردەم وەربگرن و بواری گیادەرمانی مسۆگەرتر و وردبینتر بکەن. بۆ نموونە پزیشکی دەرمانگەر دەتوانێت بە پشت بەستن بە تاقیکردنەوەی خوێن، میز، تیشکی ئیکس[1] و پاتۆلۆژی[2] هۆکاری نەخۆشیەکە دەستنیشان بکات و پاش لێکدانەوە و روونبوونەوەی هۆکاری نەخۆشیەکە، بە یارمەتی لێزانین و ئاگاداربوون لە تایبەتمەندیەکانی دەرمانی و ڕێژەی دەرمانی ناو ڕوەکەکان، ڕەچەتە و دەرمانی ڕوەکی بۆ چاکبوونەوەی نەخۆشەکە بنووسێت و ئامۆژگاری نەخۆش بکات بەکاریان بهێنێت. چونکە گیادەرمانیش هاوشێوەی شێوازی پزیشکی نوێ، بۆ لەناوبردنی نەخۆشی لەگەڵ نیشانەکانی نەخۆشیەکە بەرەنگار دەبێتەوە و کاری لە سەر دەکا.

خاڵێکی گرینگ لە ئاستی گشتگیری گیادەرمانی ئەوەیە هەندێک لە دەرمانگەرەکان وا هەست دەکەن گیادەرمانی دەتوانێت وڵامدەری هەموو کێشە و نەخۆشی مرۆڤەکان بێت. کاتێ ئاستی تەشەنەکردنی نەخۆشی زۆر دەبێت واتا بەرەو مەرگی خانە و شانەی بەشێکی جەستە دەڕوات، گیادەرمانی تەنیا دەتوانێت بۆ ئارامبەخشی و ئەسرەوتنی ژانی ئەو بەشە ڕەچەتەی ڕوەکی دابنێت. بۆ نموونە کەسێ کە ئاپاندیسی[3] دەتەقێت، یان کەسێک ئێسکێکی ورد ورد دەشکێت، لێرە دەرمان کارساز نییە بەڵکوو نەشتەرگەری دەتوانێت نەخۆش ڕزگار بکات.

دەرمانگەری پزیشکیی گیادەرمانی پێویستە هەوڵ بدات پێوەندی نێوان جەستە و دەروونی مرۆڤ لەگەڵ دنیای ناوەرۆک و ڕواڵەتی ڕوەکدا ڕێک بخات. واتا مرۆڤ هان بدات دەرمانی نەخۆشیەکانی لە پێکهاتە و مەوادی دەرمانی ناو ڕوەک بدۆزێتەوە. ئەگەر گشتیتر سەیری بابەتی پزیشکی سروشتی بکەین، گیادەرمانی بەشێکی گەورەیە لە پزیشکی خۆماڵی و سروشتی و پەیوەستە بە ئەنجام و

---

١. X-Rays = Roentgen Rays

٢. Pathology

٣. Appendix: زائدە دودیە

دەستەکەوتەکانی دانیشتوانی شوێن یا وڵاتێک بەرامبەر بە سروشت و ژینگە و ڕووەکەکانی دەوروبەریان. واتا بەشی گیادەرمانی بۆ هەر وڵات و نەتەوەیەک دەتوانێت لەگەڵ وڵات و نەتەوەکانی دیکە جیاواز بێت. چونکە گیادەرمانی پێویستی بە بەرهەمی گوڵ و گیای سروشتی وڵات و سەرزەوی ناو نەتەوەکەی خۆی هەیە. بۆ نموونە گیادەرمانی لە کوردستان دەتوانێت بە زۆری لە سەر بەرهەمەکانی تایبەتی سروشتی خۆی ڕەچەتە دەر بکات وەکوو بەرهەمی بەڕوو[1]، بنێشتەتاڵ[2]،

---

١. بەرهەمی بەڕوودار (Quercus brantii Lindl.)

٢. بەرهەمی داری وەن: ساڵێ نە ساڵێ وەرزی پاش بارانی بەهار پیشەوەرانی بنێشتەتاڵ ڕوو لە دارستانەکانی وەن دەکەن و قەدی دارەکە بە ترێشتە یا گازنەی تایبەت بریندار دەکەن بە شێوەیەک کە برینەکە لە توێکڵی دارەکە تێ پەڕێت و بەشی ڕووکاری ئاوەخۆرەکە بریندار بکات. ئینجا بە گڵی گیراوە کوچەڵەی (کۆجیلە) بۆ دروست دەکەن. ئەم کوچەڵەیە هاوشێوەی لاگویلی دەستە. پاش چەند ڕۆژ شیلەی دارەکە دێتە ناو کوچەڵەکە و خۆی دەگرێت و هێندێ ڕەق دەبێت. ئەڵبەت بە شێوەی سروشتی و خۆڕسک لە لاسک و لقی دارەوەن بنێشت ئەدەڵێتە دەرەوە و دڵۆپ دڵۆپ بە دارەکەوە خۆی دەگرێت. ئەم بەرهەمە سەرەتا ڕوون و ئاوییە پاشان کە ڕەق بوو چەشنی جیوەی هەنگەوین سپی و زەرد دەبێت. دارەوەن بەرهەمێ تری هەیە کە بنێشتی کەو یا جاچکەکەوی پێ دەڵێن. ئەم جۆرە زۆر تاڵە و ڕەنگی سەوز و یان سەوزی مەیلەو شینی هەیە و خەڵک بەتایبەت ڕاوچییەکان دەگێڕنەوە کە کەو کاتێ لاقی یا شوێنێکی دەشکێ ئەم بنێشتە شینەی لێ ئەدا تا بگیرسێتەوە. هەندێ لە پەلەوەرەکانی دیکە وەکوو قوڵتە کاتێ هێلانە ساز دەکەن بنێشتەتاڵ و بنێشتەشینە تێکەڵی گڵ و موو دەکەن و هێلانە گڵینەکەی خۆیان بە شاخ و بەردەوە دروست دەکەن کە هێلانەکە هاوچەشنی خشتە و ئاسن پتەو و نەشکێن دەبێ.

مازوو[١]، جەفت[٢]، جیوەی کەتیرا[٣]، قەزوان[٤]، کوشـــەندەر[٥]، هەرمێ کرووزی[٦] و هتد. ئەم بەرهەمانە تایبەتی ســروشــتی کوردســتانن یا ئەوەیکە کەمتر لە ســروشـتی نەتەوەکانی دیکە بەرچاو دەکەون. یا نموونەیەکی تر لە گیادەرمانی هیندییەکان کە مۆز و ئەنبە و بایەمی هێندی[٧] و تەمری هێندی[٨] دەتوانێت ڕەچەتەکانی گیادەرمانی هێندییەکان پڕ بکاتەوە.

---

١. بەرهەمی مازوودار (Quercus infectoria Oliv. Subsp. boissieri (Reut.) O. Schwarz.).

٢. بەشی کڵاوئاسای بەری بەڕوو، مازوو و بەڕوە بزنەی دار ویۆڵ (Quercus libani Oliv. = Q. carduchorum C. Koch.). ئەم دارە تەنیا لە دارستانەکانی بانە، سەردەشت و مەریوان و بەشی هاوسنوور لەگەڵ باشووری کوردستان و هەروەها لە باکووری کوردستان لای ئامێدی و هەکاری و ناوچەی شەمدینان شین دەبێت.

٣. لە وەرزی بەهار و هاویندا ئەگەر لاسک و ڕەگی بنچکی هەنگەون (.Astragalus spp) بریندا بکرێت یان ببڕدرێتەوە شیلەکەی دێتە دەرەوە و پاش ئەوەی کە دەکەوێتە بەر تین و هەوای سروشتەوە ڕەق دەبێت و چەشنی ماکێکی خۆگرتوو بە قەدی بنچکەکەوە دەمێنێتەوە

٤. بەرهەمی داری وەن کە ئەم دارە لە کوردستان چەند جۆری هەیە: ١. جۆری وەنی کوردی کە بە فارسی پێی دەڵێن (کلخنک و پستە وحشی کردی) و ناوی زانستیەکەی: *Pistacia atlantica* Desf. subsp. *kurdica* (Zohary.) Rech.، ٢. جۆری بنەوەشیلە کە بە کولنگ، کولینگ و کولەنگیش دەناسرێت و بە فارسی پێی دەڵێن (چاتلانقوش) و ناوی زانستیەکەی: *P. atlantica* Desf. subsp. *mutica* (Fisch. & C. A. Mey.) Rech. f. = *P. mutica* Fisch. & C. A. Mey.، ٣. جۆری نەرمەوەن کە بە وەنەمشک، نەرمە کولینگ، کینجووک، وەنەوش، وەناوشەک، کینجک و وەنەمشکی دەناسرێت و بە فارسی پێی دەڵێن (خنجک و خینجوک) و ناوی زانستیەکەی: *P. khinjuk* Stocks.

٥. *Echinophora platyloba* DC.

٦. ژێرجۆرێک لە جۆری هەرمێ کێویلەیە (*Pyrus syriaca* Boiss.) کە لە ناوچەی سەردەشت و قەڵادزێ دەبینرێت. ئەم هەرمێیە چەند ساڵێکە فەرمانگەی کشتوکاڵی بانە و سەردەشت کاریان لە سەری کردووە و ئەمامگەکانیش بە شێوەی بەرچاو نەمامیان کردووە و بڵاویان کردووەتەوە بە هەموو کوردستان و ئێراندا. شێوەی ئەم هەرمێیە ئەندازەیەکی مامناوەندی بەرەو گەورەی هەیە و ئاودار و شیرین و تام و بۆندارە. ڕەنگی سەوزی تۆخە و شێوەیەکی خڕی هەیە.

٧. *Anacardium occidentale* L.

٨. *Tamarindus indica* L.

لە پزیشکی سروشتیدا[1] سەرجەم دەرمانەکانی مرۆڤ لە پێکهاتە سروشتیەکانی ناو ڕووەک، حەیوان و کانزاکان دەست دەکەون، بەڵام هەمیشە ڕێژەی بەکارهێنانی پێکهاتەی ڕووەکی لە پێکهاتەی حەیوانی و کانزایی زۆرترە. نموونەی گرینگایەتی بەشی دەرمانی ڕووەکی لە پەرووکی (قانون فی طب) ئەبووعەلی سینا دەردەکەوێت.

لە پەرتووکی دووهەمدا ئەبووعەلی سینا دەرمانە تاکەکانی[2] ڕووەکی، حەیوانی و کانزایی هێناوە. تەنیا ٨٠٠ بابەتی دەرمانی ڕووەکی (ساکار و ناتێکەڵ) بە ڕوونکردنەوەی ڕووەک و تایبەتمەندیەکانیەوە نووسیوە. هەروەها لە پەرتووکی پێنجەم نزیکەی ٦٥٠ دەرمانی تێکەڵ[3] یا وەک پزیشکانی کۆن دەڵێن دەرمانەکانی قەرابادین[4]، هێناوە کە بریتین لە حەب و شەربەت و ماجووم و دژەژەهرەکان. بە شێوەیەکی وردتر ئەبووعەلی سینا بۆ دەرمانی ڕووەکی زیاتر لە ٢٦٠ جۆر ڕووەک لە ناو ٩٠ بنەماڵەی ڕووەکەکاندا بۆ دەرمانە تاک و تێکەڵەکان سوودی وەرگرتووە.

ئەورۆکە بنکەکانی گیادەرمانی لە سەر پێناسەیەک ڕێک کەوتوون کە مادەی دەرمانی ناو ڕووەکە دەرمانیەکان پێویستە چە ڕێژەیەک بێت کە ئەو ڕووەکە بە ماکی دەرمانی بناسێن. ڕووەکی دەرمانی بریتیە لەو ڕووەکانە کە یەک یا چەند ئەندامیان

---

١. هەمان لقی پزیشکی خۆماڵی کە بە پزیشکی نەتەوەیی، کۆن، مللی (طبیعی، سنتی و Traditional) دەناسرێت

٢. دەرمانی تاک (ادویە مفردە) بریتیە لە دەرمانێک کە پێک هاتووە لە یەک بەرهەمی ڕووەکی یا حەیوانی و کانزایی. وەکوو دەنکی هەنار، توێکڵ بی، تووی شادان، ناوکە بەهێ، ڕەگی مێکووک، گوڵی بەیبوون، شیری بزن، بنێشتە تاڵ، جیوەی گوێنی، خوێنی کەروێشک، هێلکەی چۆلەکە، خوری مەڕ، مێشکی ئێسکی مەڕ، خۆراکی شامەنگ، هەنگوین، ژەنگی ئاسن، مۆمیا، زەفت، قیر و هتد

٣. دەرمانی تێکەڵ (ادویە مرکبە) بریتیە لە دەرمانێکی گیراوە کە پێک هاتووە لە زیاتر لە یەک دەرمانی ڕووەکی، حەیوانی و کانزایی. ئەم دەرمانە دەتوانێت تێکەڵەی ڕووەکی و حەیوانی و کانزایی بێت یا ڕووەکی و حەیوانی یا بە پێچەوانە. وەکوو خورما و دوو، نیمەنمەک، بەز و بنێشت، تریاکی فارووق، سرکەنگوین (سکنجبین)، گوڵەنگوین (کلنکبین)، چواردەرمانە (بە فارسی پێی دەڵێن چهارتخم کە پێک هاتووە لە تووی چوار گیای ڕێحانە، ڕکێشە، وەردینە و ناوکە بەهێ)

٤. ئەگەر سەیری پێکهاتەی دەرمانی تاک و تێکەڵ بکەین بۆمان دەرئەکەوێت کە هەموو کەس ئەتوانێت دەرمانی تاک بەکار بهێنێت بەڵام بۆ دەرمانی تێکەڵ پێویستی بە لێزانی و هونەری گرتنەوەی دوو یا چەند دەرمانە کە یەک دەرمانی دیاریکراو بە دەست بێنێت. کاری دەرمانسازی و دەرمانگرتنەوە لە پزیشکی خۆماڵی و کۆنی ئێرانیدا پێیان گوتووە (قرابادین: قەرابادین)

خاوەنی مادەی ســـوودبەخشـــی دەرمانین. ئەم مادەیە کە ڕێژەیەکی کەمترە لە ١٪ کێشی وشکی ڕوەکەکە و دەتوانێت ئەم ڕێژەیە چەشنی تایبەتمەندیەکی بەرچاو لەو ڕوەکە بناسێندرێت.

لە خوارەوە بۆ ڕوونکردنەوەی زۆرتری بواری گیادەرمانی چەند خاڵ باس دەکەین:

## نموونەی مەوادی دەرمانی ناو ڕوەکەکان

نموونەی ئەو پێکهاتانەی کە لە ناو ڕوەکەکاندا بوونیان هەیە و گیادەرمان دەتوانێت بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ هۆکاری نەخۆشەکان بەکاریان بهێنێت، وەکوو: ئالکالۆئید، گولۆکۆزید، ســـاپۆنین، پێکهاتەی تاڵ، تانین، پێکهاتەی بۆن و عەتر، ئەسانسە ڕۆنیەکان و تیرپێن، ڕۆنی ڕوەکی، ئەنسولینی ڕوەکی، لینجاو، هۆرموونات، مەوادی دژەچلک و میکرۆبکوژ و هتد.

### ئاڵکالۆئید[١]

تۆخمی نـایترۆژێنی[٢] تێـدایە و هەم دەوری ژەهری ڕوەکی دەگێڕێ و هەم دەرمان. لە بواری پزیشـــکی و کیمیادا دۆزینەوەی ئاڵکالۆئیدی تایبەت بۆ دەرمانی نەخۆشی کارێکی دژوارە و پسپۆڕانی فایتۆکیمیا[٣] بۆ ئەم مەبەستە توێژینەوەی زۆر دەکەن و بەگوێرەی پێکهـاتەی کیمیـاویی و بەتـایبەت پێکهـاتەی مۆلێکوولی[٤] بە شێوەی خوارەوە ئاڵکالۆئیدەکان پۆلێنبەندی دەکەن:

١. Alkaloid
٢. Nitrogen: هەمان مادەی سەرەکی پەینی کیمیایی سپی
٣. Phytochemist
٤. Molecule

١) فینیل ئالانیل[١]: وەکوو کاپسایسین[٢] لە بیبەر[٣] و کۆلشیسین[٤] لە گوڵی فیفۆکە[٥]

٢) ئیزۆکینۆلۆئیک[٦] (وەکوو مۆرفین[٧]، کۆدۆئین[٨]، پاپاوێرین[٩] لە ڕووەکی خەشخاش[١٠]) و ئیندۆلیک[١١] (ئەرگۆمێترین[١٢]، ئەرگۆتامین[١٣] و ئەرگۆتۆکسین[١٤] لە ژەنگی گەنم[١٥])

٣) ئاڵکالۆئیدەکانی کینۆلۆئیک[١٦]: لە لق و پۆی ڕووەکی پێچن[١٧]

٤) پیریدیک[١٨] و پیپریدیک[١٩]: وەکوو رایسینین[٢٠] لە ڕووەکی گەرچەک[٢١]، تێریگۆنلین[٢٢] لە ڕووەکی شملی[٢٣]، کۆنین[٢٤] (ژەهری کوشندە) لە ڕووەکی شەوکەران

١. Phenyl alanine
٢. Capsaicine
٣. *Capsicum spp.*
٤. Colchicine
٥. *Colchicum speciosum*
٦. Isoquinoleiques
٧. Morphine
٨. Codeine
٩. Papaverine
١٠. *Papaver orientale* L.
١١. Indolique
١٢. Ergometrine
١٣. Ergotamine
١٤. Ergotoxine
١٥. Wheat Rusts: *Puccinia graminis*
١٦. Alcoides Quinoleques
١٧. *Ruta spp.*
١٨. Pyridiques
١٩. Piperidiques
٢٠. Ricinine
٢١. *Ricinus communis*
٢٢. Trigonelline
٢٣. *Trigonella foenum-graecum* L.
٢٤. Conine

(زرەگیژنوک)[1].

٥) ئاڵکالۆئیدەکانی ترۆپاندار: وەکوو ئەسکوپۆلامین[2] و ئاترۆپین[3] لە ڕووەکی هەلایهل[4] و ئاڵکالۆئیدەکانی ئەسترۆئید[5] لە بنک و ڕەگی وەنەوشە و ئاکۆنیتین[6] لە ڕووەکی گیاژار[7]

بە کورتی ئاڵکالۆئیدەکان خاوەنی تایبەتمەندی دەرمانی و ژەهراوین. بۆیە ئەگەر مرۆڤ لە بەکارهێنانی مەوادی هۆشبەر و مۆخەدێراتی ناو ئاڵکالۆئیدەکان تووشی زیادەڕەوی بێت دەستبەجێ جەڵتەی دڵی تووش دەبێت. وەکوو ئاڵکالۆئیدی خەشخاش (مۆرفین، پاوێرین[8]، پاپاوێرن[9] و هێرۆئین[10])، چایی[11] (تێئین[12])، کاکائوو[13] (تێئۆبرۆمین[14])، کووکا[15] (کووکائین)[16]، توتن[17] (نیکۆتین)[18]، قاوە[19] (کافێئین[20]) و

---

١. *Conium maculatum*
٢. Scopolamine
٣. Atropine
٤. *Atropa belladonna* L.
٥. Steroides
٦. Aconitine
٧. *Aconitum napellus* L.
٨. Paverin
٩. Papaverine
١٠. Heroin
١١. *Camellia sinensis*
١٢. Theine
١٣. *Theobroma cacao*
١٤. Theobromine
١٥. *Erythroxylum coca*
١٦. Cocaine
١٧. *Nicotiana Tabacum* L.
١٨. Nicotine
١٩. *Coffea Arabica* & *Coffea canephora*
٢٠. Caffeine

زریشک[١] (بێربێرین)[٢].

## گۆلۆکۆزید[٣]

ڕوەک لە ئەنجامی کارگری فتۆسەنتێز پاش دروستکردنی شیلەی پەروەردە و مادەی شەکەری مەوادی پلە دووهەم[٤] ساز دەکات کە پێی دەڵێن گۆلۆکۆزیدەکان. بەگشتی گۆلۆکۆزیدەکانی ناو ڕوەک دوو دەستەن: یەک، مەوادی گۆلۆکۆز[٥] کە بۆ کاروباری ئاسایی ناو ڕوەک دەبێت. دوو، مەوادی دەرمانی کە بە (ئەگلیکۆن[٦] یا ئەگلۆکۆن) دەناسرێت. بەگشتی گۆلۆکۆزیدەکان ئەم چەند دەستەی خوارەوەن:

١) تیۆگۆلۆکۆزید[٧]: ئەم دەستەیە دەوڵەمەندە بە مەوادی گۆگردی[٨] و بە زۆری لە بنەماڵەی خەرتەلە[٩] و کەلەرم[١٠] دەست دەکەوێت

٢) ئەوانەی کە لە ترشی سیانیدریک[١١] ساز دەبن، وەکوو گۆلۆکۆزیدەکانی ناو بایەمی تاڵ[١٢]، گوڵی گیابۆنکەی ڕەش[١٣]، هەڵووژە[١٤] و گەڵای دار گێلاس

---

١. Berberis vulgaris
٢. Berberine
٣. Glucoside
٤. مواد ثانوی
٥. Glucose
٦. Aglycone
٧. Thioglucoside
٨. Sulfur
٩. *Sinapis alba* L.
١٠. *Brassica spp.*
١١. Acayanhydric acid
١٢. *Amygdalus communis* L. var. *amara*
١٣. *Sambucus nigra*
١٤. *Prunus cerasifera*

٣) ئانتراکینۆنیک[١]: لە سەلک و ڕەگی ڕێواسی چینی(ڕیوەند)[٢] دەست دەکەوێت و سوودی ڕەوانکاری[٣] ناوسکی هەیە

٤) کاردیۆگڵۆکۆزید[٤]: ئەو مەوادانەی لە ناو ڕوەکی چاوکەڵەشێرە[٥] و دەسکێشی ڕێوی[٦] دەست دەکەون و بۆ ڕێکخستنەوەی کاری دڵ بە ڕێژەیەکی کەم بەکار دەهێنرێت

٥) گڵۆکۆزیدەکانی فینۆلیک[٧]: ئەم پێکهاتانە هەم مەوادی دەرمانین و هەم بۆ عەتر و بەرامە سوودیان لێ وەردەگیرێت. وەکوو پێکهاتەی سالیسیلیکی[٨] ناو توێکڵی دار بی، جەوڕنە[٩] و چرۆی دار سنەوبەر (سپیدار)[١٠]، هەروەها مەوادی ئاربۆتینی[١١] ناو ڕوەکی مۆرتک[١٢] و کرێژەبەرد[١٣]

---

١. Anthraquinone

٢. *Rheum palmatum* L.

٣. مسهل

٤. Cardio Glucoside

٥. *Adonis aestivalis* L.

٦. *Digitalis purpurea*

٧. Phenolic

٨. Salicylic

٩. *Ephedra major* Host.

١٠. *Populus alba*: (صنوبر) لە زمانی عەرەبی بە داری کاژ (*Pinus spp.*) دەڵێن. لە زمانی فارسی (سنوبر، صنوبر) جۆرێک داری سپیدارە. لە باشووری کوردستان هەندێ جار بەهۆی زمانی عەرەبیەوە ئەم هەڵەیە دووپات دەبێتەوە لە نێوان داری سپیدار و داری کاژ

١١. Arbutin

١٢. Myrtus: *Psidium claraense*

١٣. Lichen: لە پەرتووکی "گلسنگهای ایران" ژمارەی کرێژەبەردەکانی سەرتاسەری ئێرانی ٢٠٠ دانە تۆمار کراوە، واتا ٢٠٠ جۆر کرێژەبەرد. تا وەکوو ئێستا لە کوردستان کەسێک کاری پسپۆڕی لە سەر جەماوەری کرێژەبەردەکانی کوردستان نەکردووە.

## ساپۆنین[١]

لە بواری کیمیا ســـــاپۆنینەکان بەگوێرەی بەشـــی گولۆزیدیک (گولۆکۆز[٢]) کە چەســـپاوە بە ئەگلیکۆنەکانەوە، پۆلێنبەندی دەکرێن. ســـاپۆنین دەتوانێت تەوژمی ڕووکاری مادەی ئاو و تراوی ئاوی دابەزێنێت. بۆیە ســـاپۆنینەکان دەتوانن کەف بکەن و بکرێنە ناو مەوادی پاککەرەوە. ســـاپۆنینەکان چڵماو و لینجاوی ڕیخۆڵەکان نەرم دەکەنەوە. کەواتە وەکوو نەرمکاری نـاوســـک و ڕیخۆڵە ســـــوودیـان لێ وەردەگیردرێت، وەکوو ساپۆنینی ڕیشەی مێکووک[٣] و ڕەگ و سەلکی جینسینگ[٤]

## مەوادە تاڵەکان[٥]

ئەو پێکهاتە و مەوادەی ناو ڕوەکەکان کە تام و چێژی تاڵیان هەیە. مرۆڤ لە ئەنجامی خواردنی ئەم مەوادە تاڵانە ئارەزووی خواردن و شـیلەی ناو گەدەی زۆر دەبێت. زانایانی فارماکۆلۆژی[٦] ئەم پێکهاتە تاڵانە بە مەوادی تێرپێنیک[٧] دەناســـن، وەکوو تاڵایی ناو گوشراوەی گیابەند[٨] و گیاتاڵگ[٩]

## تانێن[١٠]

مەوادی تانێندار تایبەتمەندی کیمیایی زۆریان هەیە بەڵام ســـــوودی دەرمانیان زۆر لەیەک دەچێ. خواردنی مەوادی تانێنی حاڵەتی گرســـی و قەبزی ناوســـک زۆر دەکەن. هێندێ لە سوودە دەرمانیەکانی تانێن ئەمانەن: گیرساندنەوەی خوێنبەربوونی ناوسک و

---

١. Saponine
٢. Glucose
٣. *Glycrryrrhiza glabra* L.
٤. *Panax quinquefolius*
٥. Amara: Principes Amers
٦. Pharmacoloy
٧. Terpène
٨. *Artemisia absinthium* L.
٩. *Centaurea spp.*
١٠. Tannin

کۆئەندامی هەرس، دژی سکچوون، ئاوسانی ناودەم و پێست، درم و پەتا، سارێژکردنەوەی برین و سووتان، دەرمانی مایەسیری و عارەق کردنی زۆری جەستە.

## مەوادی بۆن و عەتر[١]

ئەم مەوادە بۆن و عەترە تایبەتمەندی دەرمانی زۆریان هەیە وەکوو ئیستۆژێنین، فلاونۆئید[٢] و فینۆلیک[٣]، ئەسکۆلین[٤] لە شابەڕووی هێندی[٥] (سوودی دەرمانی هاوشێوەی ڤیتامینی P بۆ خۆڕاگری دەمارەکان لە نەخۆشی مایەسیری)، فیلاولینان لە ڕوەکی چاوبازە[٦] (بۆ نەخۆشیەکانی جەرگ و هێپاتیک)، فۆرۆکۆمارین[٧] لە ڕوەکی گێنوو[٨]، کۆمارین[٩] لە گیای کەنێرە[١٠] و نەفتۆکینۆن[١١] لە گەڵای دار گوێز. بە کورتی و گشتی سوودی دەرمانی مەوادە عەتریەکان بریتین لە میکرۆبکوژی کۆئەندامی میز و هەرس

## ئەسانسە ڕۆنیەکان[١٢]

هاوشێوەی پێکهاتەی ڕۆن و چەوری ناو ڕوەکەکانە بەڵام خاوەنی بۆن و عەتری تایبەت بە خۆیانە. بۆ بەدەست هێنانی ئەسانسی ڕۆنی باش و کاریگەر پێویستە ئەو ڕوەکانەی ئەم مەوادەیان تێدایە لە ڕۆژێکی گەرم و خۆرەتاودا کۆ بکرێنەوە. چونکە

---

١. Substances Aromatiques
٢. Flavonoides
٣. Phenoliques
٤. Esculine
٥. *Aesculus hippocastanum*
٦. *Carduus marianus* L.: خار مریم، خار علیص
٧. Furocoumarine
٨. *Eremostachys laciniata* (L.) Bunge.
٩. Coumarine
١٠. *Melilotus officinalis* (L.) All.
١١. Naphtoquinones
١٢. Essential Oils

ئەم ڕۆنانە لە بەرامبەر تیشـــکی خۆردا کاراترن و کاتێ تیشـــکی خۆر زۆر ببێت ڕێژەیان لە ناو گیاکەدا زۆرتر دەبێ. سوودی دەرمانی ئەم ئەسانسانە گەلێک زۆرە، وەکوو: میکرۆبکوژی، دژی بەکتریـا، خەڵـتهێنەر[١]، بۆ هەرس کردنی خۆراک، بەهێزکردنی گەدە، فڕێدانی زەرداوی سـەفرا و چارەسـەری ڕۆماتیزم. بە کورتی و گشـتی سـوودی دەرمانی ئەسـانسـە ڕۆنیەکان بریتین لە میکرۆبکوژی مۆخات و کۆئەندامی هەرس و سی[٢]

ئەم ئەسـانسـانە پێویسـتە کاتێک لە ڕوەک دەرهێنران لە شـوێنی دوور لە خۆر و لە بەسـتە و قوتوویەکی بەسـتراودا هەڵبگیردرێن چونکە دەسـتبەجێ ئۆکسـیدە و پۆلیمریزە دەبن، واتە سـوودی دەرمانیان نامێنێ. وەکوو ئەسـانسـی زیرە[٣]، ڕازیانە[٤]، جاترەتاڵە[٥]، جاترە کێویلە[٦]، پوونگە[٧]، شـاڕێحانە[٨]، نەعنا[٩]، کافوور[١٠]، ڕکێشـە، نارنجبۆ، و پێکهاتەی تێربانتین[١١] لە دارە وەن.

## ڕۆنی ڕوەکی[١٢]

پێکهاتەی ڕۆنی ناو ڕوەکەکان لە پلەی گەرمادا دەبن بە ڕۆنی تراو و لە پلەی سـەرمادا دەیبەسـتن. ئەم ڕۆنانە دابەش دەبن بە سـەر ڕۆنی وشـک (ڕۆنی بایەم و

---

١. واتا ڕێگاکانی هەناسەکێشان لە سی و ناوپەنچکەکان خاوێن دەکاتەوە و خەڵتی ئەم شوێنانە هەڵدەکەنێ و پاڵی پێوە دەنێت بۆ دەرەوە

٢. دستگاه گوارش و تنفس: جهاز هاضمە و تنفس

٣. *Carum carvi* L.

٤. *Foeniculum vulgare* Mill.

٥. *Origanum vulgar* L.

٦. *Thymus vulgaris* L.

٧. *Mentha pulegium*

٨. *Lavandula vera* DC. = *L. officinalis* Chaix.

٩. *Mentha longifolia* L.

١٠. *Cinnamomum camphora* Schaeff.

١١. Terebenthine

١٢. Vegetable Oils

زەیتوون) و نیوەوشـــک (گوڵەبەڕۆژە و بایەم زەمینی[1]). ڕۆنی کەتان و گەرچەک تایبەتمەندی ڕەوانکاری بەهێزیان هەیە.

## ئەنسۆلینی ڕووەکی[2]

پێکهاتەی هاوشـــێوەی مادەی ئەنســـۆلین کە لە هەندێ ڕووەک وەکوو توێکڵە درێژەی لۆبیا، ســـەرچڵەکانی گاڵگا[3] و گەڵای مۆرتک دەســـت دەکەوێت. واتا بۆ دەرمانی نەخۆشی شەکرە کەڵکی هەیە.

## لینجاو(مووسیلاژ)[4]

هەندێک لە مەوادی پۆلیســاکاریدی[5] ناو ڕووەکەکان کاتێ لەگەڵ ئاو تێکەڵاو دەبن پێکهاتەیەکی لینجاو ســـاز دەبێت کە دەکرێت هەم بە شـــێوەی تەنیا و یا تێکەڵاوی دەرمان و مەوادی دیکە بکرێت. وەکوو گەڵا و گوڵی هێرۆ[6]، گەڵا و گوڵی تۆڵەکە[7]، تۆوی شـــــملی[8]، تۆوی ڕکێشــە[9]، ناوکە بەهێ[10]، تۆوی کەتان[11]، تۆوی ڕێحان[12] و قەوزە[13] دەریاییەکان. هەروەها پێکهاتەیەکی دیکەی ناو ڕووەکەکان بە ناوی پێکتین[14]،

---

١. *Arachis hypogaea* L.
٢. Vegetales insulines
٣. Galega
٤. Mucilages Vegetaux
٥. Polysaccharides
٦. *Althaea officinalis* L.
٧. *Malva neglecta* Wallr.
٨. *Trigonella foenum-graecum* L.
٩. *Plantago major* L.
١٠. *Cydonia oblonga* Mill.
١١. *Linum nodiflorum* L.
١٢. *Ocimum basilicum* L.
١٣. Moss
١٤. Pectin

ئەمیش سەر بە مووسیلاژەکانە و لە زۆربەی میوەکاندا وەکوو سێو، چەوەندەر[١] و گێزەر دەست دەکەوێت و بۆ دەرمانی سکچوون کەڵکیان لێ وەردەگیرێت. بەگشتی سوودی دەرمانی مووسیلاژەکان بریتن لە نەرمکاری[٢] و دەرمانی قەبزی و دژی کۆکە و لرخەی سینگ

## هۆرموناتی ڕوەکی[٣]

ئەم هۆرموناتە پێکهاتەیەکی زنجیرەداری کیمیاوین کە دەوری بایۆکاتالیزۆری[٤] دەگێڕن و لە سەر گەشە و ئاڵوگۆڕی متابۆلیکی کاریگەریان هەیە. لە هەندێ ڕوەک وەکوو نارنجبۆ[٥]، هێرۆ، کاڕان[٦] و گێزەر دەست دەکەون.

## دژەچڵك و میکرۆبکوژەکان

بۆ ئەم بەشە مەبەست لە مەوادێکە کە هاوشێوەی ئانتیبایۆتیکەکان[٧] کار دەکەن و لە ڕوەکەکاندا دەست دەکەون. ئەمانە سوودی میکرۆبکوژی زۆریان هەیە و لە ڕێگەی بخور[٨] بۆ خاوێنکردنەوەی ڕێڕەوی هەناسە کێشان سوودبەخشن. وەکوو

---

١. *Beta vulgaris*

٢. Laxative: ملين

٣. Phythormones

٤. Biocatalyseurs

٥. *Melissa officinalis*

٦. *Avena sativa* L. = *A. sterilis* L.

٧. Antibiotic

٨. بخور لە (بخار) عەرەبیەوە هاتووە. واتا هەڵم کردنی ئاوتک و ئاوی ڕوەکێکی دیاریکراو بە مەبەستی میکرۆبکوژی یان بۆنخۆش کردنی ژوورێک یان ئەوەیکە بخور دەتوانێت بەم شێوە بێت کە مرۆڤ سەر بگرێتە سەر هەڵمی ئاوتکی ڕوەکێک و سوودی دەرمانی لێ وەربگرێت.

سیر[1]، پیاز[2]، ڕەگ و تووی خەرتەلە[3]، کاژ[4]، ڕکێشە[5] و گیابۆنکەی ڕەش (وڕەبۆنکە)[6].

## سوودی ڕووەکە دەرمانیەکان بۆ چارەسەری نەخۆشیەکان[7]

1) ئارامبەخش، دژی خەمۆکی، بەهێزکردنی مێشک و ئەعساب:

شـــارێحانەی ڕۆمی (ئۆســـتۆخۆدووس)[8]، بەیبوون[9]، نارنجبۆ[10]، کاڕان (جۆی دووســـەر)[11]، جینســـینگ، چای، ڕێحان[12]، زەردەچێوە[13]، زەعفەران[14]، کەرەوز[15]، قاخڵی، گوڵی گۆزروان[16]، نەعنا و پوونگە

2) میزهێنەر: بێژانە[17]، مەعدەنووس، کەرەوز، چای، مەرزۆکە، گەنمەشـــامی[18]،

---

١. *Allium sativum* L.

٢. *Allium cepa* L.

٣. *Sinapis alba* L.

٤. *Pinus spp.*

٥. *Plantago major* L.

٦. *Sambacus nigra* L.

٧. وەرگیراو لە پەرتووکی ڕووەکە دەرمانیەکان و گیادەرمانی، دکتۆر موحەممەد حوسەین ساڵحی، مامۆستای کۆلێژی دەرمانسازی زانکۆی تاران

٨. *Lavandula stricta* Del. = *L. corronopifolia* Poir.

٩. *Matricaria chamomilla*

١٠. *Melissa officinalis* L. = *Calaminta officinalis* Monech.

١١. *Avena sativa* L. = *A. sterilis* L.

١٢. *Ocimum basilicum* L.

١٣. *Curcuma longa* L.

١٤. *Crocus sativus* L.

١٥. *Apium graveolens* L. var. *dulce*

١٦. *Borago officinalis*

١٧. *Achillea millefolium* L.

١٨. *Zea mays* L.

کوولەکە زەردە[١]، قاخلی، گوڵی گۆزروان، لیمۆترش[٢]، هەمیشەبەهار[٣] و گێزەر[٤]

٣) زیادکردنی هێز و توانایی جنسـی: ئەنیسـۆن، بایەم زەمینی[٥]، شـلیک[٦]، مەعدەنووس[٧]، جینسینگ، ڕازیانە[٨]، قەیسی[٩]، زەعفەران، شاتەرە[١٠]، شملی، کەرەوز، گوێز، گژنیژە، نەعنا[١١]، پوونگە[١٢]، هەمیشەبەهار و گێزەر

٤) ڕێکخستنی هۆرموونی خانمان: ڕازیانە و کەتان[١٣]

٥) زیادکردنی شیری خانمان: ئەنیسۆن، بایەم زەمینی، ڕازیانە و ڕێحان

٦) دژی هەسـتەوەری و ئالێرژی[١٤]: شـارێحانە ڕۆمی، ترێ، نارنجبۆ، ژینکۆ، چای، ڕێحان، کەرەوز و گوڵە پووران

٧) دژی سکچوون: قەڵەمتووس[١٥]، بەهێ[١٦]، بێژانە، چای، دارچین، سێو[١٧]، گوێنی و مەرزۆکە

٨) ئانتی ئۆکسـیدان[١٨]: جاترەکێویلە، ترێ[١٩]، بەیبوون، بایەم زەمینی، شـلیک،

---

١. *Cucurbita pepo* L.
٢. *Citrus medica* L. var. *cedrata*
٣. *Calendula officinalis* L.
٤. *Daucus carota* L. var. *sativus* = *D. sativus* (Hoffm.) Rohl.
٥. *Arachis hypogaea* L.
٦. *Fragaria vesca* L.
٧. *Petroselinum hortense* Hoffm. = *P. sativum* Hoffm.
٨. *Foeniculum vulgare* Miller. = *F. officinale* All.
٩. *Prunus armeniaca* L.
١٠. *Fumaria vaillantii* Loisel. = *F. schrammuii* (Hausskn.) Pugsely.
١١. *Mentha piperita* L.
١٢. *Mentha longi*folia (L.) Huds.
١٣. *Linum usitaitissimum* L. = *L. humile* Miller.
١٤. Allergy
١٥. *Eucalyptus glob*ules Labill.
١٦. *Cydonia obl*onga Mill.
١٧. *Malus domestica* Borkh.
١٨. Antioxidant
١٩. *Vitis vin*ifera L.

مەعدەنووس، جینسـێنگ، ژینکۆ، چای، ڕێحان، زەردەچێوە، زەعفەران، زەنجەفیل، سـۆیـا[1]، زەیتوون، بیبەر، کوولەکە[2]، کەرەوز، گوێز، لیمۆترش، مەرزۆکە، گوڵە پووران، نارنج[3]، نەعنا و گێزەر

٩) دژی ئارەق کردن: بیبەر، لیمۆترش، گوڵە پووران و مەرزۆکە

١٠) دژی ژان و هەوکردن: شـاڕێحانە ڕۆمی، قەڵەمتووس، بێژانە، مەعدەنووس، زەنجەفیل، بیبەر، کەرەوز، قاخڵی، مەرزۆکە و هەمیشەبەهار

١١) دژی شـێرپەنجە: ترێ، پیاز، شـلیک، جینسـێنگ، ژینکۆ، چای، زەردەچێوە، سۆیا، سیر، بیبەر، کەرەوز، گوێنی، مەرزۆکە، هەمیشەبەهار و گێزەر

١٢) دژی ژەهر: زەیتوون، سیر، بیبەر[4]، لیمۆترش و نەعنا

١٣) دژی میکرۆب و کـارگ و ڤـایرۆس: جـاترەکێویلە، ترێ، ئەنیسـۆن، قەڵەمتووس، نارنجبۆ، ڕکێشـە، بێژانە، پیاز، مەعدەنووس، چای، خەنە[5]، دارچین[6]، ڕازیـانە، زەردەچێوە، زەنجەفیل[7]، سـیر، بیبەر، کەرەوز، گوێز، گژنیژە[8]، قـاخڵی، مەرزۆکە[9]، نەعنا و هەمیشەبەهار

١٤) بۆ چارەی گیرانی سـووڕی مانگانە: شـاڕێحانە ڕۆمی، ئەنیسـۆن، بەیبوون، بێژانە، مەعدەنووس، زەعفەران، چاوبازە، کەرەوز و قاخڵی

١٥) دابەزاندنی ترشـی ئۆریک[10]: ڕکێشـە باریکە[11]، ڕکێشـە پانە[12]، مەعدەنووس،

---

١. *Glycine max* (L.) Merrill.

٢. *Cucurbita spp*.

٣. *Citrus aurantium* L. = *C. amara* Link. = *C. bigaradia* L. = *C. vulgaris* Loisel.

٤. *Capsicum annum* L. = *C. frutescens* L.

٥. *Lawsonia inermis* L.

٦. *Cinnamomum zeylanicum* Nees. = *Laurus cinnamomun* L.

٧. *Zingiber officinale* Rosc.

٨. *Coriandrum sativum* L.

٩. *Satureja hortensis* L.

١٠. Uric Acid

١١. *Plantago lanceolata* L.

١٢. *Plantago major* L.

کاڕان، زەیتوون[١]، گێوژی سوور، کەرەوز، نارنج و گێزەر

١٦) بۆ کەمکردنەوەی چۆڕانی شـــیری خانمان: مەعدەنووس، گوڵە پووران و گێزەر[٢]

١٧) دابەزاندنی شـــەکرەی خوێن: شـــارێحانە ڕۆمی، قەڵەمتووس، پیاز، جۆ[٣]، جینسینگ، زەیتوون، سیر، شملێ[٤]، کوولەکە، کەرەوز، گوێز، گەزگەسک[٥]، گژنیژە و گێزەر

١٨) بۆ کەمکردنەوەی ئارەزووی جنســی: گوڵە پووران[٦] و نەعنا (ئەو ڕووەکانەی ســـوودی دابەزاندنی ئارەزووی جنســـیان هەیە بۆ زیادکردنی ئارەزووی جنســـیش ســـوودبەخشـن چونکە ئەمانە ئارەزووی جنسـی هاوسـەنگ دەکەن وەک چۆن ترێ هەم بۆ قەڵەوی دەبێ و هەم بۆ لاوازی)

١٩) بەهێزکردنی هێزی خۆڕاگری جەستە: جاترەکێویلە[٧]، ترێ، بەیبوون، ڕکێشە، کاڕان، جینسینگ، هێرۆ[٨]، زەردەچێوە، سیر و گوڵە پووران

٢٠) ڕەوانکارەکان: ترێ، ڕکێشـــە باریکە، بایەم[٩]، شـــلیک، هێرۆ، ســـەنامەکی[١٠]، زەیتوون، تاڵیشاری[١١]، کەتان، گەرچەک و گوێنی

٢١) بۆ تەندروســـتی و خاوێنی پێســـت: ئاقۆکادۆ، جاترەکێویلە، ترێ، بەیبوون، ترشـــە ڕووەکیەکان، بایەم، بایەم زەمینی، تۆڵەکە[١٢]، شـــلیک، کاڕان، شـــملێ، خەنە،

---

١. *Olea europaea* L.
٢. *Daucus carota* L. var. *sativys.*
٣. *Hordeum vulgar* L.
٤. *Trigonella foenum-graecum* L.
٥. *Urtica dioica* L. var. *dioica*
٦. *Salvia spp.*
٧. *Thymus spp.*
٨. *Alcea kurdica* (Schlecht.) Aleff. = *Althaea kurdica* Schlecht.
٩. *Amygdalus communis* L.
١٠. *Cassia italic* (Miller.) F. W. Andrews.
١١. *Aloe vera* L.
١٢. *Malva neglec*ta Wallr.

چاوبازە[1]، شـــاتەرە، تاڵیشـــاری، گوڵە هێرۆ، زەیتوون[2]، مێکووک[3]، گەزگەســـک، هەمیشەبەهار و گێزەر

٢٢) بۆ دەرمانی کێشـــەکانی کۆئەندامی هەناســـە: جاترەکێویلە، ڕکێشـــەباریکە، قەڵەمتووس، ڕکێشە پانە، تۆڵەکە، پیاز، جۆ، جینسینگ، ژینکۆ، چای[4]، هێرۆ، قەیسی، سێو، مێکووک، بیبەر، گوڵی گۆزروان، مەرزۆکە و نەعنا

٢٣) سـوودبەخش بۆ دڵ و دەمارەکان (دابەزاندنی چەوری خوێن، کۆلسترۆل[5]، تەوژمی (فشـار) خوێن و بابەتەکانی دیکە): ئاڤۆکادۆ[6]، جاترەکێویلە، ڕکێشـە باریکە، گێزەر، ترێ، بەیبوون، بایەم زەمینی، ڕکێشە پانە، پیاز، مەعدەنووس، جۆ، جینسینگ، ژینکۆ[7]، چای، زەنجەفیل، زەیتوون، گێوژی سوور[8]، سۆیا، سێو، سیر، شمڵی، بیبەر، کەتان، کوولەکە، گەزگەســـک، گوێز[9]، گژنیژە، قاخلی[10]، گوڵی گۆزروان، لیمۆترش، نارنج و هەمیشەبەهار

٢٤) بۆ کاری کۆئەندامی هەرس (دژی قەبزی، ژان، نەفخ[11] و با، کۆڵنج، بەهێز کردنی هەرس): جاترەکێویلە، ئەنیســـۆن[12]، شـــارێحانە ڕۆمی، بەیبوون، نارنجبۆ، بێژانە، بەهێ، شـــلیک، پیاز، مەعدەنووس، کاڕان، خەنە، دارچین، ڕازیانە، ڕێحان، قەیسی، زەردەچێوە، زەعفەران، زەنجەفیل، ســیر، مێکووک، بیبەر، کەرەوز، گژنیژە، گوڵە گۆزروان، گوێنی[13]، لیمۆترش، مەرزۆکە، نەعنا، هەمیشەبەهار و گێزەر

---

١. *Carduus marianus* L.

٢. *Olea europaea* L.

٣. *Glycrryrrhiza glabra* L. var. *glabra*

٤. *Camellia sinensis*

٥. Cholesterol

٦. *Persea Americana* Mill.

٧. *Ginkgo biloba* L.

٨. *Crataegus atrosanguinea* A. Pojark.

٩. *Juglans nigra*

١٠. *Carthamus tinctorius* L.

١١. غازاتی ناوسک

١٢. *Pimpinella anisum*: بادیان خطایی

١٣. *Astragalus spp.*

٢٥) بۆ کێشـــەکانی جەرگ و هێپاتیک: ترێ، ئەنیســـۆن، مەعدەنووس، چای، چاوبازە، زەردەچێوە، سۆیا، سیر، شاتەرە و نارنج

## کۆکردنەوە، وشك کردنەوە و پێچانەوەی ڕووەك

بۆ کۆکردنەوە و پێچانەوەی ڕوەکەکان پێویســـتە ئەو مەرج و ڕێنماییانە کە پســـپۆڕانی ئەم پیشـــەیە بە ئەزموون پێی گەیشـــتوون، ڕەچاو بکرێن تا وەکوو باشترین ڕێژەی مەوادی دەرمانی و پزیشکی دەست بکەوێت:

- ڕوەک بە چەقۆی تیژ یان مەقەستی باخبڕین ببڕدرێت.
- پێویستە سـەرچاوە و وتارە گرینگەکان سـەیر بکرێن تا وەکوو دڵنیا بین لە باشـــترین وەرز و کاتی ڕۆژانە بۆ کۆکردنەوە و بڕین و ڕنینەوەی ڕوەکەکان و لە بڕێکی کەمی ڕوەک زۆرترین ڕێژەی مادەی دەرمانی بە دەست بهێنین.
- بۆ کۆکردنەوەی ڕیشـــە و ڕەگی ڕوەک باشـــترین کات وەرزی ســـەرما و سۆڵەی زستان و پاییزە کە ڕوەک لە باری گەشە وەستاوە (خەوی زستانە). چونکە ڕوەک لە وەرزی خەودا زۆرترین ڕێژەی مەوادی دەرمانی لە ناو ڕیشـــەکەیدا کۆ دەبێتەوە.
- بۆ ڕوەکە چەند ساڵەکان باشترین کاتی کۆکردنەوە بۆ ڕەگ و ڕیشە ساڵی دووهەم و سێهەمی گەشەی ڕوەکە و بۆ ڕوەکە دوو ساڵەکان پاییزی ساڵی یەکەم
- ئەو ڕوەکانە کە ســەرچڵ و لقەکانیان بۆ دەرمان دەبێت پێویستە بەشـی ٢٠ تا ٣٠ ســانتیمەتری کۆتایی لقەکان ببڕدرێت. ســەرچڵ و لقی ئەم ڕوەکانە چەشـنی گەڵا و گوڵەکان ئەگەر تەپ و تۆزاوی بوون بە ئاوێکی کەم بشۆرێنەوە.
- بە ڕێزەوە ٥ تا ٨ کیلۆگرام گوڵی تازە، ٤ تا ٥ کیلۆگرام ســـەرچڵی گەڵا و گوڵدار، ٣ تا ٤ کیلۆگرام ڕیشـــە و ٢/١ تا ٥/١ کیلۆگرام مێوەی تازە پێویســـتە تا وەکوو یەک کیلۆگرام کێشی وشکی ڕوەک بە دەست بهێنین.
- بۆ کۆکردنەوەی گوڵ و گەڵا باشـــتر وایە کە شـــەونم و ئاونگی ســـەر ڕوەکەکان وشـــک بوو بێتەوە. چونکە تەڕایی ســـەر ئەندامەکانی ڕوەک دەبێتە هۆی دێر وشک بوونەوە و کەڕوو هێنان.

- بۆ کۆکردنەوەی گەڵای ئەو ڕووەکانە کە گەڵایان هەڵدەوەریت (وەکوو زۆربەی ڕووەکەکان) باشترین وەرز بۆ کۆکردنەوە پێش پشکوتنی گوڵە، بەڵام بۆ ئەو ڕووەکانە کە هەمیشە سەوزن وەکوو چایی و ڕۆزماری چوار وەرزە کۆ دەکرێنەوە.
- کاتی کۆکردنەوەی توێکڵ و پێستی دەرمانی ڕووەک وەرزی پاییزە، یانێ کاتێ کە هێشتا جەوی و شیلاوەی ناو ڕووەک زیانیان نەگەیاندووەتە توێکڵی دارەکە. بۆ خاوێن کردنەوەی توێکڵ، نابێت ئاو بەکار بهێنین. هەروەها پێویستە بۆ زووتر وشکبوونەوە توێکڵەکان پارچە پارچە بکرێن.
- کاتی کۆکردنەوە و وشک کردنی ڕیشە ئەو کاتەیە کە ڕووەک گوڵ و گەڵای هەڵوەراندووە. ئەڵبەت کاتی کۆکردنەوەی ڕیشەی گوڵە پەپوو (پەپوو پاییزە)[1] وەرزی بەهارە.
- ئامانجەکانی وشک کردنەوەی ئەندامەکانی ڕووەک: یەک، کەم کردنەوەی کێشی ڕووەک. ڕووەکەکان لە نێوان ٦٠ تا ٩٠% ئاو و تەڕاییان لە دەست ئەدەن تا بە ئاسانی هەبگیردرێن و بگوازرێنەوە. دوو، ناکارا کردنی ئەنزیمەکانی ناو ڕووەک و پێشگرتن بە گۆڕانی ئەنزیمەکانی ناو پێکهاتە دەرمانیەکان. سێ، ناکارا کردنی گەشەی بەکتریا و کارگەکان. ناکارایی ئەم میکرۆبانە ئەندامی ڕووەک ناڕزێت و خراپ نابێت.

پسپۆڕانی بواری بایۆلۆژی و کیمیا ئاو و شێی ناو ڕووەک بە سێ بەش دادەنێن:

١) ئاوی کیمیایی یا مولکوولی:

مولکوولەکانی ئاو لەگەڵ مولکوولی مادەی دەرمانی بە پێوەندیەکی بەهێز پێکەوە بەستراونەوە. جیاکردنەوەی ئەم ئاوە کارێکی زۆر دژوارە و تەنیا کاتێ مولکوول بشکێت ئەم ئاوە دێتە دەرەوە. ئەم کارەیش تایبەتی تاقیگە و ناوەندە توێژینەوەکانە. لە بواری گیادەرمانی ئامانج لە وشک کردنەوە ئاوی کیمیایی نییە.

[1]. *Taraxacum spp.*

٢) ئاوی فیزیایی - کیمیایی:

یەک: ئاوی هایدرۆسکۆپیک[١]: مولکوولەکانی ئەم ئاوە بە هێزێکی قایمەوە پێکەوە چەسپاون و بە ئاسانی ئەم ئاوە دەرناهێنرێت.

دوو: ئاوی ئاسایی: ئەم ئاوە لە ڕووکاری خانەکانی ڕوەکە. ئەم ئاوە زۆر نەچەسپاوە و زوو لێک جیا دەبێتەوە.

٣) ئاوی میکانیکی:

ئەم ئاوە لە ڕێگەی ڕەگە وردیلەکانی خاکەوە هەڵدەمژرێن. هەرچی ئاو زۆر بێت ئاوی میکانیکی خاکیش زۆرتر دەبێت. ڕێژەی ئەم ئاوە پەیوەستە بە دوو هۆکارەوە: یەک، کەشی شێداری ژینگەی ڕوەک. دوو، پلەی گەرما.

مەبەست لە وشککردنی ڕوەکە دەرمانیەکان، دەرهێنان و وشک کردنەوەی شێ و تەڕایی میکانیکی و ئاوی ئاسایی سەر خانەی ناو ئەندامەکانی ڕوەکە. کەواتە کاتی کۆکردنەوەی ڕوەکەکان پێویستە ڕوەک لە سەر یەک کەڵەکە نەکرێت و چینێک ناسک و چینێک ئەستوور هەڵنەخرێت، چونکە بەپێی هەمان یاسا (ڕاکێشانی ئاو لە ژینگەی زۆر بۆ ژینگەی کەم و لە کەشی گەرم بۆ کەشی سارد) گەرما و شێ لە چینی ئەستوورەوە بۆ چینی ناسک دەچێت و وشک کردنەوە نایەکسان دەبێت و ڕوەک پەڵەی ڕەش و سپی تێ دەکەوێت.

- هەڵخستن و وشک کردنەوە یانێ دەرهێنانی شێ و ئاوی ناو ڕوەک بە هێواشی و شێنەیی.
- پاش بڕین و ڕنینەوە بە شێوەیەکی پرژ و بڵاو ڕوەکەکان هەڵبخرێن بەڵام هەڵخراوەکە زۆر ئەستوور نەبێت کە ڕوەکەکان لە سەر یەک کەڵەکە ببن و وشک نەبنەوە و بگەنێن. ئەگەر پاش بڕین و ڕنینەوەکە ڕوەک هەروا لە سەر یەک کەڵەکە بێت و نەکرێتەوە، پلەی گەرما بەرز دەبێتەوە و ئەنزیمەکانی ناو ڕوەکەکە کە پێشتر

١. Water Hygroscopic

لە گیا زیندووەکە چالاک و کارا بوون لەناو دەچن و ڕێژەی دەرمانی و پزیشکی ڕوەکەکە کەم دەبێتەوە.

- وشک کردنەوەی ڕاستەوخۆ بە تیشکی هەتاو دەبێتە هۆی بە فیڕۆدانی مەوادی دەرمانی ناو ئەندامەکان.
- ڕوەکە کۆکراوەکان تا کاتی هەڵخستن لە شوێنێک دابنرێت کە هەوا ئاڵوگۆڕ بکات و شوێنەکە نە زۆر تاو بێت و نە زۆر گەرم.
- لەو شوێنە کە ڕوەکەکان هەڵدەخەن باشتر وایە هەوا ئاڵوگۆڕ بکات و ژوورەکە هەواکێشی بێت.
- ئەو ڕوەکانە کە بۆ دەرهێنانی ئەسانس کۆ دەکرێنەوە، ئەگەر لە بەر هەتاو هەڵبخرێن تا ٣٣% و ڕوەکەکانی تاڵگ و پوونگە و جاترە و نەعنا تا ٢٠% مەوادی دەرمانیان لەناو دەچێت.
- ئەگەر ڕوەکی کۆکراوە تەپ و تۆز و گڵی پێوە بوو بۆ ماوەیەکی کورت ئاوی بکێشن و خێرا هەڵیبخەن.
- ئەگەر ڕوەکەکە زۆر وشک بکرێتەوە ئەوە مەوادە دەرمانیەکەی نیوەی لە دەست ئەدات.
- ئەگەر ڕوەکەکە نیوە وشک بێت و هەوایەکی شێی هەبێت ئەوە لە پێچانەوەدا کەڕوو دەکات و مەوادە دەرمانیەکەی دەبێ بە ژەهر.
- کارگەکانی پیشەسازی ڕوەکی دەرمانی بۆ وشک کردنەوە لە ئامێری وشک کردنەوەی گەرماپێو و شێپێو سوود وەردەگرن.
- بۆ وشک کردنەوەی ڕوەکەکان پێویستە گەرما و ئاوری ڕاستەوخۆ بەکار نەهێنین. بەڵکوو وشککەرەوەی کارەبایی ئۆتۆماتیک بەکار بهێنین، بەڵام باشترین وشک کردنەوە هەمان شێوەی بەر سێبەر لە هەوای ئازاد و دەرەوە.
- زستانان پێویستە ئامێر و کەرەستەیەکی گەرماساز لە دیوی هەڵخستنی ڕوەکەکەدا ئیش بکات.
- سەر نانەشان و سەبەتەی تووڵە یان سوورزمە و تەیجەی پلاستیکی باشترین ڕاخەرە و شوێنی هەڵخستنە بۆ وشککردنەوەی ڕوەکەکان. چونکە نانەشان و تەیجە هەوا لە سەر و بنیەوە ئاڵوگۆڕ دەبێت و ڕوەک باشتر و زووتر

وشک دەبێتەوە.

- پێویستە ڕوەکی کۆکراوە لە سەر زەوی ڕووت هەڵنەخرێت.
- هەروەها ئەگەر پێویست بوو قاقەزی سپی بکرێتە ڕاخەری هەڵخستنەکە نەک کارتۆن و ڕۆژنامەی ڕەنگی.
- پێویستە ڕوەکە تەواو گوڵ و کاملەکان بە شێوەی چەپک و دەستووی هەڵواسراو وشک بکرێنەوە و گوڵەکەیان بەراوەژوو بێت و لە شوێنێکی نزیک پەنجەرە یا دەرگا بێت.
- بۆ هەڵگرتنی ڕوەکی کۆکراوە پێویستە لە جیاتی پلاستیک و نایلۆن، جنسی قاقەز و کەتان و بەن بەکار بهێنیت و بخرێنە سەر سندوقی داری یا سندوقی ئالەمنیۆمی.
- بۆ هەڵگرتن و پاشەکەوت کردنی ئەو ڕوەکانە کە هەستیارن بە شێ و کەشی تەڕ، پێویستە بخرێنە ناو قوتووی شووشەیی ڕەنگ قاوەیی یان بکرێنە ناو بەستەیەک کە جنسی لە بەردی سماتە بێت. بۆ نموونە ڕەگی مەعدەنووس[1]، گوڵە هێرۆ و لاسکی گیای پەلەکەرگ[2] ئەگەر بەم شێوەیە هەڵنەگیردرێن شێ و تەڕایی دەکێشن و ڕەنگ و ماکی دەرمانیان دەگۆڕێت.
- پێویستە ئەو ڕوەکانە کە بە تیشکی ڕاستەوخۆی هەتاو هەستیارن کاتی وشک کردنەوە ڕاستەوخۆ لە بەر تیشک و ڕووناکی هەڵنەخرێن وەکوو ڕەگی ڕێواسی چینی(ڕیوەند) و تووی گوڵە فیفۆکە.
- ئەگەر پلەی گەرما و ئاستی هەواگۆڕکێ هەواکێشی ژووری هەڵخستنەکە زۆر بێت، ڕووکاری دەرەوەی ئەندامی ڕوەک زۆر بەخێرایی وشک دەبێتەوە و ناوەڕۆکەکەی تەڕ دەمێنێتەوە و ناوەڕۆکەکەی دەڕزێت و ماکی دەرمانیەکەی دەبێت بە ژەهر.
- پلەی گەرمایی بۆ ڕوەکە ئەسانسدارەکان لە نێوان ٤٠ تا ٥٠ پلەی سانتیگەراد و بۆ ئالکالۆئیددارەکان لە نێوان ٦٠ تا ٧٠ پلەدا بێت. چونکە ئالکالۆئیدەکان بە گەرما خۆڕاگرترن.

---

١. *Petroselinum hortense* Hoffm. = *P. sativum* Hoffm.

٢. *Polypodium vulgare* L.

- ئەو ڕوەکانەی مادەی گلیکۆزیدیان هەیە دەکرێت لە نێوان ٥٠ تا ٦٠ پلەی گەرما و مەوادی ڤیتامینی تا ٨٠ پلەی گەرمایان پێ بدرێت.
- ئەڵبەتە با بزانین کە پلەی گەرمی سەرووی ٨٠ پلەی سانتیگەراد، مادەی کۆلۆرۆفیل شی دەبێتەوە و ڕوەک ڕەنگی بەرەو ڕەشبوونەوە دەگۆڕدرێت.
- پاش قۆناغی وشک کردنەوە پێویستە ڕوەک لە نێوان ڕێژەی ١٠ تا ١٤ لەسەدی شێ و تەڕایی هەڵبگیردرێت. تا بەئاسانی گەشەی میکرۆبەکان و خراپ بوونی ڕوەک، بۆ ماوەیەک بوەستێت.
- زۆربەی ڕوەکە ئەسانسدارەکان پاش وشک کردنەوە ڕێژەی ئەسانسەکەیان دادەبەزێت، بەڵام چەند ڕوەکێک هەن بە پێچەوانە، وەکوو گەڵای چایی، بەیبوونی ڕۆمی و قەڵەمتووس. ئەمانە پاش قۆناغی وشک کردنەوە ئەسانسەکەیان زۆرتر دەبێت چونکە بە وشکی ئەسانسەکەیان زۆرتر دێتە دەر تا لە کاتی تەڕیدا.
- هیچ کات بۆ وشک کردنەوە و هەڵخستنی ڕوەکەکان لە شوێنی گاراژ و ژووری سووتەمەنی و دووکانی دەرمانی کیمیایی بەکار نەهێندرێت چونکە بۆنی دەرمان و سووتەمەنی دەگرێتە خۆی.
- شوێنی هەڵگرتنی مەوادی وشک کراوە دەتوانرێت لە ناو شووشەی ڕەنگی یا چینی بێت و سەرەکەیان توند ببەسترێت تا دەرمانەکە کەڕوو نەهێنێت. ئەگەر شووشە و توورەکە و قوتووی ڕەنگی لە بەردەستدا نەبوون لە کەوانتەر و فایلی کانزایی هەڵبگیردرێت.
- ئەگەر مەوادی ڕوەکی وشککراوە لە کەش و شوێنێکی باش هەڵبگیردرێت ١٢ تا ١٨ مانگ هەڵدەکەن.
- ماوەی هەڵخستن بۆ گوڵ و گەڵاکان کەمترە لە لاسک و ڕەگ و سەلکەکان. چونکە هەڵخستن دەبێ وا بێت کە دوای ئەوە بتوانی ڕوەکەکە ورد بکەیت یا بیهاڕێیت.
- وەرزی هاوین بۆ وشککردنەوەی گوڵ ٣ تا ٨ ڕۆژ، گەڵاکان ٤ تا ٦ ڕۆژ و بۆ لاسک و سەلک ئەم ماوە هێندێک زۆرتر بێت. لە پاییز و بەهار ئەم کاتانە زۆرتر دەبن.
- پێویستە ڕیشە کۆکراوەکان پاش دەرهێنان لە خاک، خێرا بشۆردرێنەوە و هەرچی زیادە و جێ دەمی مێروو و دەعبای پێوەیە ببڕدرێت و سەلک و ڕیشەیەکی

پاک و پوختەی لێ هەڵبگیردرێت.

- بە شـانە و فلّچە سـەلک و ڕیشـەکان خاوێن نەکرێنەوە چونکە بۆ نموونە سملّەتیف توێکڵەکەی پڕە لە ئەسانسی ڕۆنی دەرمانی.
- بۆ وشـک کردنەوەی ڕەگ و ڕیشـە پێویسـتە شـێوازی تایبەتی هەموو ڕوەکەکان لە سەرچاوە زانستیەکان بە دەست بهێنرێن.
- هەندێ لە ڕوەکەکان وەکوو ڕکێشـە، تۆڵەکە، هێرۆ، دەسـکێشـی ڕێوی و شـلیک، ئەگەر گەڵا کۆکراوەکانی لە سـەر یەک کەڵەکە بکرێن ئەوە زوو گەرم دادێت و پێکهاتەی دەرمانی بەتایبەت گولۆکۆزیدەکان زوو لەناو دەچێت و دەفەوتێت.
- باشترین کات بۆ وشکردنەوەی گوڵ کاتی نیوەڕۆ و کەشی وشکە کە گوڵ تەواو پشکوتووە. بەیانیانە و کەشی تەڕ و شێدار کاتێکی باش نییە.
- گوڵ و چرۆ هەستیارترین ئەندامە لە وشک کردنەوەی ئەندامەکانی ڕوەک. پێویسـتە زۆر بە هەسـتیارانە کۆ بکرێنەوە و گوڵەکان نەشـەمزێن و بۆ هەڵخسـتن زۆر لە سـەر یەک کەڵەکە نەکرێن و هەتاوی زۆر کەم و زۆر گەرم نەبینن چونکە ڕەنگ دەگۆڕن و عەتر و بۆیان نامێنێ.
- بۆ وشک کردنەوە لە ئەندازە و ڕێژەیەکی کەم پێویستە لە تەیجە و نانەشانانە کەڵک وەربگرین. لە ئەندازەیەکی ١*١ مەتری یەک نانەشـان نیو کیلۆ گوڵی تازە، یا ١ تا ٢ کیلۆ گەڵای تازە یا ٢ تا ٢/٥ کیلۆ ڕیشەی تازە بەجوانی وشک دەبنەوە.
- پاش وشـک کردنەوە، گوڵ و چرۆکان لە توورەکە یا قوتوویەکی ڕەش هەڵبگیردرێت.
- بۆ وشـک کردنەوی لاسـک و گەڵا پێویسـتە هەر ١٠ لاسـک بکرێتە یەک چەپک و هەڵبواسـرێت تا وشـک بێتەوە. ئەگەر لاسـکەکان تەرچک و ناسـک بوون دەکرێت ئەوانیش چەشنی گەڵا ورد بکرێن.
- بۆ وشـک کردنەوەی تۆو باشـتر وایە بەراوەژوو هەڵبواسـرێت و لە بنیەوە قاقەزێک ڕابخرێت تا تۆوەکە کۆ بکرێتەوە.
- گەڵای ئەو ڕوەکانە کە گەورەن وەکوو هەوێدار[١] دەکرێت جیا لە لاسـک و

١. *Arctium lappa* L.

قەدەکەی وشـــک بکرێتەوە، بەڵام گەڵای ڕوەکی بچووک وەکوو نەعنا و نارنجبۆ دەکرێت بە لاسکەکەوە وشک بکرێتەوە.

- باشترین کات بۆ وشک کردنەوەی مێوە، پاش گەیشتن و پێش نەرم بوونی مێوەیە. وشـک کردنەوەی مێوە هێندێ دژوارە چونکە پێویســتە بەردەوام دیواودیو بکرێن کە کەڕوو نەهێنن.

ڕوەکە دەرمـانیەکـان ئەگەر کۆکردنەوە، وشـــکـکردن، پێچـانەوە و هەڵگرتنیـان بە شـێوازێکی شـارەزایانە و کاردروسـتانە لە وەرز و کات و شـوێنی خۆی ئەنجام نەبێت سەداسەد ڕێژە دەرمانیەکەیان دادەبەزێت یان دەگۆڕێت بە ژەهر و یان هیچ دەرمانێکی تێدا نامێنێتەوە بێجگە لە فایبر و چڵ و چێوی وشک و مەوادی بە کەڵک نەهاتوو.

ئەو شـــتانەی پێویســـتن بۆ کۆکردنەوە و هەڵگرتن و پێچانەوەی ڕوەکە کان ڕەچاویان بکەین:

- پێویستە شوێنی شینبوونی ڕوەک خاکێکی بەپیت و پەیدار بێ تا ڕوەک بە شـــێوەیەکی تەواو گەشـــە بکات و لە باری مۆرفۆلۆژی و فیزیۆلۆژییەوە تووشـــی کەمایەسی و ناتەواوی نەبێت.
- نیشـــانە و هۆکاری نەخۆشـــی و مێرووی زیانبەخش بە ڕوەکەکەوە نەبێت چونکە ئەمانە هۆکارن بۆ دابەزاندنی مەوادی پەتی دەرمانی ناو ڕوەک و ڕواڵەت و ناوەرۆکی ڕوەک تووشی گەندەڵی و ڕزین دەبێت.
- ڕەچاو کردنی کاتی کۆکردنەوەی ڕوەک (بە گوێرەی کەشـــی هەواناســـی و کاتی ڕۆژانە)
- وشـــک کردنەوەی ڕوەک لە شـــوێنێکی باش و لەبار (بەپێی پلەی گەرمایی، ماوەی هەڵخستن یان خێرایی وشک کردنەوە)
- پێچانەوە و هەڵگرتن بە شـێوازێکی دروســت و گونجاو بێت (گرینگی پێدان بە زوو هەڵمبوون و دەرچوونی زۆربەی ڕۆن و پێکهاتەی عەتری ناو ڕوەکە کان، هەروەها گەشەی کارگ و بەکتریا و جووقانی گرای مێرووەکان لە سەر ڕوەکەکان کە پاشەکەوتمان کردووە بۆ دەرمان و بەکارهێنان)
- بە دڵنیایی تەواوەوە لە ڕووی پێناسەی ڕوەکناسییەوە ڕوەکی دیاریکراو کۆ بکەینەوە. چونکا ئەگەر ڕوەک وشک کرایەوە ئیدی ناسینەوەی زۆر ئاستەم دەبێت.

کەواتە لە سەر بەستە و قوتووەکە وێنە و ناونیشانی ڕووەکناسی و شوێن و کاتی کۆکردنەوەی ڕووەکەکە بنووسرێت تا تووشی هەڵە نەبین.

## هەڵگرتنی دەرمانی ڕووەکی

پێچانەوە و هەڵگرتنی دەرمان بە شێوازەکانی خوارەوە دەبێت:

١) ڕووەکی سەوز و تازە

٢) وشککراو، قوتووکراو، شەربەتی گیراوە، گیراوەی ماجووم، بەرهەمهێنراو بە ڕێگەی گەرما و ئاورەوە (وەکوو ئاوتک و ئەسانس)

٣) دەرهێنانی مەوادی دەرمانی لە کارگەکانی پیشەسازی (وەکوو ڕۆن، شیلە، بۆن، هۆرموون، شەکر، ترش، تانێن، ڤیتامین و هتد)

## شێوازەکانی ئامادە کردنی دەرمانی ڕووەکی

- دەمکراوە: ڕێژەیەکی دیاریکراو لە هاڕاوەی ڕووەک تێکەڵاوی ڕێژەیەکی دیاریکراوی ئاوی کوڵاتوو دەکرێت و سەری قوتوو یان قاپەکە دەنرێتەوە بۆ ماوەی ١٥ تا ٣٠ خولەک، پاشان دەپاڵێوریێ و دەخورێت.
- کوڵاوەی کەم: ڕێژەیەکی دیاریکراو لە وردکراوی ڕووەک دەکرێتە ناو ١ تا ٤ لیتر ئاوی کوڵاتوو، پاشان بە ئاورێکی نەرم و کز ٥ تا ١٠ خولەک بکوڵێت. دواتر لە سەر ئاورەکەی دایدەگری تا بە جوانی دەم بهێنێت و تام بداتەوە. ئینجا دەپاڵێوریێ و دەخورێت.
- کوڵاوەی ئاسایی: کاتی کوڵانی ئەم کوڵاوەیە زیاترە لە کوڵاوەی کەم.
- خووساوە: ئەم شێوازە بۆ ئەو ڕووەکانە بەکار دەبرێت کە بە شێوازی کوڵاتن و ئاوری ڕاستەوخۆ مەوادی دەرمانیان لەناو دەچێ. بۆ خووساندنی سارد، ڕێژەیەکی دیاریکراو لە هاڕاوەی ڕووەکەکە دەکرێتە ناو ڕێژەیەکی دیاریکراوی ئاوی سارد یا شیلەوگەرم، پاشان سەری قوتوو یا قاپەکە دەنێتەوە تا ماوەی ٦ بۆ ١٢ کاتژمێر. ئینجا دەپاڵێوریێ و دەخورێت.

## ئەندامەکانی دەرمانیی ڕووەك

لە خوارەوە ئاماژە دەکرێت بە ئەندامی سەرەکی و گرینگی دەرمانی ئەندامی ڕووەکەکان:

- تۆو: شملی، ئەنیسۆن، ڕەشکە (سیاوڵە)[١]، گەرچەک، ڕکێشە باریکە، چاوبازە، زیرە، ڕازیانە، ڕێحانە و هتد
- گەڵا: گوێز، گەزگەسک، مۆرتک، جاترەتاڵە و کێویلە[٢]، پوونگە و نەعنا
- لاسک: بی، دارچین، بەڕوو و ڕۆزماری[٣]
- سەلک و بنک: ئەشەدبۆ[٤]، گوڵە فیفۆکە، گەزگەسک، نەعنا و زەردەچێوە
- ڕەگ و ڕیشە: مێکووک، گەزگەسک، ڕۆنیاس[٥]، هەوێدار و چەقچەقە[٦]
- گوڵ: گوڵەباخ[٧]، زەعفەران، گەنمەشامی، هەمیشەبەهار، بەیبوون، هێرۆ، تۆڵەکە و بی میسک[٨]
- سەرچڵە گوڵدارەکان: گوڵی گوزروان، گیازڵفە[٩]، گیاجەرگ[١٠]، شارێحانە

١. *Nigella sativa* L.

٢. جاترەکێویلە شوێنی شینبوونی لاپاڵ و نساری کوێستانەکانە و جۆرێکە لە جنسی (Thymus) و بە فارسی پێی دەڵێن (آویشن) و بە عەرەبی (سعتر)، بەڵام جاترەتاڵە هەمان جۆری ناو مێرگ و شوێنە زۆنگاوەکانە کە جۆرێکە لە جنسی (Origanum) و بە فارسی پێی دەڵێن (مرزنگوش) و بە عەرەبی (بردقوش، مردقوش، مرزنجوش)

٣. *Rosmarinus officinalis* L.

٤. *Valeriana officinalis* L.: سملەتیف، ئاورێژە

٥. *Rubia tinctorum* L.

٦. *Cichorium intybus* L.

٧. *Rosa damascene* Mill.

٨. *Salix aegyptiaca* L. var. *longifrous*

٩. *Prunella vulgaris* L. = *Brunella Vulgaris* Moench.

١٠. *Agrimonia eupatoria* L.

ڕۆمی[١] و جاترەی گەڵاباریک[٢]

- مێوە: زەیتوونە تاڵە[٣]، زەیتوون، عەناو[٤]، سنجوو[٥]، شیلان[٦]، گوێز و گوێزی هیندی[٧]
- جەوی: بنێشتە تاڵ و خۆشەی دار وەن، جەوی قەیسی و بایەم، شیرخشت[٨]، گەزۆی داربەڕوو[٩]، گەزی دارگەز[١٠]، ترەنجەبینی وشترخۆرکە[١١]، کەتیرای گەون[١٢]،

١. *Lavandula vera* DC. = *L. officinalis* Chaix.

٢. *Thymus spp.*

٣. *Melia azedarach*

٤. *Ziziphus jujube* Mill.

٥. *Elaeagnus angustifolia* L.

٦. *Rosa spp.*

٧. Cocos nucifera L.

٨. *Cotoneaster manna*

٩. گەزۆ بەرهەمی دار بەڕووی جەنگەڵەکانی کوردستان و لوڕستانە کە بە فارسی پێی دەڵێن (گز علفی و گزگزو). وەرزی کۆتایی بەهار و هاوین جۆرێک مێروو ژیانی دەباتە سەر گەڵا و لقەکانی دار بەڕوو. لە ئەنجامی هەڵمژینی شیلەی ناو گەڵا و لاسکی ئەم دارە بەهۆی ئەم مێرووە وردیلەیە، دڵۆپەی شیرینی هەنگویناسا بەتایبەت دەکەوێتە سەر گەڵاکان. بۆ کۆکردنەوەی ئەم گەزۆیە خەڵک لق و گەڵای دارەکە دەبڕنەوە و پاش کزربوونەوە و نزیک بە وشکبوونەوە دەیتەکێنن و گەزۆیەکەی هەڵدەگرن.

١٠. گەز بەرهەمی داری گەزە (*Tamarix galica*) کە مێروویەکی وردیلە بەشێک لە ژیانی دەباتە سەر لاسک و گەڵاکانی و ئەم شیلە بەرهەم دێت. بە فارسی پێی دەڵێن (گزانگبین و خشک انگبین)

١١. ترەنجەبین یا تەڕەنگوین کە بە فارسی (ترانگبین) و بە عەرەبی (ترنجبین) پێ دەڵێن کە لە ئەنجامی هەڵمژینی مێروویەکی تایبەتیە یا برینداربوونی لاسک و گەڵای ڕوەکی وشترخۆرکە (*Alhagi maurorum*) ئەم شیلەیە دەڕژێتە دەرەوە.

١٢. جیوەی گوێنی یا جەوی گەون کە بە فارسی پێی دەڵێن (کتیرا) بەرهەمی ڕوەکی هەنگەونە کە لە ئەنجامی برین یا برینداربوونی لاسکی ئەم گیایە بەرهەم دێت. نزیک بە ١٥ جۆر هەنگەون ( *Astragalus spp.*) لە وڵاتی ئێران بەرهەمی کەتیرایان هەیە. (سەرچاوە: بابەتی کتیرا لە وێبلاگی عارفیان خەڵکی شاری قۆم لای تاران، attariaref.blogfa.com)

جەوی کەماشیلە[1]، جەوی بەڕەکەما[2] و هتد

## ژمارەی ڕووەکە دەرمانیەکان

سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە لە کۆی ٣٠٠ هەزار ڕووەکی خاکی ئەم گۆی زەمینە، بانتر لە ٢٠ هەزار ڕووەک سـوودی دەرمانی و پزیشـکیان بۆ بینراوەتەوە و وتار و سەرچاوە زانستیەکانی کۆن و نوێ ئاماژەیان پێ داوە و بابەتیان لە سەری نووسـیوە. دکتۆر موزەفەریـان لە پەرتووکی پێناسـەی ڕووەکە دەرمـانی و عەتردارەکـانی ئێران زیـاتر لە ٨٥٠ جۆر ڕووەک کە لە سـەرچـاوە و پەرتووکە گیادەرمـانیەکانی یۆنـانی، ئێرانی، چینی، ئیسـلامی و عەرەبی بـابەت و ڕەچەتەی دەرمانی هاتووە، بە تەسـەل هەموو زانیاریەکانی نووسـراوە. هەندێ لە پسـپۆڕانی پزیشـکی خۆماڵی و بواری گیادەرمانی ئێران دەریدەخەن کە ئەوڕۆکە لە کۆی ٨٥٠ ڕووەک و بەرهەمی ڕووەکی دەرمانی گیادەرمانی ئێرانی و ئیسلامی دەوروبەری ١٠٠ ڕووەک و بەرهەمی ڕووەکی لە دەرمانخانە و دەرمانگەکانی گیادەرمانی بوونیان هەیە.

دکتۆر موزەفەریان ئاماژە بەوە دەکات کە لە کۆی ٨٣٠٠ جۆر ڕووەکی فلۆرای ئێران نزیکەی ٢٣٠٠ جۆر سەر بە ڕووەکی دەرمانی و پزیشکییە و دەتوانرێت وەکوو سەرچاوەیەکی گرینگ بۆ بەکارهێنانی دەرمانی ڕووەکی سوودیان لێ وەربگیردرێت. هەروەها بە بۆچوونی ئەم پسـپۆڕە گەورەیەی بواری ڕووەکناسـی و گیادەرمانی

---

١. ئەم ڕووەکە بە فارسی (باریجە، قنە و قاسنی) و ناوی لاتینەکەی (*Ferula gomusa* Boiss.) پێ دەڵێن. لە ئەنجامی جێ دەم و چزووی مێرووەکان و هەروەها بریندارببوونی لاسکی ئەم گیایە جیوەیەک بە ڕەنگی زەرد، قاوەیی یا سەوز دێتە دەرەوە.

٢. ئەم ڕووەکە بە فارسی (انقوزە، سنبنیج، سکبینج و حلتیت) و ناوی لاتینەکەی (*Ferula assa-foetida* L.) پێ دەڵێن. بە باوڕی هەندێ لە ڕووەکناسان ناوی زانستی ئەم ڕووەکە ئەمەیە (*F. persica* Willd.). شیلەی ئەم ڕووەکە لە ئێران بۆ نموونە لە دەڤەری کرمان بەشێکی گرینگ لە داهاتی خەڵک دابین دەکات و ساڵانە هەناردەی دەرەوەی دەکەن. بەگشتی دوو جۆر حلتیت هەیە: جۆری یەکەم کە بە شێوەی سروشتی لە بەینی گەڵا و لاسکەکانی سەرەوەی گیاکە دەچۆڕێت و بە ئەندازەی دەنکێ نۆک تا یەک گوێزە. ئەمەیان جۆری باش و ئەسڵە. جۆری دووهەم کە بە شێوەی دەسکرد بەشی سەرەوەی ڕەگی ڕووەکەکە چەقۆ و گازنە ئەدەن و شیلەیەکی تۆپەڵەیی دێتە دەر کە بەپێی جۆری یەکەم پلەی خوارتری هەیە.

ئێرانی هەر ڕووەکێک یەک بوونەوەری خودایيە. واتا ئێران زیاتر لە ٨٣٠٠ بوونەوەری زیندووی ڕووەکی هەیە کە هەر کام لەم بوونەوەرانە خاوەنی جەماوەری خۆیان بە شێوەی خۆڕسک و کشتوکاڵییە.

ئەگەر بۆ نموونە سەیری فلۆرای ئێران بکەین دەبینین لە کۆی ٨٠٠ جۆری ڕووەکی هەنگەون ٣٧٠ جۆری لە سنووری ناوخۆی ئێران شین دەبێ و دەکرێت وەکوو سەرچاوەیەکی پیشەیی و داهات کار لە سەر کەتیرای هەنگەون بکرێت و وەکوو بەرهەمی زەعفەران و زریشک و سنجرازی[1] کە پشکی شێری تایبەتی بواری کشتوکاڵی ئێرانە، بتوانرێت بەشێکی گەورەی بەرهەمی کەتیرای هەنگەونیش تەرخان بدرێت بە پیشەوەرانی بواری وەبەرهێنەرانی گیادەرمانی ئێران. چونکە بە بۆچوونی زانایانی ئەم بوارە زۆربەی هەنگەونەکان تایبەتمەندی بەرهەم هێنانی جیوەی هەنگەونیان هەیە. یا نموونەیەکی تر لە فلۆرای ئێران ١٠ جۆر گەنم و جۆ لە جنسی ئەم دوو ڕووەکە کە لە سنووری ئێران شین دەبێت و دەکرێت کار لە سەر تایبەتمەندیەکانی ژێنێتیکی ناو ئەم جۆرانە بکرێت بۆ بە دەست هێنانی ڕەقەم و جۆری تازەی گەنم و جۆی کشتوکاڵی و دەرمانی دیکە.

حەکیمی گەورەی پزیشکی کۆن ئەبووعەلی سینا لە کتێبەکەی[2] سوودی لە ٢٦١ ڕووەک وەرگرتووە بۆ گرتنەوە و ئامادەکردنی ڕەچەتە و نوسخەکانی ناو دەرمانیەکانی تاک و تێکەڵی قەرابادین.

## جیاوازی نێوان ڕووەکی دەرمانی[3]، دەرمانی ڕووەکی[4] و دەرمانی کیمیایی[5]

کاتێ باس لە ڕووەک دەکرێت مەبەست هەموو بوونەوەرەکانی خۆراکسازە کە

١. عەناو، عەناب

٢. قانون فی طب

٣. Medicinal Plants

٤. Herbal Medicine

٥. Pharmaceutical Drug

خاوەنی تایبەتمەندی فتۆسەنتزێن و دەتوانن وزەی هەتاو وەربگرن و بیکەن بە خۆراک، دەرمان، ماکی پیشەسازی و جوانکاری و چەقڵ و چێوی پەرژین بۆ ئامانجی بوونەوەرانی دیکە بەتایبەت مرۆڤ. کەواتە کاتێ باس لە هەندێ ڕوەکی تایبەتی دەکرێت کە سوودبەخشن بۆ دەرهێنان و دابین کردنی ماکی دەرمانی، مەبەست ئەو ڕوەکانەیە کە سوودە دەرمانیەکەیان بەرچاوترە و دەتوانرێت هاوچەشنی گوللەیەک مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت کە دوژمنی تەندروستی مرۆڤ واتا هۆکاری نەخۆشیەکەی پێ قەلاچۆ بکرێت.

هەموو ڕوەکەکان ماکی دەرمانیان تێدایە بەڵام زیاد و کەمی ئەم ماکە و هەروەها دۆزینەوەی ئەم ماکە بۆ کوشتنی دوژمنی خۆی لە جەستەدا گرینگە. کەواتە ئەگەر ئێمە ڕوەکێک چەشنی ڕوەکی دەرمانی ناناسین بە واتای ئەوەیە کە سوودی نادەرمانی دیکەی زۆرتر بەرچاوە یا ئەوەیکە هێشتا سوودی دەرمانیەکەی نەدۆزراوەتەوە.

وەک پێشینیان دەڵێن: هیچ شتێک بێ حیکمەت نەخولقێنراوە. کەواتە شینبوون و ڕسکانی هەموو جۆرە ڕوەکێک حیکمەتێکی تێدایە، بەڵام ڕەنگە ئێمە هێشتا بە ناوەرۆکی ئەم حیکمەتە نەگەیشتبێتین. یەکێ لە ئەرکە گرینگەکانی توێژەرانی گیادەرمانی ئەوەیە ڕێژەی ڕوەکە دەرمانیەکان زیاد بکرێن. چونکە لە کۆی ٣٠٠ هەزار ڕوەکی سەر ڕووی ئەم زەمینە تا وەکوو ئێستا دەوری ٢٠ هەزار ڕوەک بۆ کاری گیادەرمانی و دەرمانەکانی سەنتێتیکی کیمیاوی کەڵکیان لێ وەرگیراوە، واتا نزیک بە ٧ لەسەدی ڕوەکی دنیا سوودی دەرمانیان دۆزراوەتەوە و هاتوونەتە ژێر ڕکێفی مرۆڤ.

کەواتە ڕوەکە دەرمانیەکان پاش کۆکردنەوە، وشک کردنەوە، دابێژتن، جیاکردنەوە و پێچانەوە وەبێ هیچ دەستکاری پێکهاتەیی و بێ هیچ کەم و زیادیەک لە دووکانی گیافرۆشی و عەتاریەکان ئەفرۆشرێت. لەوانەیە لە ئەنجامی پرۆسەی کۆکردنەوە تا فرۆشتنی ڕوەکە دەرمانیەکان بەهۆی ڕەچاو نەکردنی خاڵێکی پێویست، ڕێژەی دەرمانی ناو ڕوەک دابەزێت، یان بگۆڕێت و ببێت بە مەوادی ژەهراوی و مەترسیدار. ئەو وڵاتانەی کە لە بواری زانستی گیادەرمانی زۆر پێشکەوتوون، خەڵک تەنانەت بۆ بەکارهێنانی ئاسایی و خواردنی ڕوەک پرس بە

پسـپۆڕی تایبەتی دەکەن و لایەنی پێوەندیداریش بەرپرسـیارە لە پرۆسـەی چاندنی ڕووەک تا پێچانەوە و ڕەوانە کردنی بۆ بازار، تا وەکوو خۆراک و ڕووەکێکی دەرمانی تەندروست، دڵنیا و پوخت و پاک بگاتە بەردەستی بەکارهێنەر.

نەریت و بابەتێکی هەڵەی بواری گیادەرمانی ئەوەیە کە لای هەندێ پسـپۆڕ و گیادەرمان ڕووەکی دەرمانی و دەرمانی ڕووەکی یەک بابەتە. بۆ نموونە هەندێک لە عەتاران و گیافرۆشان هەم گەڵا و گوڵ و تۆوی پوونگە وەک گیای دەرمانی و هەم بۆ سەوزی خواردن و هەم چێژەمەنی ناوچێشت دەفرۆشن. کەواتە ئەگەر عەتاران و گیافرۆشـان مۆڵەتی پیشـەیی خۆیان بزانن ڕێپێدراو نییە کە ئاوتک[1]، ڕۆن، ئەسـانس[2] و عەتری پوونگە بە مەبەسـتی ڕەچەتەی دەرمانی بفرۆشـن. چونکە فرۆشـتنی ئەم پێکهاتانە پیشـە و ئیشـی دەرمانخانە و تۆڕینگە و دەرمانگەکانی گیادەرمانی و پزیشکی خۆماڵییە.

کارگەکانی دەرمانسـازی دەرمانی ڕووەکی ماکی دەرمانی ناو ڕووەکە دەرمانیەکان دەردەکێشـن و بە شـێوە جیاوازەکانی تاک و تێکەڵ وەکوو حەب، شـەربەت، گولاج[3]، گیراوە، ماجووم، ئاوتک، ڕۆن، پێکهاتەی تێکەڵی ئەندامی چەند گیا، ئەسـانس، عەتر، شـیلە، تۆز و هتد بە دەسـتی دەهێنن و بە شـێوازی تاک یا تێکەڵ لەگەڵ مەوادی دیکەی هەمـان ڕووەک یـا ڕووەکی دیکە یـا ئەوەیکە لەگەڵ ئـاو و هەنگوین ئـاوێتەی دەکەن و دەیپێچنەوە و چەشـنی دەرمانی ڕووەک ڕەوانەی بازاڕی دەکەن. فرۆشـی دەرمانی گیایی تایبەتە بە دەرمانخانەکانی ڕووەکی و کیمیاوی بەڵام دەرمانی کیمیایی تەنیا تایبەتە بە دەرمانخانەکانی کیمیایی و پزیشکی سەردەم.

---

١. عەرەقی گیایی (Distillates): یەکێ لە بەرهەمە دەرمانییەکانی ڕووەکیە کە زۆرترین ڕێژەی بەکارهێنانی تۆمار کراوە. لە وڵاتی ئێران ئەوڕۆکە زیاتر لە ٤٠ جۆر ئاوتکی گیایی هەیە. لە ڕاستیدا ئاوتکی گیایی هەمان ڕۆن، عەتر و ئەسانسی ڕووەکە کە ئاوی پێ زیاد دەکرێت و بۆ دەرمان بەکاری دەهێنن، وەکوو ئاوتکی پوونگە، ئاوتکی هەڵاڵەسوورە و ئاوتکی شاتەرە

٢. ئەسانس (زیت عطری، Essential oil) تراوێکی ئەلکەحۆلییە کە مەوادی ڕۆنی زوودەرچووی (فرار) تێدایە. کەوابوو ئەسانس کۆمەڵێک مەوادی تێرپنی تێدایە و بە یارمەتی شێوازەکانی (تقطیر)، دەرهێنان بەهۆی مەوادی (حلال)، دەرهێنان بەهۆی تەوژم و گوشاری ساردەوە، بە یارمەتی مایکرۆڤیڤ (تقطیر) لە بارودۆخی بۆشاییدا، خووساندن و دەرکێشانی ئەسانس بە یارمەتی ڕۆنە چەسپناک و وەرگرەکان (جاذب).

٣. Capsule

له وڵاتی ئێران ڕێژەی ٩٥ لەسەدی دەرمانە گیاییەکان (واتا ١٥٠ دەرمانی گیایی) کە لە دەرمانخانە گیایی و کیمیاویەکاندا دەفرۆشرێن، پێویستیان بە وەرگرتنی ڕەچەتەی نووسراوی پزیشک نییە. تەنیا ڕێژەی ٥ لەسەدی ئەم دەرمانە گیاییانە بەهۆی دەرهاویشتە و زیانبەخشی لاوەکییان، پێویستە پزیشک دەستنیشانی بکات و ڕەچەتەی بنووسێت. کەواتە پێویستە بواری گیادەرمانی تێبینی پسپۆڕی شیاوی خۆی پێ بدرێت تا وەکوو چاوەدێری و ڕەچەتەنووسی پزیشکان لەسەر هەموو دەرمانە ڕووەکیەکان ببێت و هاوچەشنی دەرمانی کیمیاوی گرینگی و سەرنجی پێ بدرێت.

سەبارەت بە دەرمانی کیمیایی وردەکاری و زانیاری زۆرتر پێویستە. چونکە پیشەیەکی زۆر پسپۆڕییە و کارێکی هاوبەشی نێوان فیتۆشیمیست و دەرمانسازی پزیشکییە. بەگوێرەی هەمان بیرۆکەی باو لە ناو پزیشکی سەردەم کە تا قووڵایی بچووکترین ئەندامی لەش واتا خانە و مولکوول و ژێن[1] دەڕوات، دەرمانی کیمیایی پێک هاتووە لە هەڵگری مادەی سەرەتایی خانە، مولکوول یا ژێن یا وەکوو بە شێوەی مادەی گەورەتر وەکوو ترشی ڕووەک، ئەسیدئەمینە، پرۆتئین، ڤیتامین، چەوری، ئەنزیم، و هتد کە فیتۆشیمیستەکان بە وردەکاریەکی زۆرەوە ئەم مەوادانە لە تاقیگە دەرئەهێنن[2] و دەیکەن بە دەرمان. سەرچاوەی گرتنەوە و دەرهێنانی دەرمانە کیمیاییەکان بریتیە لە هەموو زیندەوەران وەکوو ڕووەک، مێروو، مار، کرم، پەپوولە، بەکتریا، کارگی خۆراکی و مایکرۆسکۆپی، ئاژەڵ، ماسی و زیندەوەرانی دیکەی ئاوژی و مەوادی کانزایی، خاکی و نەوتی.

فایتۆکیمیست مەوادی پەتی کیمیاوی ئامادە دەکات و ئینجا گرتنەوە و ساز کردنی دەرمانی کیمیاوی دەکەوێتە ئەستۆی دەرمانساز. پێویستە ماکی دەرمانی

---

١. Gen or Hereditary Factor: جین

٢. پرۆسەی سەنتێز کردن ئەوەیە کە ماکی پەتی کیمیاوی دەرمانی ناو ڕووەک یا حەیوان پێناسە دەکرێت و مولێکولەکانی ناو ماکە پەتیەکە بە تەواوی دەناسنەوە. کەواتە یا هەر بەشێوەی سروشتی ماکی کیمیاوی بۆ دەرمانەکە لە ڕووەک دەرئەهێنن یا لە ئاوێتە کردنی مولێکوولە پێویستەکان پێکهاتەی دەرمانی کیمیاوی دەگرنەوە، ئەم کارە پێی دەڵێن سەنتێز کردن و ئەو دەرمانانە کە لە ئەنجامی ئەم پرۆسەیە بە دەست دەهێنرێن بە دەرمانی سەنتێتیک یا دەرمانی کیمیاوی دەیناسن.

کیمیاوی لەگەڵ مەوادی کیمیاوی و سروشتی دیکە وەکوو گڵ، گەچ، ئێسکی ناوکەی مێوە، توێکڵی مێوە و هتد، کە سوودی دەرمانیان نییە تێکەڵ بکرێن و بە شێوەی حەب، شەربەت، کەپسوول، دەرزی، تنۆکە[1]، پشانە[2] و هتد ڕەوانەی دەرمانخانە کیمیاییەکانی بکرێن.

لە ناو دەرمانە کیمیاییەکاندا دەرمانی ڕوەکیش دەست ئەکەوێت واتا مەوادی دەستەی سەرەتایی (وەکوو ڤیتامین، ترشی ڕوەک، چەوری، ئەنزیم و شیلەی ڕوەک) بە شێوەی تاک یان تێکەڵ دەیگرنەوە و ئامادەی دەکەن. دەرمانە کیمیاییەکان بۆ ئەوەی ماوەی مانەوەیان زۆر بێت مەوادی دیکەیان وەکوو مادەی حافیزە[3] پێ زیاد دەکەن کە بێجگە لە دەرهاویشتەکانی لاوەکی مادە دەرمانیەکە ئەم مەوادەیش دەرهاویشتەی خراپی خۆی لە سەر ڕەوان و جەستەی مرۆڤ دادەنێت.

## جیاوازی نێوان کارلێکەری و کاریگەری ڕوەکی دەرمانی و دەرمانی کیمیایی

مەوادی ناو دەرمانی کیمیاوی چەشنی گوللەیە و پێویستی بە کەرەستەی چەک و دەرزی تەقاندن و کۆمەڵێک ئامێری گەورە و بچووکی دیکە هەیە تا وەکوو نیشانەی نەخۆشی بپێکێت و لەناوی ببات. بۆ دروست کردنی دەرمانە کیمیاویەکان وەکوو حەب، شەربەت، کەپسوول، دەرزی و شێوەکانی دیکە یەک یا چەندین مەوادی کیمیایی نادەرمانی وەکوو مەوادی تراوکردن، وشککردن، ڕووپۆش، شیرین کردن، مەوادی ڕاگرتن و پاراستن[4] و هتد پێ زیاد دەکەن. زۆربەی دەرهاویشتە خراپەکانی دەرمانی کیمیایی بەهۆی کاریگەری خراپی ئەم مەوادە زیادەیە. هەرچەند زۆربەی خەڵک بەهۆی کاریگەری بەهێز و خێرای دەرمانی کیمیایی لە سەر کوشتنی هۆکاری نەخۆشیەکە، گرینگی بە مەترسی و دەرهاویشتە خراپەکانی دەرمانی کیمیاوی نادەن و پشتگوێی دەخەن.

---

١. قەترە

٢. Spray

٣. Preservatives

٤. مواد حافظه، ماده نگهدارنده

پزیشــکان ســەرەڕای ئەوەی کە دەرمانی کیمیایی ڕەچەتە دەکەن ئامۆژگاری و ڕێنوێنیش دەکەن کە دەرمــانی کیمیـاوی کەمتر بەکـار بهێنن. چونکـا ئەگەر لەش بەرامبەر بە دەرمانیک خۆڕاگری نیشان دا و هۆکاری نەخۆشی بەرامبەر بە دەرمان خۆڕاگر بوو دەرمانەکە خۆی دەبێت بە کارەسـاتی دیکە بۆ تەندروسـتی جەسـتەی مرۆڤ و زیانەکانی چەند هێندە دەبێتەوە.

ماکی ناو ڕەچەتەکانی گیادەرمانی بەزۆری خاوەنی پێکهاتەی وشـک و گیراوەی خودی گیاکەیە. کەواتە ئەو گیا دەرمانیە خاوەنی دەیان ماکی خۆراکی و دەرمانی و پاڵپشــت و مەوادی نامۆیە. هەروەها دەرمانی ڕوەکیش خاوەنی چەندین مادەی دەرمانی و پاڵشت و نامۆیە. بۆ نموونە شیلە یا ئاوتکی گیای ڕازیانە دەتوانێت دەیان مادەی دەرمانی ناســراو و نەناســراوی ڕازیانەی پێکەوە هەڵگرتبێت و چەشــنی دەرمــانێکی ڕوەکی بەکـار بهێنرێت. کەواتە ڕەنگە مـادەی دەرمـانی نـاو دەرمـانە ڕوەکیەکە ئەگەری زیانبەخشـی لاوەکی هەبێ بەڵام مەوادی ناسـراو و نەناسـراوی دیکە لە ناو پێکهاتە دەرمانیەکە دەتوانێت زیانی لاوەکی نەهێڵێت یا کەمی بکاتەوە.

ســەبارەت بە جیاوازی چارەســەری دەرمانی کیمیایی و ڕوەکی لە کوشــتن و سەرکوت کردنی هۆکاری نەخۆشی لە جەستەی مرۆڤدا، چیرۆکێکی جوان هەیە کە ئەم باسە باشتر ڕوون دەکاتەوە:

پێکهاتە و ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ هاوچەشنی ژوور، ماڵ، گەڕەک، کۆڵان و ڕێگەکانی یەک شـــارە. کاتێ دوژمنێک وەکوو هۆکاری نەخۆشـــی دزە ئەکاتە ئەم شـارە، سـەرەتا ڕوو ئەکاتە شـوێنە لاواز و بێهێزەکان، و دانیشـتوانی ئەو شـوێنە یا لەناو دەبات یا ئەوەیکە داگیری دەکات و ئامادەکاری دەکات بۆ بەزاندنی بەرخودانی ماڵ و شوێنە بەهێزەکان. لێرەدا ڕووبەڕووبوونەوەی هێزی سەربازی بۆ کوشتن و دەرکردنی ئەم دوژمنە بە دوو شێوەیە:

١) گوللە و چەکی دەرمانی کیمیاوی

٢) تێکڕای خۆراک، بەرگ، هێزی پشتیوان، چەک و گوللەی دەرمانی ڕوەکی

**دەرمانی کیمیاوی:**

دوژمن هەمیشە ئەگەر شوێنێک داگیر دەکات هاوچەشنی خاوەنماڵ شارەزای قوژبن و کون و کەلەبەرەکانی شوێنەکە نییە. واتا دوژمن بە ئێجگاری شارەزای ڕێژەی هێزەکان و توانستی بەرخودانی شارەکە نییە و هەروەها لێزانی تەواوی بۆ شوێنی بۆسەنانەوەی هێزەکانی خۆماڵی و خۆجێیی شارەکەی بە دەست ناهێنێت. ئەم خاڵە کە باس کرا هەمیشە هیوابەخشە بۆ ئەوەی کە ماڵ شوێنی دوژمن نییە و بە هەموو شێوەیەک ڕێی تێ دەچێت کە دوژمن بکرێتە دەرەوە یا لە شوێنی خۆی بکوژرێت و فڕێ بدرێت و شار ئاسایش و ئارامی بۆ بگەڕێتەوە.

بەکارهێنانی دەرمانی کیمیاوی هاوشێوەی بەرەنگاری کردنە لەگەڵ دوژمنێک کە هاتووەتە ناو شارەکەمان. ئێمە بە یارمەتی هێزی دەرەوەی شار بە ئەوپەڕی توانا و وزە هێرش دەکەینە سەری و بە تانک و تۆپ و تیر پێوەی دەنێین و مەبەستمان ئەوەیە دوژمنەکە بکوژین و بیکەینە دەرەوە. لێرە خاڵێکی گرینگ کە فەرامۆش دەکرێت ئەوەیە پشت نابەستین بە هێزە خۆجێییەکانی ناوشار و سەرباز و دانیشتوانی شارەکە بەهێز ناکەین و هەروەها ڕێنوێنی خەڵک ناکەین بۆ خۆپاراستن لە بەرامبەر دوژمن کە زۆریان پێوە نزیکە. لە شێوازی دەرمانی کیمیاوی هیچ پاڵپشت و هێزێکی پشتیوان ڕەوانەی ناوشار ناکرێت و فریاکەوتن بۆ دانیشتوانی ناوشارەکە نییە، بەڵکوو تەنیا کوشتن و ماڵ و دیو ڕووخاندنە بە سەر دوژمنەکەدا بۆ ئەوەی دوژمن لە ناوشارەکە نەمێنێت و بچێتە دەرەوە. ئیتر بێ ئاگا لەوە کە ئەگەر گوللە تۆپێک یا هاوەنێک وەبەر ماڵ و دیوەخانێک بکەوێت ڕەنگە هەموو ئەو دوژمنانەی لەو ماڵە خۆیان شاردۆتەوە بکوژرێن بەڵام ماڵەکە بە زۆری وێران دەکرێت تا بە ئامانجی نەهێشتنی دوژمنەکە بگەین. زۆر جاران دوژمن تەنیا لە دیو یا ماڵێک خۆی حەشار داوە. کارێکی ژیرانە نییە کە ئەو ماڵە داگیرکراوە چەندین ماڵ و ڕێگە و شوێنی دەوروبەری برووخێندرێت تا وەکوو دوژمن قەلاچۆ بکەین و بیکەینە دەرەوە.

پاش بەکارهێنانی دەرمانی کیمیاوی کە هۆکاری نەخۆشی لە ئەندامەکانی جەستە چوونە دەرەوە یا کوژران، بەڕاشکاوی شوێنەواری کوشتن و بڕینەکە لە ئەندامی نەخۆش یا ئەندامەکانی دیکەی جەستەدا دەبینرێت. تەنیا خاڵێکە دەرمانی کیمیاوی زۆر کاریگەر کردووە بۆ کاری نەهێشتنی هۆکاری نەخۆشی، زوو لەناوبردن و کردنە دەرەوەی نەخۆشییەکەیە، بەڵام گەورەترین زیانی دەرمانی کیمیاوی بۆ

جەستەی مرۆڤ شوێنەوارە لاوەکیەکانی ئەم دەرمانەیە کە بۆ دوارۆژ کاریگەیەکانی لە سەر جەستە دەمێنێتەوە و هەروەها لاوازبوونی هێزی ناوخۆیی جەستە لە بەرامبەر هێزی گەورە و بچووکی دوژمندا. بەکارهێنانی بەردەوامی دەرمانی کیمیاوی وا دەکات هێزەکانی ناوخۆ ورەی خۆڕاگری و توانستی بەرەنگاری خۆیان فەرامۆش بکەن و هەمیشە بەهیوای هێز و هێرشی دەرەکی بن بۆ نەهێشتنی دوژمن یا ئارام کردنەوەی ناسەقامگیری ناوشارەکەیان.

## دەرمانی ڕوەکی و ڕوەکی دەرمانی:

ئامانج لە بەکارهێنانی هەم دەرمانی کیمیاوی و هەم دەرمانی ڕوەکی و ڕوەکی دەرمانی تەنیا بۆ ئەوەیە تەندروستی بگەڕێتەوە بۆ جەستەی نەخۆش و تاک ببێتەوە بە کەسێکی تەندروست.

کاتێ دوژمنی دەرەکی ڕەخنە و دزە دەکاتە ناو ئەندام یا کۆمەڵێک ئەندامی لەش پێویستە ژیرانەترین هەڵوێست بگیردرێت کە دوژمن لاواز بکرێت و جێی پێ لێژ بکرێت و بکرێتە دەرەوە بە کەمترین زیان بە ڕواڵەت و ناوەرۆکی ئەندامەکان. ئەگەر هاوشێوەی شارەکە بۆی بچین، دوژمن کاتێ بەرەو داگیرکردنی شارەکەمان هاتووە و ڕەخنەی کردووەتە ناوشار، پێویستە سەرەتا هاوڵاتیان ئاگەدار بکرێنەوە کە ئامادەباشی تەواویان هەبێت و ئاگەداری جموجووڵی دوژمن بن، هەروەها پێویستە سەربازان و دانیشتوانی ناوشارەکە بەهێز بکرێن و پشتیوانی خۆراک و بەرگ و تەقەمەنی بکرێن کە ئەوان لەناو ماڵەکەی خۆیان کە زۆر نزیکن بە دوژمنەکە، بتوانن دوژمنەکە بکەنە دەرەوە یا بیکوژن بە کەمترین زیان بە پێکهاتەی ماڵ و ڕێگە و بانی دەوروبەر. بەم شێوەیە کە ئێمە پشت ببەستین بە هێزی پارێزەر و چاوەدێر و دانیشتوانی خۆجێیی ناوشار تا ئەوەیکە هێزێکی زۆر بهێنین و لە دەرەوە هەوڵی کوشتن و دەرکردنی دوژمن بدەین.

کەواتە شەڕی دەرمانی ڕوەکیش هەر بۆ لەناوبردن و کردنە دەرەوەی هۆکاری نەخۆشیە بەڵام بە جیاوازی ئەوە کە دەرمانی ڕوەکی (و گیای دەرمانی) تەنیا خاوەنی ماکی دەرمانی نییە بەڵکوو گەلێک مادە و پێکهاتی دیکەی نادەرمانی و

خۆراکی تێدایە کە دەتوانێت هاوچەشنی پشتیوان و هێزبەخشی و یارمەتیدەر لەگەڵ ماکە دەرمانیەکە بەرەو بەرەی شـــەڕی نەخۆشـــی بچێت. هەندێ جار کە دەرمانی ڕوەکی کاریگەر و ســـەرکەوتوو دەبێت، ئەندامی نەخۆش شـــوێنەواری کاریگەری دەرمانەکەی پێوە دەمێنێت بەڵام دەرمانی بەکارهێنراو خاوەنی پێکهاتەیەک بووە کە دەوری سارێژ کردنەوە و چارەسەری زیانی دەرمانەکە دەبینێت.

## پێناسەیەکی کورت سەبارەت بە دەرمان

لە زانســـتی پزیشـــکی دەرمان[1] بە هەر مادەیەک دەگوترێ کە بۆ چارەســـەری، ئارامبەخشـــی نیشـــانەکانی ناخۆشـــی جەســـتە، دەســـتنیشـــان کردن و یا بەرگری لە نەخۆشـــی بەکار دەچێت. ماکی دەرمان لە ســـەر پێکهاتە یا کرداری ئەندامی زیندوو کاریگەری دادەنێت و پاش ئەوەی چووە ناو لەشـــی مرۆڤ یا زیندەوەری دیکە، چاکســـازی کرداری لەش دەســـت پێ دەکات. دەرمان دەتوانێت بە شـــێوەیەکی سروشتی[2] یا ناسروشتی[3] دروست بکرێت.

پســـپۆڕی کیمیـازان مـادەیەک بە دەرمـان دەزانێـت کە بەهۆی کـاریگەریە کیمیاویەکانیەوە گۆڕانکاری لە کاری زیندەوەری ئۆرگانیزمی جەســـتە یا ئەندام دادەنێت. کرداری زۆربەی دەرمان بەم شـــێوەیە کە یەک مولێکوولی مادەی دەرمان لە ســـەر یەک مولێکوولی دیاریکراوی ناو خانەی ئەندامی زیندەوەر دەنیشـــێت و ئەرکی خۆی بە جێ دەهێنێت. مولێکوولی وەرگر لە خانەی زیندەوەر ڕیســـپتۆری[4] پێ دەڵێن.

تێبینی: دەرمانە ناڕوەکیەکان بە چەندین ناوی جیاواز دەناســـرێنەوە، وەکوو دەرمانی کیمیایی، دەرمانی ناسروشتی، دەرمانی دەستساز و دەرمانی دەسکرد. ئەم دەستەواژانە هەر کام هۆکاری تایبەت بە خۆیان هەیە.

١. Drug or Medicin

٢. شێوەی سروشتی کە پێکهاتووە لە بەرهەمەکانی ڕوەک، ئاژەڵ و بوونەوەرەکانی دیکە و کانزاکان

٣. شێوەی ناسروشتی کە پێکهاتووە لە بەرهەمەکانی سەنتێزکراوی تاقیگەکان و کاری کیمیاگەران

٤. Receptor

شـوێنی سـەرەکی و کەرەسـتەی پێویسـت و پسـپۆڕانی لێزان بۆ دەرهێنان و گرتنەوەی ئەم دەرمانە، هەمان تاقیگە و بیرۆکەکانی فایتۆکیمیست و زانایانی بواری کیمیایە.

بۆ ڕوونکردنەوەی دەرمانی ناسـروشـتی و دەسـکرد و دەسـتساز پێویسـتە مێژووی دەرهێنانی مەوادی دەرمانی ناو سەرچاوەکان بزانین.

کیمیازانەکان هەر لە کۆنەوە، پێکهاتە کیمیاییەکانیان بەپێی سـەرچاوەی دروستبوونیان بە دوو دەستەی پێکهاتەی ئۆرگانیک و نائۆرگانیک دەیناسن.

- **پێکهاتە ئۆرگانیکەکان[1]:**

هەر جۆرە مادە یا پێکهاتەیەکی کیمیایی (جامد[2]، تراو[3] و گاز[4]) کە یەکێ لە مولێکوولەکانی کاربۆنە[5]. ئەڵبەت بێجگە لە کاربید[6]، ئەڵماس[7]، سـیانید[8] و ئۆکسیدەکانی سادەی کاربۆنی. سـەرچاوەی ئەم پێکهاتە لە ڕوەک و زیندەوەرانی دیکە بە دەسـت دێت. سـەرچاوەی سـەرەکی و ئەندامی سـەرەکی ئەم پێکهاتەیە پێویسـتە ئەندامی زیندوو بێت، واتا ئۆرگانیزمی زیندوو دروسـتیان دەکات. وەکوو مەوادی شەکری، ڕۆن، پرۆتئین، ترش، ئانزیم و هتد.

تا وەکوو سـەرەتای سـەدەی ١٨ زایینی، زانایانی کیمیا وایان دەزانی کە پێکهاتە ئۆرگانیکیەکان بەپێچەوانەی پێکهاتە کانزاییەکان، بە شێوازە تاقیگەییەکان (سەنتێزی)

---

١. Organic Materials
٢. Solid
٣. Fluid
٤. Gas
٥. Carbon
٦. Carbide
٧. Diamond
٨. Cyanide

ناتوانن دروســـــتیان بکەن. هۆکاری ئەم بیرۆکەیە ئەوە بوو کە کیمیازانی گەورەی سویدی Berzelius ساڵی ١٨١٥ بیرۆکەی کاریگەری هێزی زیندووی[١] دەرکرد. بەپێی بەپێی بیرۆکەی هێزی زینـدوو مەوادی ئۆرگـانیکی تەنیـا بەیـارمەتی ئەنـدام و ســەرچاوەی ژیان لە خانە و شــانەکانی ڕوەک و زیندەوەراندا دروســت دەبێت و مرۆڤ ناتوانێت مەوادی ئۆرگانیک ساز و سەنتێز بکات.

ســـالّی ١٨٢٨ زایینی کیمیـازانی ئەڵمـانی Wohler لە ڕێگەی تـاقیکردنەوەیەکی ئاســانەوە ئەم بیرۆکەیەی ڕەت کردەوە. واتا بە گەرم کردنی مادەی ئیزۆســـیاناتی ئامۆنیۆم[٢] مادەی ئۆرگانیکی ئوورە[٣] بە فرمووڵی کیمیایی (CO(٢NH)٢) دروست کرد. ئەم کارە بوو بە سەرەتای گۆڕانکاریەکی گەورە و فراوانکردنی جیهانی مادەکان بۆ داهاتووی زانستی کیمیا و پزیشـکی. ئەگەر بمانەوێت لە واتای دەرمانی دەسـکرد و کیمیایی تێ بگەین، دروست کردنی مادەی ئوورە بەم شێوە سادەترین نموونەیە.

دروســـــت کردنی مادەی ئوورە یەکەم کاری کیمیاگەران بوو کە بە شـــێوەی دەســـکرد پێکهاتەی ئۆرگانیک و زیندوویان دروســـت کرد، بێ ئەوەی هیچ ئەندام و ئۆرگانیزمێکی زیندوو دەستی هەبێت. پاش دروست کردنی ئوورە لە لایەن Wohler، کیمیـازانی فەڕەنســـی Berthelo کـاربۆن و هـایدرۆژێنی[٤] پێکەوە تێکەڵاو کرد و پێکهاتەی میتانی[٥] دروســت کرد. نموونەی دروســتکردنی ئوورە و میتانی دەســکرد، بیرۆکەیەکی تازەی ڕێک خســت کە: بۆ ســەنتێز و ئامادە کردنی مەوادی ئۆرگانیکی و کانزایی بە شـێوەی دەسکرد جیاوازیەک نییە و تەنیا بە دابین کردنی هەلومەرجی گونجاو پێکهاتە کانزایی و ئۆرگانیکەکان لە تاقیگە دروست دەکرێن.

لە پێکهاتەی مادە ئۆرگانیکەکاندا کاربۆن، هایدرۆژێن، ئۆکســـیژێن و نایترۆژێن[٦]،

---

١. Vitalisme
٢. OCN NH٤
٣. Urea
٤. Hydrogen
٥. Methane
٦. Nitrogen

هەروەها هەندێ لە توخمەکانی دیکە وەکوو هالۆژێنەکان[١]، سـوڵفۆر[٢]، فۆسـفۆر[٣] و هتد، بەرچاو دەکەون.

مەوادی ئۆرگانیکی بەپێی توخمە پێکهاتووەکانی دابەش دەبن بە:
هایدرۆکاربۆنەکان، مەوادی ئۆکسیژێندار و مەوادی نایترۆژێندار

## هایدرۆکاربۆنەکان[٤]

١) هـایـدرۆکـاربۆنی زەنجیرەیی: ئـالکـانەکـان[٥] بە فرمووڵی گشـتی $C_nH_{2n+2}$، ئـاڵکینەکـان[٦] بە فرمووڵی گشـتی $C_nH_{2n}$ و ئـاڵکینەکـان[٧] بە فرمووڵی گشـتی $C_nH_{2n-2}$

٢) هایدرۆکاربۆنی بازنەیی: سـیکلۆئالکانەکان[٨] بە فرمووڵی گشـتی $C_nH_{2n}$ و هایدرۆکاربۆنی بەنزێنی یا ئارۆماتیک[٩] کە ئەم هایدرۆکاربۆنە لە پێکهاتەی بەنزێنی ($C_6H_6$) بە دەست هاتووە

٣) پێکهاتەی ئۆکسـیژێندار: ئەم پێکهاتەیە مولیکوولەکانی کاربۆن، هایدرۆژێن و ئۆکسیژێنی تێدایە، وەکوو: ئەڵکەحوڵ[١٠]، فینۆل[١١]، ئیتێر[١٢]، ئاڵدئیید[١٣]، کیتێن یا سیتێن[١]،

---

١. Halogen
٢. Sulfur
٣. Phosphorus
٤. Hydrocarbon
٥. Alkanes
٦. Alkenes
٧. Alkynes
٨. Cycloalkanes
٩. Aromatic
١٠. Alcohol
١١. Phenol
١٢. Ether
١٣. Aldehyde

سیتێن[1]، ترش[2]، ئەستێر[3] و شەکر

٤) پێکهاتەی نایترۆژێندار: ئەم پێکهاتەیە مولێکوولەکانی کاربۆن، هایدرۆژێن و نایترۆژێنی تێدایە، وەکوو: ئامین[4]، نایتریت[5]، ئامینۆئەسید[6] و پرۆتئیین[7]

٥) پۆلیمێرەکان[8]: ئەم پێکهاتەیە خاوەنی کێشـــی مولێکوولی قورســـە. چونکە لە پێکەوەلکانی چەندین مولێکوولی ســووک پێک هاتووە و چەندین یەکەی هاوشـێوەی دووپاتەی تێدایە، وەکوو: پۆلیمێرە سروشتیەکان (سیلۆلوز[9]، نیشاستە[10]، پرۆتئیین و لاستیکی سروشتی) و پۆلیمیرە دەسکردەکان (پۆلی ئیتیلین[11]، پۆلی کۆلرۆیدوینیل[12]، ئۆرلۆن[13] (خوری دەسکرد)، بەنی دەسکرد[14]، کائۆچۆی دەسکرد[15] و نایلۆن[16].

- **پێکهاتە نائۆرگانیکەکان[17]:**

سەرچاوەی ئەمانە پێکهاتە کانزاییەکانی سروشت و خاکی زەویە.

زانســتی کیمیای کانزایی بەگشــتی لێکدانەوە و شـیکردنەوەی بیرۆکەکانی تایبەت بە کـارلێکی توخمە کـانزاییەکـان و پێکهـاتەکـانی ئەم توخمـانە دەکۆڵێتەوە (ئەڵبەت

---

١. Chitin
٢. Acid
٣. Esther
٤. Amine
٥. Nitrite
٦. Aminio Acid
٧. Protein
٨. Polymer
٩. Cellulose
١٠. Starch
١١. Polyethylene
١٢. Polyvinyl chloride (pvc)
١٣. Orlon
١٤. Synthetic Yarrn
١٥. Synthetic Rubber
١٦. Nylon
١٧. Inorganic Compound

بێجگە لە کارلێکی هایدرۆژن و کاربۆن). بە واتایەکی دیکە ئەم لقەی کیمیا کاری بە هەموو مەوادێکە بێجگە ئۆکسایدەکانی کاربۆن وەکوو مۆنۆکسایدی کاربۆن[١]، دیئۆکسایدی کاربۆن[٢]، کاربۆناتەکان[٣] و دیسۆلفیدی کاربۆن[٤].

مەوادی کانزایی بە ٤ پۆل دابەش دەبن:

١) توخمە کانزاییەکان: غازی ئەتۆمیک[٥] (وەکوو ar[٦])، غازی مولێکوولی[٧] (وەکوو $H_2$[٨])، جامداتی مولێکوولی[٩] (وەکوو $P_4$[١٠])، کانزا جامدەکان[١١] (وەکوو تەنگیستەن W[١٢])، کانزا تراوەکان[١٣] (وەکوو سیماو Hg[١٤]) و مولێکوولەکان یا جامداتی تۆڕئاسای بەربڵاو (وەکوو ئەڵماس)

٢) پێکهاتە یۆنیەکان[١٥]: بە شێوەی جامد دەبینرێن. پێکهاتەی یۆنی ساکار وەکوو (NaCl)[١٦]، ئۆکسایدەکانی یۆنی کە لە ناو ئاودا دەتوێنەوە (وەکوو $ZrO_2$[١٧]) و ئەو پێکهاتە یۆنیانە کە خاوەنی چەند یۆنی پێکەوە بەستراون (کۆمپلێکسن).

---

١. Carbon Monoxide: CO
٢. Carbon Dioxide: CO٢
٣. Carbonate
٤. Carbon Disulfide: CS٢
٥. Atomic Gas
٦. Argon
٧. Molecular Gas
٨. هایدرۆژێنی غازی
٩. Molecular Solids
١٠. White Phosphorus
١١. Molecular Inorganic
١٢. Tungsten
١٣. Molecular Fluid
١٤. Mercury
١٥. Ionic Compound
١٦. خوێ خواردن
١٧. Zirconium dioxide

۳) پێکهاتە مولێکوولیەکان: بە شـــێوەی تراو، ڕەق و غاز دەبینرێن. پێکهاتەی دوودانەیی سـادە (وەکوو $PF_۳$)، پێکهاتەی تێکەڵی کانزادار (وەکوو $PtCl_۲(PMe_۳)_۲$) و پێکهاتەی ئۆرگانیکی کانزایی (وەکوو $Ni(CO)_٤$).

٤) جامداتی تۆڕئاسا: وەکوو زۆربەی مەوادی کانزایی ناو سرووشت.

## باسی چوارەم

### ڕوەکە ژەهراویەکان[1]

هەندێ لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە نزیک بە ١٢٠ ڕوەکی ئەم جیهانە تا وەکوو ئێستا دۆزراونەتەوە کە ڕێژەی مادەی کوشندە و ژەهراویان زۆرە و پێویستە مرۆڤ زۆر بە ئاگەدارییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات و لێیان نزیک بێتەوە، بەڵام چەندین ڕوەک وەکوو ژەهراویترین و مەترسیدارترین ڕوەکی ژەهراوی لە جیهان دەناسرێن و دیاری کراون.

ئەگەر بە وردی بچینە ناو کۆمەڵەی ٣٠٠ هەزار جۆری ڕوەکی جیهان و لە هەموو تایبەتمەندیەکانی ئەم جەماوەرە بکۆڵینەوە، هەزاران خاڵی دەرمانی، خۆراکی، جوانکاری، پیشەسازی، گەشتیاری و ژەهراوی دەبینینەوە. لە بنەمادا ژەهری ڕوەکی هەمیشە خراپ نییە، چونکە ژەهر بۆ خۆی دەتوانێت دەیان و سەدان ئەرکی سەرەکی و لاوەکی جێبەجێ بکات بۆ مرۆڤ و بوونەوەرانی دیکە کە بە شێوەیەک ژیانیان بەندە بە ڕوەکەوە. ژەهری ڕوەکی دەکرێت بۆ سەرکوت کردن و قەلاچۆ کردنی بژار و مێرووە زیانبەخشەکان، و هەروەها بۆ دەرهێنانی ماکی دەرمانی تایبەت بەکار بهێندرێت.

---

١. Poisonous Plants

لە لایەکی ترەوە ئەگەر لە بەکارهێنانی هەموو خۆراک و دەرمانێک زیادەڕەوی بکرێت ئەو خۆراک و دەرمانە دەبێت بە ژەهری کوشندە، بۆ نموونە ئەگەر بڕێکی زۆر ئاو بچێتە گەدەی هەر مرۆڤێک بێگومان دەخنکێت یا ئاوبڕ دەکات یا کەسێک ئەگەر ڕێژەیەکی زۆر بنێشتی دارەوەن بخوات ناوسک و ریخۆڵەی بۆ چەند ڕۆژ دادەماڵێت و ناهێڵێت جەستەی هیچ خۆراکێک وەربگرێت و تا لێواری مەرگ دەیبات.

تایبەتمەندیەکانی چێژ، ڕەنگ، بۆ، شیرینی، ترشی، تفتی، مێخۆشی، سوێری و تاڵی مادەی خۆراکی، دەرمانی و ژەهری هەموو دەرەنجامی کاردانەوە کیمیاویەکانی ناو ڕوەکەکانە. هەموو ڕوەکێک دەتوانێت دەیان و هەزاران مادەی کیمیاوی و کانزایی تێدا دروست بێت. کاتێ ڕوەکێک خاوەنی سەد یەکەی مادەی کیمیاوییە ڕێژەی هەرکام لەو سەد یەکەیە جیاوازە، واتا لەوانەیە ٦٠ یەکە تایبەت بە یەک مادەی زیانبەخشی جەستەی مرۆڤ بێت و ٤٠ یەکە دیکە تایبەت بە دەیان مادەی خۆراکی و دەرمانی ئەو ڕوەکە بێت. کەواتە ئەگەر مادەی سەرەکی کە زۆرترین ڕێژەی مەوادی ئەو ڕوەکەی تێدایە سەر بە مەوادی زیانبەخشی مرۆڤ یا ئاژەڵەکان بێت، ئیدی ئەو ڕوەکە سەر بە ڕوەکە ژەهراویەکانە. زانایانی بواری کیمیا و دەرمانسازی هەمیشە کار لە سەر ئەوە دەکەن کە مەوادی دەرمانی ناو دەستەی ٤٠ یەکەی پاشماوەی ڕوەکی سەرەوە دەربکێشن و مادە ژەهراویەکەی لێ بسڕنەوە، یا ئەوەیکە ڕێژەی بەکارهێنانی مادە ژەهراویەکە کەم بکەنەوە و لەگەڵ مەوادی دیکە تێکەڵی بکەن و بە ئەندازە و ڕێژەی زۆر ورد و دروست و بەپێی ژەمی خواردن لە ڕەچەتە دەرمانەیەکاندا بیگونجێنن.

یاسای سەرەوە تایبەتە بە هەموو ڕوەک و ماکی حەیوانی و کانزایی سروشت. واتە بۆ نموونە گەدەی ئاژەڵان دەتوانێ هەندێ ماک و بەرهەمی ڕوەکی هەرس بکات بەڵام گەدەی مرۆڤەکان توانستی ئەم هەرسەی نەبێت. یەکێ لە جیاوازیە گەورەکانی جیهانی ڕوەک جیاوازی ڕێژەی مادە کیمیاویەکانی ناو ڕوەکەکانە. کاردانەوەی هەر کام لەم مادە کیمیاویانە لە جەستەی زیندەوەران و بەتایبەت مرۆڤ جیاوازە، بۆ نموونە: خواردنی یەک گەڵا یا ٨ بۆ ١٠ دانە تۆوی دار ژاڵە دەتوانێت مرۆڤێک تا نزیکی گیان کەنشت ببات، بەڵام ئەم ڕێژەیە بۆ مانگا ٥٠ تا ١١٠٠ میلی گرام، بۆ ئەسپ و گوێدرێژ ٣٠ و مەڕ و بزن ١١٠ میلی گرام دەتوانێت

مەرگ بهێنێته ئاراوه. دەرمانســازان كاتێ كار له ســەر دروســت كردنی ژەهر بۆ ســوودی دەرمانی دەكەن ئەم ڕێژەیه بۆ مرۆڤ چەند بەرابەر دائەشــكێنن تا بڕی دەرمانیەكەی به دەست بهێنن.

هەندێ له حەكیمانی كۆن خواردنی ژەهریان له كەمترین ڕێژه دەست پێ كردووه و خواردوویانه تا ئاســتێك كه تووشــی گێژی و نزیك به بوورانەوه و بێهۆشــی بوونەتەوه. بەم شـێوەیه ڕێژەی پێش بوورانەوه و كوشـتنیان دیاری كردووه، ئینجا ڕێژەی دەرمانیەكەیان دەســتنیشــان كردووه. نموونەیەك له كوشــندەترین ژەهری دەرمانی، ژەهری گیانداری ماره كه ئێســتاكه یەكێ له ســەرچاوه دەرمانیەكانه بۆ دەرمانسازی پزیشكی سەردەم.

نموونەیەكی دیكه دەرهێنانی مادەی دەرمانی ناو ڕوەكی هەڵاڵەســوورەیه له كارگەی گیادەرمانی شـەفا له سنه. شـەفا ڕەنگدانه ژەهراویەكانی ناو ئەم ڕوەكەیان لابردووه و ئاوتك و شیلەی دەرمانی هەڵاڵەسوورەیان بۆ یەكەم جار له گیادەرمانی ئێران به دەســت هێناوه. له حاڵەتی ئاســاییدا خواردنی گوڵ و گوڵپەڕەكانی هەڵاڵەسووره دەتوانێت مرۆڤ ژەهراوی بكات و بەرەو مردنی ڕابكێشێت.

لای زۆرێك له خەڵكی ئاسایی ڕوەكه دەرمانیەكان ئەگەر سوودی دەرمانیشیان نەبێت زەرەریان نییه. له كاتێكدا جیهانی ڕوەك ســەرەڕای ڕوەكه خۆراكی و دەرمانیه ناسراوەكان، سەدان و هەزاران ڕوەكی ژەهراوی و نەناسراوی تێدایه كه ڕێژەی مادەی دەرمانیان جیاوازه. ڕوەكه دەرمانی و خۆراكیەكان كاتێ ســوودییان دەبێت كه به شێوەی دروست و ڕێژەی دیاریكراو و كاتی پێویست بەكار بهێندرێت. ئەوڕۆكه دەرمانســازانی بواری دەرمانی ڕوەكی و كیمیاوی توانیویانه ڕێژەی ژەهراوی هەندێك له ڕوەكه ژەهراویەكان هەموار بكەن و ڕێژەی دەرمانی لێ به دەست بهێنن، وەكوو: چنارەكەڵە[١]، دەسكێشی ڕێوی[٢]، خەربەنگ[٣]، تاتووڵە[٤]، ڕێزڵە[٥]،

---

١. *Ranunculus spp.*

٢. *Digitalis purpurea*

٣. *Hyoscyamus niger*

٤. *Datura srtamonium*

٥. *Solanum nigrum*

ژاڵە[1]، گوڵە فیفۆکە[2]، هەڵاڵەسووورە[3]، گوڵەواژ[4]، خوشیلک[5]، چاو سوێسکە[6]، مامیران[7]، گەرچەک[8]، شـــەوکەرانی ئاوی[9]، هەلایهەل[10]، تاڵگە چاوزەردە[11]، براکیوار[12]، گوڵە بەفر[13]، مێخوڕ[14]، یەزانپەرەس[15]، داری لیش[16]، گوڵە زوڕنا[17] و پەلەکەرگی نێر[18].

زۆربەی ڕووەکەکان بەپێی وەرزی گەشـــە، ئەندام، شـــێوازی بەکارهێنان و کاتی بەکارهێنان دەتوانن توانست و کاریگەری ژەهراوی بوونی خۆیان بسەلمێنن.

ئەگەر ســـەیری ســـروشـــت بکەین دەبینین هەندێ لە ڕووەکەکان خاوەنی دڕک و کوڵـک و گەڵا و لاســـکی تیژن تـا وەکوو بتوانن پێش بە خواردنیـان لە لایەن ئاژەڵەکانەوە بگرن. هەندێ لە ئاژەڵەکان توانایی ئەوەیان هەیە کە تیژترین دڕکەکان وەکوو کیوار و کەنگر بخۆن. پێکهاتەی دەروونی هەندێ لە ڕووەکەکان هاوشـــێوەی دەرەوەیان دەتوانێت تیژ و ژەهراوی بێت و بەم شـێوە مانەوەی خۆی لە سـروشـت بپارێزێت. مەوادی کیمیایی و ژەهراوی دوای مەوادی سەرەتا (شەکر و ئۆکسیژن و چەوری و کـانزاکـان) دروســـــت دەبن بۆیە پێیـان دەڵێن پێکهـاتەکـانی دوایی یـا

---

١. *Nerium oleander*
٢. *Colchicum spp.*
٣. *Papaver somniferum*
٤. *Hedra helix*
٥. *Euphorbia spp.*
٦. *Actaea pachypoda*
٧. *Chelidonium majus*
٨. *Ricinus communis*
٩. *Cicuta maculata*
١٠. *Aconitum ferogulla*
١١. *Centaurea solstitialis*
١٢. *Cirsium arvense*
١٣. *Convollaria majalis*
١٤. *Rhamnus kurdica*
١٥. *Aquilegia olympica*
١٦. *Strychnos nux-vomica*: آذاراقی، کچوله
١٧. *Brugmansia spp.*
١٨. *Dryopteris filix-mas*

دووهەمی. زۆرینەی ئەم مەوادە دواییانە پێویســـت نین بۆ گەشـــەی ڕووەک بەڵکوو دەتوانێت سوودی خۆراکی و دەرمانی یا وەکوو بۆ خۆپاریزی ڕووەک بێت.

ڕووەک دەتوانێـت مەوادی دوایی (پێکهـاتەی دووهەم) بۆ چەنـد مەبەســـتی تەواوکاری بەکار بهێنێت:

- مەوادی پاشخان و پاشەکەوتی ڕووەکی
- دروست کردنی ڕەنگدانە و پاریزەری ئاستی گەشەی ڕووەک
- ناخۆش کردنی چێژی ڕووەک
- هەندێ لە ژەهرەکان وەکوو ئاڵکالۆئید، گولۆکۆزینۆلیت و ســـاپۆنینەکان چێژێکی تاڵ ئەدەن بە ڕووەک
- هەندێکی دیکە لە ژەهرەکان وەکوو تێرپینەکان[١] چێژی تاڵ ئەبەخشـــن بە ڕووەک
- هەروەها پێکهاتە فینۆلیەکان[٢] کە تایبەتمەندی گرس و گیری هەیە و مرۆڤ یا وەکوو ئاژەڵەکان کە دەیخۆن قەبز دەبن.

### چەند نموونە لە پێشهاتەکانی خواردنی ڕووەکە ژەهراویەکان

١) هەلالەســـوورە: خواردنی ئەم ڕووەکە دەبێتە هۆی تێکچوون و شـــێواندنی کرداری کۆئەندامی هەرســـی جەســـتە. چەندین مـادەی ژەهراوی، دەرمـانی و موخەدەرات لە نـاو ئەم ڕووەکەدا دۆزراوەتەوە وەکوو ڕۆئیـدین[٣]، کۆدۆئین[٤]، نۆسکاپین[٥] و مۆرفین[٦].

---

١. Terpene
٢. Phenol
٣. Rhoeadine
٤. Codeine
٥. Noscapine
٦. Morphine

٢) خەربەنگ: ئەم ڕووەکە مادەی ژەهراوی هیۆسـیامین[١] و ئاترۆپینی[٢] تێدایە کە زۆر مەترسیدارە.

٣) دەسـکێشـی ڕێوی یا ورەگیا: گەڵا و تۆو و گوڵە جوانەکانی ئەم ڕووەکە ژەهراوین. دەرمانسـازان لە گوڵەکانی ئەم ڕووەکە دەرمانی نەخۆشـی دڵ دروسـت دەکەن. بۆیە خواردنی هەر کام لە ئەندامەکانی ورەگیا دەتوانێت مرۆڤ تووشـی نەخۆشـی دڵ بکات. کاریگەریەکانی خواردنی ئەم ڕووەکە بریتیە لە ترپە و لێدانی نارێکی دڵ، بەدهەرسـی و سـەرگێژە. گەڵای بەشـی سـەرەوەی لاسـکی ئەم گیایە زۆرتر مەترسـیدارە. لەوانەیە بە خواردن و چێژتنی یەک گەڵای ورەگیا مرۆڤ تووشـی مەرگ بێت. نیشـانە سـەرەتاییەکانی خواردنی ئەم ڕووەکە بریتیە لە دڵ پێکدادان، ڕشـانەوە، کەمبوونەوەی ئارەزووی خواردن، ژانی ناوسـک و ڕیخۆڵە، وڕێنەکردن و ژانەسەری توند.

٤) چاوسوێسکە[٣]: بەری ئەم ڕووەکە پڕە لە ژەهری کوشندەی cardiogenic کە دەبێتە هۆی هێوربوونەوەی خێرای ماسـولکەی دڵ. کەواتە لێدانی دڵ زۆر کەم دەبێتەوە و دڵ بەرەو وەستان دەچێت.

٥) گوڵە سـۆتکە[٤]: پیازەکانی ئەم ڕووەکە پڕە لە پێکهاتەی ژەهراوی. مرۆڤ بە خواردنی پیازی ئەم ڕووەکە تووشـی دڵ پێکدادان، ڕشـانەوە و ڕەنگە مەرگی کۆتایی بێت.

٦) زەمبەقی زەرد[٥]: ئەم ڕووەکە گوڵێکی جوان و زەردی هەیە و لە ناو زەلکاو و گۆلاوەکاندا شـین دەبێت. ئەم زەمبەقە مادەی گولۆکوزیدی ئیریدینی[٦] هەیە و دەتوانێت ڕەوانکارێکی زۆر بەهێز بێت و ئەگەر زۆری بخورێت کاری کۆئەندامی هەرس تێک بدات. نموونەیەک لە نیشـانەکانی ژەهراویبوون بەم ڕووەکە لە مرۆڤدا

---

١. Hyoscyamine
٢. Atropine
٣. *Actaea pachypoda*
٤. *Hyacinthus orientalis*
٥. Iris florentina
٦. Iridine

ئەمانەن: سووتانەوەی زار و گەروو، دڵ پێکدادان، سکچوون و ناوسک ئێشە.

٧) گەرچەک: زۆر کەس گەرچەک وەک گیایەکی جوانکاری بەکار دەهێنێت و تەنانەت بۆ دەرهێنانی ڕۆنی گەرچەک چەشنی ڕووەکێکی کشتوکاڵی سوودی لێ وەردەگرن، بەڵام تووی گەرچەک چەندین ئالکالۆئیدی وەکوو ریسین[١] و ریسینین[٢] تێدایە کە خۆشبەختانە ئەوڕۆکە ئەم ژەهرانە لە ڕۆنی گەرچەک لا دەبەن و ڕۆنێکی دەرمانی لێ بە دەست دەهێنن. هەروەها پێستی مرۆڤ هەستیارە بە تووی گەرچەک و خواردنی دەبێتە هۆی هەناسەتەنگی و لیر و زیپکەی زۆر.

٨) یاس[٣]: خواردنی هەموو ئەندامەکانی ئەم ڕووەکە ژەهراویە و دەبێتە هۆی دڵ پێکدادان و ڕشانەوە. ئەم ڕووەکە ئەگەر لەگەڵ هەنگوین بخورێت مەترسیدارترە. شیلەی یاس دەبێتە هۆی خوران و ئاڵۆش لە سەر پێست. ژەهراوی بوونی ئەم ڕووەکە لە منداڵاندا زۆرترە.

٩) شەوکەران ئاوی: ژەهراویترین ئەندامی ئەم ڕووەکە ڕەگ و ڕیشەکانیە. ئەم گیایە بەهۆی کۆپەڵە گوڵە سپیەکانی زۆر جار لەگەڵ گێزەری کێوی بە هەڵە دەکرێتەوە. تایبەتمەندی ژەهراوی بوونی ئەم ڕووەکە بۆ ئاژەڵان زۆرترە. شەوکەرانی ئاوی ژەهراویترین ڕووەکی ئەمریکای باکوور گوزارشت کراوە. ڕەگەکانی شەوکەران مادەی کوشندەی convulsant cicutoxin تێدایە. مادەی ژەهراوی Coniin لە بنەماڵەی ئالکالۆئیدەکانە و زۆر ژەهراویە. ڕووەکی تازە و نەگەیشتووی ژەهراویترە. ڕێژەی ٠/٥ تا ١ میلی گرامی دەتوانێ مرۆڤ بکوژێت. چونکە ڕاستەوخۆ کار لە سەر ڕێکخستنی مێشک دەکات و دوایی کۆئەندامی هەناسە دەوەستێنێت. ڕۆژگارانی کۆن شەربەتی شەوکەرانیان بە مەحکوومانی مەرگ ئەدا. تەنانەت سوقراتی حەکیم ئەم شەربەتەی خواردەوە و مرد.

١٠) ڕێواس: گەڵا پانەکانی ڕێواس خاوەنی ترشی ئۆگزالاتن[٤] کە خواردنی بۆ مرۆڤ مەترسیدار و کوشندەیە.

---

١. Ricin

٢. Ricinine

٣. *Gelsemium sempervirens*

٤. Oxalate acid

١١) تاتوولە: ئەم ڕووەکە لە بنەماڵەی پەتاتە و ڕێزڵەیە. شـیلاوی ناو لاسـکەکانی تـاتوولە ئەگەر بکەوێتە چـاو دەبێتە هۆی نـابینـایی و تـاریکبوونی گلێنەی چـاو. حەکیمـانی کۆن بۆ سـوودی دەرمـانی تـاتوولە، کولاوەی ئەم ڕووەکەیـان داوە بە هەندێ لە نەخۆشـان. چونکە دەمارەکانی نەخۆش بۆ ماوەیەکی کورت بێ هەسـت دەبن. خواردنی زۆر لە کولاوەی ئەم ڕووەکە دەبێتە هۆی مەرگی نەخۆش.

تاتوولە جۆرێک ئالکالۆئیدی ژەهراوی تێدایە کە پێکهاتەی مێشک و دەمارەکان لە کار دەخات و خواردنی دەبێتە هۆی ناوسکە ئێشە، ئیفلیجی، کوێری تەواو، دووبینی، خەیالاوی بوون، شـێتی و مەرگی کوتـایی. سـوورپێسـتـانی ئەمریکا بەهۆی ژەهراویبوون و مەترسـیداری ئەم ڕووەکەیان بە سـێوی شـەیتان ناودێر کردووە. هەروەها باوڕیان وابووە کە تاتوولە جادووگەرەکان بۆ نیشـاندانی سـیحر و جادوو کۆ دەکاتەوە.

بە گشـتی ڕووەکی تاتوولە چەندین ئالکالۆئیدی ژەهری تێدایە وەکوو داتوورین[١]، ئاترۆپین[٢]، هیۆسـیامین و ئاسـکۆپۆلامین[٣]. ژەهری ئاترۆپین لە زۆربەی ڕووەکە ژەهراویەکاندا هەیە و بڕی ٥ تا ١٠ میلی گرامی دەتوانێ مرۆڤ بکوژێت. ئەم مادە ژەهراویە دەمارە پاراسەمپاتیکەکان ئیفلیج و لێدانی دڵ زۆر دەکات.

١٢) گەزگەسک[٤]: لاسک و گەڵای گەزگەسک دەتوانێت ژان و ئالۆشێک لە سەر پێسـتی مرۆڤ دروسـت بکات. ئەڵبەتە بۆ دەرمانی ژان و ئالۆشـی گەزگەسـک بەکارهێنانی گەڵای گیای بوگەنە بەسـوودە. خاڵێکی سـەرنجڕاکێشـی لە سـروشـت ئەوەیە لە زۆربەی دۆڵ و دارسـتانەکان کە گەزگەسـکی هەیە ڕووەکی بۆگەنەیش شین دەبێت.

١٣) هەلایهل[٥]: ڕەگ و گەڵا و میوەی ئەم ڕووەکە ژەهرێکی فراوانی تێدایە و بە سـێبەر و شـەو و تووی شـەیتان دەیناسـن. مرۆڤ لەگەڵ خواردنی ئەم ڕووەکە

١. Daturine
٢. Atropine
٣. Scopolamine
٤. *Urtica dioica*
٥. *Atropa belladonna*

دەسبەجێ تووشی تێکچوونی کاری دڵ و هەناسە دەبێت. جان جەرارد نەشتەرگەر و ڕووەکناســـی ســـەدەی شـــازدەی زایینی ئەم ڕووەکەی زۆر ترســـناک و ژەهراوی ناودێر کردووە. دەگێڕنەوە کە ساڵی ١٥٨٢ هێزەکانی پاشای ئێسکاتلەند بە یارمەتی گیراوەی هەلایهل شەو هێرش دەبەنە سەر هێزی دانیمارک و هەموویان دەکوژن.

١٤) گوڵی نێرگز: ئەم گوڵە جوان و ســـپی و بۆنخۆشـــە ئەگەر ڕێژەیەکی زۆری لێ بخورێت مرۆڤ تووشـــی مەرگی کۆتایی دەکات. خواردنی پیازی نێرگزی زەرد دەتوانێت ببێتە هۆی دڵ پێکدادان، سکچوون و دڵئێشە.

١٥) ژاڵە: ئەم ڕووەکە بە تایبەت لە منداڵاندا زۆرترین ڕێژەی ژەهراویبوونی هەیە. گەڵا و گوڵ و تۆوەکانی سەرچاوەی ژەهرن. چەندین شێوەی ژەهراویبوون بە ژاڵە ئاماژەی پێ دراوە وەکوو بۆ کردنی دووکەڵ و هەڵمی ســـــووتانی لق و پۆی ژاڵە، خواردنی گۆشت و کەبابێ کە بە چیلکە یا شیشی ژاڵە برژابێت، خواردنی شلەیەک کە بە ئاوری دار ژاڵە لێنرابێت، هەروەها هەنگێکە لە ســـەر گوڵی ژاڵە هەڵنیشـــتبێت و هەنگوینەکەی کەسێک خواردبێتی.

١٦) گوڵی داویتی[١]: ئەم گوڵە لە جیهاندا ١٠٠ تا ٢٠٠ جۆری هەیە. باخەوان و گوڵدارەکان بۆ ئەوە کەرویشـک نزیکی باخ و گوڵخانەکەیان نەکەویتەوە گوڵە داویتی دەچێنن. ئەم گوڵە تـایبەتمەنـدی ژەهراویبوونی هەیە بۆ مرۆڤ. پســـــپۆڕانی کیمیا هەندێ سماتی قڕکەری گیابژارەکان لەم گوڵە دروست دەکەن. خواردنی ئەم ڕووەکە دەبێتە هۆی ئاڵۆش و ئاوسانی پێستی جەستە.

١٧) کەکرە[٢]: ئەم ڕووەکە گیابژاری زۆربەی باخ و تەرەکاڵی و بیســـــتانەکانە. ئەســـــپ و گوێدرێژ ئەگەر زۆری بخۆن گەدەیان ژەهراوی دەبێت. ژەهری Repin تایبەتی ئەم ڕووەکەیە و دەتوانێت کاری مێشک بشێوێنێت.

١٨) ڕیزڵە: ئەم ڕووەکە لە بنەماڵەی تەماتە و پەتاتەیە و گیابژارێکی ناو دێیەر و بیســـتانەکانە. بەرێکی ورد و بە ئەندازەی براڵووکێ دەگرێت بە ڕەنگەکانی ســـوور،

---

١. *Chrysanthemum morifolium*

٢. *Acroptilon repens*

زەرد و ڕەش. چەندین ئالکالۆئیدی ژەهراوی وەکوو ڕۆتین[١]، تانین، لینۆلئیک[٢]، سۆلانین[٣]، پالمیتیک ئەسیدی[٤] تێدایە. دەرمانسازان ئالکالۆئیدی سۆلاسودین[٥] لە ناو ئەم ڕوەکە بۆ چارەسەری هەندێ لە نەخۆشیەکان بەکار دەهێنن.

**١٩)** مرۆر[٦]: ئەم ڕوەکە سەر بە بنەماڵەی مێخەکە و گیابژاری ناو جارە گەنم و جۆیە. دەنکی تووەکانی گەنمی ئارد تاڵ و ژەهراوی ئەکا. ئەم ڕوەکە مادەی ژەهراوی تری تێرپین[٧]، ساپۆنین و جیتاژنینی[٨] هەیە کە هەم بۆ مرۆڤ و هەم ئاژەڵەکان ژەهراوی دەکات.

**٢٠)** گوڵە فیفۆکە: تەواوی ئەندامەکانی ئەم ڕوەکە مادەی دەرمانی و ژەهراوی کۆلشیسینی هەیە کە زۆر خواردنی دەبێتە هۆی تێکچوونی خوێن و دڵ و هەڵوەرینی موو.

بەگشتی سروشتی کوردەواری خاوەنی چەندین ڕوەکی ژەهراوییە کە پێویستە هەموومان زۆر بەزانستەوە ئاگەداری بەکارهێنانی ئەم ڕوەکە ژەهراویانە بین. لە خوارەوە نموونەی چەندین ڕوەکی ژەهراوی کوردستان ئاماژە پێ ئەکەین:

گیابۆگەنە[٩]، ژاڵە، ولێرە (جۆرێک کەلکە)[١٠]، چنارەکەڵە، تاتووڵە، تیروو[١١]، گەزگەسک، دەسکێشی ڕێوی (ورەگیا)، هاز (جۆرێکی)[١٢]، ماميران، خەربەنگ، پوونگە

---

١. Rutin
٢ Linoleic
٣. Solanin
٤. Palmitic acid
٥. Solasodine
٦. *Agrostemma githago*
٧. Triterpene
٨. Githagenin
٩. *Sambucus nigra*
١٠. *Lathyrus spp.*
١١. *Daphne mucronata*
١٢. *Arum spp.*

(جۆرێک)[١]، گوڵە فیفۆکە، نێرگز، گوڵە دیاری[٢]، مەلەوێچە[٣]، ڕێزڵە، هەلاهەل، شـــادانە[٤]، شاتەڕە، چاوسوێسکە، هەڵاڵەسوورە، شەوکەران، تەماکۆی کێوی[٥]، یاسەمەنی زەرد (یاس)، خوشیلک و هتد.

## باخی ڕووەکە ژەهراویەکانی ئالنویك[٦]

لەوانەیە کاتێ ســــەرناوی باخی ئالنویکی شـــاری نۆرس ئامبێرلەندی[٧] بریتانیا بکەوێتە بەرگوێمان، دیمەنی باخێکی پڕ گوڵ و گیای ڕەنگاوڕەنگ و میوەی شــیرین و خۆشـــتام بێتە بەرچاو، بەڵام خەڵکی شـــاری نۆرس ئامبێرلەند بە جۆرێکی دیکە سەیری باخی ئالنویک دەکەن.

باخی ئالنویک دار یا گوڵێکی تێدا نییە کە خەڵک بتوانێت دەســـتیان پێوە بدات یا میوە و پەڕەی گوڵێکیـان بخوات. چونکە بە کەمترین هەڵە ڕەنگە ژیـان بکەوێتە مەترســـی و مەرگ پێشـــوازی لێ بکات. ئەم باخە لە ســـەر قەڵای ئالنویکی نۆرس ئامبێرلەند دامەزراوە و پێشـینەی دەگەڕێتەوە بۆ سـالی ١٧٥٠ زایینی. دامەزرێنەرانی ئەم باخە هەوڵیان داوە مۆزەخانەیەکی سروشتی لە سەرجەم ڕووەکە ژەهراویەکانی بریتانیا و جیهان دروست بکەن. تا وەکوو ئێسـتا ١٠٠ جۆر ڕووەکی تەواو ژەهراوی بە ڕەچاو کردنی ســــەرجەم تێبینی و تێڕوانینەکان چاندراون و بەخێو دەکرێن. لە حاڵەتی ئاسـاییدا یاسـای زۆربەی وڵاتان ڕێگە بە چاندن و بەخێو کردنی ئەم ڕووەکە ژەهراویانە نادەن.

لە سەر دەروازەی سەرەکی ئەم باخە نووسراوە: «ئەم ڕووەکانە توانایی کوشتنی

---

١. *Mentha spp.*

٢. *Glaiolus atroviolaceus*

٣. *Convolvulus arvensis*

٤. *Cannabis sativa*

٥. *Arnica montana*

٦. The Alnwick Garden

٧. North Amberland

مرۆڤەکانیان هەیە». لە شـــەڕی دووهەمی جیهانیدا حکوومەتی بریتانیا دار و گوڵەکانی ئەم باخەی بڕی و داری میوە و ســـەوزەیان چاند. ســـاڵی ٢٠٠٥ دیسـان بناغە و دیبەرەکانی ئەم باخە ژەهراویە ئاوەدان کرایەوە و دەســـتیان کردەوە بە چاندنی ڕوەکە ژەهراویەکان.

ســـاڵانە هەزاران گەشـــتیار و خوێندکار و توێژەری بواری دەرمانســـازی و ڕوەکناسی سەردانی ئەم باخە دەکەن. لە ســەرانســەری ئەم باخە تابلۆ و نیشانەی مەرگ و مەترســـی هەڵواســـراوە و کارمەندان و گەشـــتیاران بەردەوام ئاگەدار دەکرێنەوە. دروشـــم و پەیامی دامەزرێنەرانی ئەم باخە بەرەنگاری لەگەڵ مادە هۆشـــبەرەکانە. چونکە زۆربەی ئەم ڕوەکە ژەهراویانە مادەی هۆشـــبەر و ســەرخۆشکەریان تێدایە. زۆربەی مەوادە ژەهراویەکانی ناو ڕوەکەکان لە دەستەی مەوادی ئالکالۆئید، ترشە ئۆرگانیکەکان، ڕێزین، مەوادی کانزایی و ئەلکەحۆلە.

## باسی یەکەم

### دەسپێکی دۆزینەوەی دەرمان و چارەسەری سروشتی

ئەگەر لە ڕووی ڕوانگەی حەکیمانی پزیشـکی کۆنەوە بگەڕێین بۆ بنەمای بابەتی گرینگی دەرمـان، فەلسـەفەی دەرمـان زۆر بە ئاسـانی بۆمـان ڕوون دەبێتەوە. حەکیمـانی کۆن ڕێنوێنیـان کردووین کە ئـاگەداری خـاڵ و سـنووری مەزاجی سروشتیمان بین. کەواتە بە هەر شێوەیەک کە ئەم مەزاجە سروشتیە ئەشێوێنین بە یـارمەتی شـێوەی بەرامبەری چـاکی بکەینەوە و زیـاتر بەرەو لای ترازان نەچین بەڵکوو هەوڵ بـدەین بگەڕینەوە و تـا ئەو جێگە دەتوانین نزیکتر بینەوە لە خـاڵی مەزاجە سـروشـتیەکە. بۆ نموونە ئەگەر وەرزی زسـتانە و دەزانین کەش و هەوا سـاردە و سـروشـتی زسـتانیش سـاردە. ئەگەر ئێمە خاوەنی مەزاج سـارد بین، پێویسـتە زۆرتر بەرەو لای بەکارهێنان و خواردن و وەرگرتنی بابەت و خواردنی سـروشـت گەرم بین ئەگینا تاو لە پشـت تاو زسـتانی سـارد کاریگەری دائەنێت و مەزاجی سـاردی ئێمە زۆرتر بەرەو لای سـاردی دەکێشـێت و خاڵی مامناوەند و سروشتی مەزاج ئەترازێت و ئەو نەخۆشیانە کە بەهۆی ساردیەوە چەکەرە دەکەن لێرە بە زۆری خۆیان نیشان ئەدەن.

تێگەیشتن لە سەر بابەتی سەرەوە دەتوانێت بەرچاوڕوونیەک بدات بە ئێمە کە مرۆڤ سەرەتا چلۆن مامەڵەی کردووە لەگەڵ بابەتی نائاسایی دەرد و ژان و برین. ئاسانترین و سادەترین وڵام ئەوەیە ئەگەر مرۆڤ قامکی بە بەردەتیژێک بریندار بووە یەکەم کارێک کە کردوویە قامکی دەستی دیکەی لە سەری داناوە تا وەکوو خوێنی لێ نەچۆڕێت یا ئەوەیکە ئەگەر بەهۆی ماندووییەوە پشت و شانی جەمام بووبێت هەوڵی داوە دەستی ببات هێندێ سەرشان و ماسوولکەی پشتی بماڵێت و ماسوولکەکانی گەرم بکاتەوە تا خاو ببنەوە و ژانی بشکێت.

لە لایەکی ترەوە بابەتەکانی هاوبەشی نێوان بوونەوەران و لەو نێوانەدا مرۆڤەکان، دەتوانێت بمانباتە سەر خاڵێکی تر بۆ ڕەمزی دۆزینەوەی دەرمان. لە بابەتەکانی پێشوودا باسمان لە ڕیزبەندی ژیان، پێشکەوتنی قۆناغەکانی ژیان و بازنەی خۆراکساز و خۆراکخۆرەکان لە بەکتریا، ڕوەک، حەیوان و پاشان مرۆڤەکان کرد و بۆمان ڕوون بووەوە کە بنەمای نزیکایەتی نێوان بوونەوەرەکان بەتایبەت ڕوەک و مرۆڤ هەمان خۆراکە.

مرۆڤ بەشێکی بەربڵاوی ژیانی پاش ئاو و هەوا بەندە بە بوونی بەروبوومەکان و خۆراکی ڕوەکییەوە. تەنانەت زۆربەی پسپۆڕانی مێژووی بنچینەی مرۆڤ، باس لەوە دەکەن کە مرۆڤ سەرەتا گیاخۆر بووە دوایی بووە بە گیاخۆر – گۆشتخۆر. بۆ سەلماندنی ئەم بیرۆکەیە پێکهاتەی ددان و گەدە و ڕیخۆڵەی مرۆڤ، ڕەنگە گەورەترین بەڵگەی گیاخۆری مرۆڤ بێت.

ڕوەکەکان خاوەنی زۆرترین ڕێژەی جۆراجۆری تام، بۆ، ڕەنگ و وزەی خۆراکین. هەموو جۆرەکانی ڕوەک تام و ڕەنگ و بۆ و وزەی تایبەت بە خۆیان هەیە و دوو جۆری ڕوەک کە ئەم شتانەیان هاوشێوە بێت، لە سروشتدا نابینرێن. ئەم جیاوازیە بەربڵاوە هەمیشە مێشکی مرۆڤەکانی بۆ ئەو لایە هان داوە کە بۆ نموونە کام چێژ لە کام ڕوەک ڕێژەی خۆشیەکەی زۆرترە یان پاش ئەم ڕێژە خۆشیە جەستە و ڕەوانی مرۆڤ بەرەو چ گۆڕانکاریەک دەچێت. بەم شێوەیە بنەمای جیاوازی نێوان پێکهاتەکانی ناو ڕوەک (چێژ، ڕەنگ، بۆ و وزە) دامەزراوە.

ئەگەر کەسێک یەکەم جار پاش زۆر خواردنی شلیک یا سەلکی هاڵیکۆک تووشی سکچوون بووبێت، بۆ جاری دووهەم یا کەمی خواردووە یا بیری لەوە کردووەتەوە

کە کاتێ تووشی گرسی و قەبزی ناوسک بوو ڕێژەیەک شلیک و هاڵیکۆک بخوات تا کێشەکەی چارەسەر بێت. یا ئەگەر پاش هەڵمژینی بەرامە و بۆی گوڵەباخ و سوێسنە هەستی بە ئارامی مێشک و ئاسوودەیەکی دەروونی کرد، ئەم ئەزموونە لە یادی خۆیدا هەڵدەگرێت و کاتێ کە هەستی بە نائاسوودەیی و وەڕەزی مێشک کرد هەوڵ ئەدات دەستوویەک گوڵەباخی سەر پەرژین یان سوێسنەی ناو مێرگان هەڵگرێت و بۆنی هەڵمژێت و ئەزموونی پێشووی دووپات بکاتەوە. هاوشێوەی بە دەست هێنانی ئەم ئەزموونانە، سەدان و هەزاران ئەزموون لای تاکەکانی بنەماڵە و هۆز و نەتەوە وردە وردە دروست بووە تا وەکوو گواستنەوە و ئاڵوویێری ئەزموونەکان دەستی پێ کردووە و مرۆڤ پێگەی نرخ و سوودی ئەزموونەکانی دەرمانی و ئازارشکێنی و هەتوانی سارێژ و تیماری بۆ دەرکەوتووە و پێویستی بەوە بووە ئەم ئەزموونانە هەڵبگرێت و لێیان بکۆڵێتەوە و لە سەریان بنووسێت و بۆ کەسانێک کە لێی نازانن ڕێنوێنیان بکات و بیکات بە ڕەچەتە بۆیان.

هەندێک باس لەوە دەکەن کە سەرەتای دۆزینەوەی دەرمان، دەگەڕێتەوە بۆ چاولێکەری مرۆڤ لە بوونەوەرانی دیکە لە کاتی ڕووداوی نەخۆشی و برینداربوونی ئەم بوونەوەرانە. بۆ نموونە کەوی کوێستان کاتێ باڵ یا لاقی دەشکێ، ئەچێتە بن دارە وەن و بە دەندووکی هەندێ دڵۆپە بنێشتی چۆڕاوەی ئەو دارە ئەلکێنێت بە شوێنی شکاویەکەی. بەم شێوەیە یارمەتی ئێسکی شکاوی دەدات تا بگیرسێتەوە و جێ خۆی بگرێتەوە، یان ئەوەیکە هەندێ گورگ و ڕێوی بە وەرزی هاوین تووک هەڵدەخەن و گڕوێ دەبن. ئەم ئاژەڵانە ئەچنە ناو ئەو مێرگ و شەخەڵانە کە ڕووەکی پوونگەیان زۆرە و لەوێ خۆیان حەشار دەدەن و لە قوڕ و لیتەی ئەو مێرگە خۆ تێ وەردەدەن و لە ناو ئەو پوونگە خۆ دەگەوزێنن. ئەوڕۆکە بۆ دەرمانی زۆر نەخۆشی پێست، لیتە و لماوی ڕووبار و کانیاوان دەتوانێت ڕەچەتەیەکی دەرمانی بێت.

هەندێک جار دۆزینەوەی دەرمان وەک دۆزینەوەی گەنجی بن گڵ مامەڵەی لەگەڵدا کراوە. بۆ نموونە کاتێ سەربازێکی شەڕ بریندار بووە و ئێش و ژانی برینەکەی دڵی هەموو هاوڕێیانی هێناوەتە کوڵ و گریان، ئەگەر یەکێ لە هاوڕێیانی ئەزموونی ئەوەی بووبێت کە بەکارهێنانی شێلە یا کوتراوەی گیایەک وەکوو خاشەخاشە دەتوانێت هێندێ لە ئازارەکەی کەم بکاتەوە، ئەوە گەورەترین خاڵی

دڵخۆشکەر بووە بۆ ئەو بریندارە و بۆ کەسانی دیکە کە لە شەڕێدا ئەگەری برینداریان بوونیان هەبووە. بەم شێوەیە هەمیشە کەسانێک وا خاوەن ئەزموون و ڕێکار و ڕێنامە و ڕێنوێنی بوونە بۆ ئازارشکێنی و چارەسەر و سارێژی دەرد و برینی مرۆڤ، بەردەوام ڕێزی تایبەتی خۆیان هەبووە و لە ڕیزی سەرگەورە و پسپۆڕاندا دانشتوون. ئەگەر ئێستاکەش کەسانێک وەکوو بوقرات، سینووهە، جالینووس، پوورسینا، سمایل حەکیم، شێخ عوسمانی دووڕۆ و هتد لە یاد و دڵی خەڵکدا ماونەتەوە و بۆ هەمیشە زیندوون تەنیا لەبەر سوودبەخشی و یارمەتیدەری مرۆڤەکانی سەردەمی خۆیان بووە و سوودی بەرهەمە نووسراوە و سەرزارەکیەکان کە چەشنی میراتە بۆیان و خەڵکی هەموو ڕۆژگار و نەتەوە و قوژبنەکانی جیهان سوودیان لێ دەبینێت.

## سەرەتایەك بۆ زانستی پزیشکی

ئەگەر سەیرێکی پێش وتارەکەی بەرگی یەکەمی پەرتووکی «قانون فی الطب» پوورسینا بکەین بۆمان دەرئەکەوێت کە سەردەمی پێش ژیان و ڕۆژگاری پوورسینا پزیشکی و دەرمانگەری چەندە تێکەڵاوی خورافات و سیحر و جادوو بووە. ئەبووعەلی سینا پاش تەواوکردنی خول و قۆناغەکانی خوێندنی ئەدەب، لۆژیک و فەلسەفە لە مەڵبەندی بوخارا[1] سەرەتا وەکوو خوێندکارێکی بلیمەت و سەرکەوتوو

١. ئەبووعەلی سینا (پوورسینا) ساڵی ٩٨٠ زایینی لە گوندی ئەفشانەی نزیک بە شاری بوخارا (شار و مەڵبەندێک لە وڵاتی ئوزبەکستانی ئەوڕۆ) لە دایک بووە. زمانی پوورسینا فارسی بووە و ٤٥٠ پەرتووک و نامیلکەی لە بوارەکانی پزیشکی، سروشتی، وێژە، لۆژیک، بیرکاری، هێندێسە، فەلسەفە و شەرعیاتی بە زمانەکانی فارسی و عەرەبی نووسیوە و زۆربەیان ئێستاکە لە کتێبخانەکانی ئێران و دەوروبەر هەڵگیراون و پارێزگاریان لێ دەکرێت. لە سەفەرێکی دوور و درێژدا کە بە ئاواتی گەیشتن بە زانکۆی نێزامیەی بەغداد لە وڵاتی خۆی بە ڕێ کەوت و ژیانی بە دەم خوێندن و فێرکردن و دەرمانگەری و تاقیکردنەوە بە سەر برد تا وەکوو لە بوخارا و گوندی ئەفشانە سەفەرەکەی دەستی پی کرد و لە شارەکانی گورگانجی خارەزم، گورگان، ڕەی، قەزوێن، ئەسفەهان و هەمەدان مایەوە و زۆربەی ژیانی لە هەمەدان وەکوو وەزیری ناو دەسەڵاتداری دەیلەمیەکان و دەرمانگەر و حەکیمی ناوچەی هەمەدان و لەکستان و کرماشان بە سەر برد. تا وەکوو ساڵی ١٠٣٧ زایینی لە تەمەنی ٥٨ ساڵیدا بەهۆی گیرۆدەبوون بە نەخۆشی کۆڵنج ژیانی ئەم دنیایەی کۆتایی پێ

دەر ئەکەوێت پاشان ئەبێت بە فەیلەسووف و بیرمەندێکی ئیسلامی سەردەمی خۆی. وەک خۆی دەگێڕێتەوە ئەو ڕۆژگارە لای خەڵکی میرزادە و ئاسایی زانست و ڕێچکەی پزیشکی پلەیەکی خوارتری بووە لە چاو فەلسەفە و ئەستێرەناسی و بیرکاری و زانستە شەرعیەکان. بۆیە ئەبووعەلی سینا وەک نەجاتدەرێکی ڕاستەقینە هەڵمەت و خەباتی خوێندنی جۆرێکی تر ئەخاتە گەڕ و هەر لە سەرەتاوە لە بوخارا سەرنجی مامۆستا و هاوقوتابیانی بۆ لای خۆی ڕائەکێشێت و چەشنی بلیمەت و خاوەن بەهرەیەکی ناوازە ناوبانگی دەڕوات.

بە پێشنیاری یەکێ لە دۆستانی، ئەبووعەلی سینا دەست ئەداتە نووسین و کۆکردنەوەی ئەزموون و ئەنجام و بنەماکانی ڕێچکەی پزیشکی. وەک لە سەرناوی کتێبەکەی دیارە ئەم حەکیمە لێزانە یاسا و پێڕەوی پزیشکی ئامادە دەکات و دەینووسێتەوە. پوورسینا بە دەم سەفەرەکەیەوە هەر لە بوخارا و گورگانجی خارەزم تا دەگاتە گورگان، ڕەی، قەزوێن، هەمەدان و ئەسفەهان کتێبەکە دەگمەن و ناوازەکەی ئامادە دەکات و هەتا کۆتایی ژیانی بەشێکی گەورە لە ژیانی تەرخان ئەدات بە ئامادە کردن و پوختەنووسینی. سەرناوی قانوون و یاسای پزیشکی باشترین و گونجاوترین بژاردەیە بۆ ناوی ئەم کتێبە. بە بۆچوونی هەموو زانایان و توێژەرانی ئەم بوارە پوورسینا هەموو بنەما و ئەنجام و ئەزموونەکانی ڕێچکەی پزیشکی مەزدیسنایی ئێرانی و جالینووسی یۆنانی و هەندێ لە ڕەچەتە و ڕێنماییەکانی ناو پزیشکی ئایۆرڤیدای هیندی پاڵاوتە دەکات و پوختەی زانستی و ئەزموونی لێ هەڵدەهێنجێت و یاسا و ڕێسای پزیشکی لە چوارچێوەیەکی سنووردار و پتەو دەبەستێتەوە و دەیکات بە سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ زانکۆکانی گوندی شاپووری[1] ئێرانی و نیزامیەی بەغداد و دواتر زانکۆ و توێژینگەکانی ئەندەلۆس و

---

هات و جەستەی غەریب و ماندووی لە ناو شاری هەمەدان بۆ هەمیشە بووە شوێنەوارێکی زیندی و گڵکۆی پیرۆزی سەردەمی خۆی و بەرەکانی داهاتوو.

١. جندی شابور: یەکێ لە شارەکانی سەردەمی ساسانیەکانی ئێرانە کە دوایین ڕۆژگار و دەسەڵاتداری پێش ئیسلامی تێدا هەڵکەوتبوو. شوێنەواری ئەم شارە کەوتووەتە لای شاری دزفوول لە پارێزگای خووزستان. خوێندنگەی گوندی شاپوور یەکێ لە گەورەترین زانکۆ و بنکە زانستیەکان بەتایبەت زانستی پزیشکی ئێرانی بووە

گشت ئەورووپا.

سـەدەی ١٢ تا کۆتایی ١٦ زایینی بنەماکانی زانسـتی و کرداری پزیشـکی و دەرمانگەری لە هەموو ئەورووپا و ئەندەلوس و وڵاتانی ئیسـلامی کتێبی ٧ بەرگی قانوونی پزیشـکی پوورسـینا بووە. ئێستاکەش بنەمای سەرەکی هەموو بابەتەکانی لقی پزیشکی کۆن و خۆماڵی ئێرانی و ئیسلامی و هەموو لقە پزیشکیە خۆماڵیەکانی وڵاتانی ڕۆژهەلاتی ناوین وەکوو کوردسـتان هەمان کتێبی قانوونی پوورسـینایە. خۆشـبەختانە تا وەکوو ئەوڕۆ ئەم کتێبە وەرگێڕدراوەتەوە سـەر زۆربەی زمانە زیندووەکانی دنیا و سـەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە پاش پەرتووکی پیرۆزی ئینجیل دووهەمین پەرتووکە لە ڕێژەی نۆبە و تیراژی چاپەوە. هەروەها شانازیەکی دیکە بۆ ئەم پەرتووکە دانانی ڕێزانە و خەلاتی سـەد هەزاری یۆرۆیی تایبەتی پوورسـینایە[١] کە سـاڵی ٢٠٠٥ لە سـەر دەسـتی هاوڵاتی تورک و ئەندامی پارتی یەکیەتی کریسـتیانی ئاڵمان یاشـار بیلگن دەسـتی پێ کرا و سـاڵانە دەدرێت بە ڕێکخراوە یان کەسانێک کە لە ڕێبازی سـازانی فەرهەنگی و شـارسـتانیەتی نێوان نەتەوەکانی دنیا تێ دەکۆشن.

## پێوەندی «قانون فی الطب» و زمانی کوردی

هیچ پێویسـت ناکات کە ئێمە بە گۆترە پینە و پەراوێزی زیادە بلکێنین بە ژیان و بەرهەمەکانی پوورسـینا بەتایبەت لە سـەر بابەتە پزیشـکیەکانی وەکوو بەرهەمی قانوونی پزیشـکی، شـەفا، کۆلنج و ڕەگناسـی. بەڵکوو دەبێ تیشـک بخەینە سـەر تێبینیەکانی ناو وەرگێڕان و توێژەرانی ئەورووپی و لاتینی لە سـەر دەقی سـەرەکی و وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ئەبووعەلی سـینا کە وەرگێڕەکان هەمیشـە هەمبەری هەندێک بابەت و زاراوە و وشـەی ناو کتێبی قانوون فی طب وەکوو خۆی نووسـیوەتەوە و بەردەوام وەک گرێکوێرەیەک سـەیری ئەم وشـە و واتا نامۆ و نەناسراوەیان کردووە. تەنانەت پاش ژیانی ئەبووعەلی سینا خودی فارسەکانیش لە

١. Avicenna-Preis e.V

وەرگێڕانی دەقێکی پوخت و تەواوی ئەم بەرهەمە سەرکەوتوو نەبوون و هیچ کات نەیانتوانی دەقێکی وەرگێڕانی فارسی ئامادە بکەن، تا وەکوو بەخت هەڵسوورا و ئەم پشکە گەنج و گەوهەرە وە بەر مامۆستا هەژاری موکریانی کەوت.

کاک بورهان حوسەینی دەیگێڕایەوە کە لە سەرەتای حکوومەتی کۆماری ئیسلامی ئێران، لە تاران کونگرەیەکی ناودەوڵەتیان ڕێک خست بۆ ڕێزلێنان و ناساندنی حەکیم ئەبووعەلی سینا. هاوکات پێشانگایەکیش بۆ نیشاندانی دەقە دەستنووسەکان، وەرگێڕانە ناتەواو و تەواونەبووەکان و بابەت و ناملیکەی نووسراو لەسەر پەرتووکی «قانون فی الطب» لەپاڵ کونگرەکە کردبووەوە، بەڵام خاڵی گرینگ و هاوبەش لە ناو سەرجەم وەرگێڕانە ناتەواوەکانی ئەم پەرتووکە ئەوە بوو کە هەزار ساڵە فارس زمانەکان هەوڵیان داوە بەرهەمەکەی ئەبووعەلی سینای فارس زمان کە بە عەرەبییەکی کۆن نووسراوە وەریبگێڕنەوە سەر زمانی فارسی سەردەم و هەمیشە بە گرێکوێرەی ناو کتێبەکە دەگەیشتن و سەرکەوتوو نەدەبوون.

تا ئەو کاتە بۆ کەس ڕوون نەبوو کە گرێکوێرەی تەواو نەکردنی «قانون فی الطب» لە عەرەبییەوە بۆ فارسی چییە، پاشان بەخت یار دەبێت و ئەم گرێکوێرەیە مامۆستا هەژاری کورد دەیکاتەوە. تایبەتمەندیەکانی ئەزموونی ژیان و زمانی مامۆستا هەژار بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە کارساز و چارەسەری تەواو بوون. مامۆستا هەژار ژیانی لە خوێندنگەی فەقێیاتی مزگەوتەکانی موکریان دەست پێ کرد، پاشان چارەنووسی هەڵوەدایی و ئاوارەیی بەرەو ناو عەرەب و کوردانی عێراق، سووریە، تورکیە و لوبنان ڕایدەکێشێ تا وەکوو لە کۆتایی ژیانی دەگەڕێتەوە و ئەمجارە بۆ دۆزینەوەی کار و دابین کردنی بژێوی ژیانی ڕوو لە تاران و کەرەج دەکات تا وەکوو ئەوەی چەند شاکاری کوردی و فارسی لە دواین ساڵەکانی ژیانی بە چاپ دەگەیێنێت[1].

خاڵێکی گرینگتری ژیانی وێژەیی و ڕۆشنبیری مامۆستا هەژار، کار کردن لە سەر کۆکردنەوەی سەرجەم وشە و زاراوەکانی هەموو شێوەزارەکانی (لەکی،

---

١. لەچاپدانی فەرهەنگی کوردی بە کوردی و فارسی هەنبانەبۆرینە، وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز بە کوردی پەتی، وەرگێڕانی ٧ بەرگ کتێبی قانوونی پزیشکی ئەبووعەلی سینا لە عەرەبی بۆ سەر فارسی و هەروەها ئامادە کردنی فەرهەنگی فارسی بە کوردی کە هێشتا چاپ نەبووە

لوڕی، کەلوڕی، هەورامی، بادینی، شـەمزینی، زازاکی، ئەردەڵانی و سـۆرانی) زمانی کوردی بووە و هەروەها خوێندنی پەرتووکە کۆنەکانی وێژەیی زمانی کۆنی فارسی لە سەردەمی فەقێیایەتی و ئاشنابوون بە کتێبە عەرەبیەکانی کتێبخانەکانی بەعلبەکی لوبنان و ناوشـــاری بەغدا. ئەمانە و کۆمەڵێک بەهرەی ئەزموون و زانســـتی ئەم کەڵەپیاوە هەموو خاڵی ئەرێنی و گرنگ بوون بۆ وەرگێڕانێکی ســـەرکەوتووی ئەم کتێبە دەگمەنە.

ئێمەی کورد نـاکرێت بە تەنیـا خۆمـان بە خـاوەنی کردنەوەی ئەو گرێکوێرەیە بناسـین بەڵام پشـکێکی شـیاومان لە چارەسـەری گرێ و وشـە گرانەکانی قانوونی پزیشـکی پوورسـینادا هەبووە و هەیە. چونکە زمانی پوورسـینا شـێوەزاری فارسـی دەری وڵاتی ئۆزبەکستانە و زۆربەی ژیانی بە ڕێگەی سەفەرەوە بووە بەتایبەت کە بەشـــێکی زۆری ژیانی (٢٣ ســـاڵ)[١] لە هەمەدان[٢] بووە. جا لێرەدا گرینگ ئەوەیە دیسـانەوە سـەیری مێژووی دەڤەر و شـاری هەمەدان بکەین کە زۆر بە ڕاشـکاوی دەرئەکەوێت کە هەمەدان نیشـتمان و مەڵبەندی سـەرەکی هۆزی لەک و بەشـێک لە هۆزی کەڵهوڕ و لوڕە. تەنانەت شاعیر و عارفی گەورەی لەک بابەتاهیری هەمەدانی لەم شـارە ژیاوە. ئێسـتاکەش هێشـتا جەماوەرێکی زۆر لە ئاخێوەرانی لەک و لوڕ و کەڵهوڕ لەپاڵ نەتەوەکانی دیکە وەکوو فارس و تورک پێکەوە ئەم شارە بە نیشتمانی خۆیان دەزانن.

کەواتە ئەگەر بە چاویلکەی مێژووییەوە بچینەوە بۆ ســـەردەمی پوورســـینا و شاری هەمەدان بهێنینەوە پێش چاوی خۆمان کە هێشتا مەغۆل هێرشی نەهێناوە و هەواڵێک لە جەماوەری تورکی ئازەری لەم دەڤەرەدا نییە و دوو نەتەوەی کورد و

---

١. ئەبووعەلی سینا لە درێژەی سەفەری ژیانیدا پاش بوخارا، بەلخ، و گورگانج، ساڵێک لە ڕەی دەمێنێتەوە، پاشان بە ڕێگەی قەزوێن بەرەو هەمەدان هەڵدەکۆچێت و بێجگە لە یەک ساڵ ژیانی لە ئەسفەهان ٢٣ ساڵ پاشماوەی تەمەنی لە شاری هەمەدان بە سەر دەبات.

٢. هەمەدان یەکەم پایتەختی نەتەوەی ئاریا بووە کە مادەکان وەکوو پاتیەختی هاوینەی خۆیان بنیاتیان ناوە. هێرۆدۆت مێژوونووسی یۆنانی دیاکۆ پاشای ماد بە دامەزرێنەر و بنیاتنەری شاری هەمەدان یا هێگمەتانە دادەنێت و ساڵی ٧٠٨ پێش زایین تا وەکوو هێرشی کووڕۆشی هەخامەنشی لە ساڵی ٥٥٠ پێش زایین بۆ سەر مادەکان و ڕووخانی دەسەڵاتەکەیان ئەم شارە هاوشانی پایتەختی وڵاتانی ئەوسای جیهان واتا ئاتێن و ڕۆم شوێنی ژیان و ژیار بووە.

فارس لەم شارەدا ژیاون و پسپۆڕێکی بلیمەت و خاوەن بەهرەی ناوازە هاتووەتە ناویان و ڕۆژانە خەڵکی نەخۆش و دەردەداری شار و دەڤەرەکە لە کورد و فارس هاتوچۆی دەکەن. حەکیمێک کە ناوبانگی سنوورەکانی بەزاندووە بەهۆی ئەوە کە پاش سەردانی دەیان حەکیم و پزیشکی بیانی و ناوخۆیی تەنیا پوورسینا بووە پاشای دوو دەسەڵاتی ئەو سەردەمەی ئێران واتا سامانیەکان[1] لە بەلخ و دەیلەمیەکان[2] لە ڕەی لە نەخۆشی کوشندە ڕزگار کردووە.

بەم شێوەیە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە زۆر ئاساییە کە پوورسینا کە زمانی دایکی فارسی دەری بووە و بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری ڕۆژانە و تێگەیشتن لە ژان و ئازاری خەڵک و تێگەیاندنی خەڵکەکەی پێویستی بووە کە هاوشێوەی ئەوان بە فارسی و لەکی و لوڕی قسە بکات یاخود تێکەڵەیەک لە زمانی خۆی و زمانی ئەوان لای خۆی ساز بکات تا وەکوو ئێش و کاری دەرمانگەری و چارەسەر کردنی بە چاکی و تەواوی جێبەجێ ببێت. لە لایەکی ترەوە ئەبووعەلی سینای فارس زمان زانستی پزیشکی و ئەزموون و ئەنجامەکانی بە زمانی عەرەبی نووسیوە. چارەنووسی ژیانی ئەم حەکیمە دەریدەخات کە ڕێبواریەکەی هەموو بە ناو هۆز و شارەکانی فارس و تات و لەک و لوڕەکاندا تێپەڕیوە نەک بە ناو زاراوە و هۆزە عەرەبەکان. کەواتە بێگومان کاریگەری زمان و شێوەزارەکانی ناعەرەبی لە دەق و بەرهەمەکانیدا خۆی نیشان دەدات و وەک خاڵێکی ئاسایی هەر مرۆڤێک خۆی دەردەخات.

ئەبووعەلی سینا دەیان وشە و واتای وشە و ناوی ڕووەکی لە خەڵکی لەک و لوڕەوە خستۆتە ناو کتێبە عەرەبیەکەی. ئێستاکەش بەهۆی ئەم کتێبەوە گەلێک ناوی کوردی، فارسی و لوڕی چووەتە ناو زمانی عەرەبی، وەکوو اسفناج (ئەسپیناخ،

---

١. میری ئەو سەردەمەی سامانیەکان نوح کوڕی مەنسووری سامانی بووە و پوورسینا تەمەنی ١٨ ساڵان بووە. پوورسینا داوا دەکات لە بەرامبەر دەستخۆشانەی میری سامانیان مۆڵەتی بدات لە کتێبخانەکەی ناو دەرباری سامانیان خەریکی خوێندن و توێژینەوە بێت. پوورسینا دەڵێت ئەم کتێبخانەیە خاوەنی دەیان و هەزاران پەرتووکی نایاب و ناوازە بووە.

٢. میری ئەو سەردەمەی دەیلەمیەکان موجدولدەولە بووە و پوورسینا تەمەنی ٣٤ ساڵان بووە.

سپیناخ، ئەسپەناج)[1]، بابونج (بەیبوون، باوینە و باوین)، بنفسج (بەنەوشە و وەنەوشە)، بادرنجبویە (بادرەنگبۆ و نارنجبۆ)، باذنجان (باینجان و بامجان)[2]، بلوط (بەلوو، بەڕوو، پەلووت)، برسیاوشان (پەرسیاوەش، پەرسیاوەشان)[3]، فستق (پستە)، فونج و فودنج (پوونگە، پنگ و پوونگ)، جرجیر (گەرگیر)[4]، توث (توو، تووت)[5]، اشترغاز (وشترخوار)، دم الاخوین (خوێن سیاوەشان)[6]، دارصینی (دارچین)، رازیانج (ڕازیانە)، شاهترج (شاتەرە)[7]، ریباس (ڕیواس، ڕێڤاس، رمبێز، ڕیواو)[8]، شبث (شویت، شبیت، شوید)[9]، شیرخشک (شیرخشت)، کرفس (کەرەوز، کەرەسپ)، بندق (فنەق، فەنەق، فەندەق)[10]، جوز (گوێز، وەزی، گردەکان)، جلنار (گوڵ هەنار، گوڵنار)[11]، لاذن (لادەن)[12]، نرجس (نەرگس، نێرگس، نێرگز)[13]، جزر (گەزەر، گێزەر) و هتد.

لە کۆتایی ئەم بەشەدا پێویستە ئەوە بزانین کە ئێستاکە هەلێکی زێڕینە ئێمەی کوردیش لە هەوڵێکدا بتوانین حەوت بەرگی کتێبەکەی حەکیم سینا وەربگێڕینە سەر کوردی و سوود وەربگرین لەم گەنجینە پڕ دەرمان و خۆراکییە بۆ مرۆڤی کورد. وەرگێڕانی کوردی ئەم کتێبە دەتوانێت گەورەترین سەرچاوەی پزیشکی خۆماڵی بێت بۆ پزیشکی خۆماڵی کوردەواری و هەروەها کاری پیشەوەرانی بواری پزیشکی خۆماڵی و سروشتی لە باشووری کوردستانیش بەرەو پێش ببات.

---

١. Spinacia oleracea
٢. Solanum melongena
٣. Adiantum capillus-veneris L.
٤. *Eruca sativa*
٥. Morus alba
٦. *Dracaena fragrans*
٧. Fumaria officinalis
٨. Rheum ribes
٩. Anethum graveolens
١٠. Corylus avellana
١١. Punica granatum
١٢. *Tropaeolum majus*
١٣. Narcissus pseudonarcissus

بەندە ســـاڵی ٢٠١٣ خۆم خســـتە بەر تاقیکردنەوە بۆ وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە، بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت ئەم کارە پێویستی بە بانتر لە ١٠ ساڵ کاری بەردەوام هەیە و کەسێک یا کەسانێک دەتوانن وەریبگێڕنەوە سەر کوردی کە باری بژیو و گوزەرانی ژیانیان دابین بێت یان شوێنێک مافی وەرگێڕان و ماندووبوون و پیتچنین و لەچاپدانی وەرگێڕانە کوردیەکە وەئەستۆ بگرێت. هیوادارم ئاواتی دڵم بێتە دی و پشکی وەرگێڕانی ئەم کارە بکرێت بە ناوی منەوە یا ئەوەیکە کەسێکی دیکە بچێتە ژێر ئەم بارە گەوهەرە و ئێمەیش چەشنی نەتەوە و وڵاتانی دیکە سوود لەم گەنجە شاراوەیە وەربگرین.

ئەبووعەلی ســـینا لە ماوەی ژیانی لە بۆخارا تا وەکوو ئەســـفەهان و هەمەدان پەرتووکی «قانون فی الطب»ی نووسیوە. واتە بەشـی یەکەمی ساڵی ٩٨٢ لە شاری گورگان، بەشـی دووهەم لە شـاری ڕەی ساڵی ٩٨٤ و بەشـی سێهەم لە نێوان ساڵەکانی ٩٨٤ تا ٩٩٣ زایینی لە هەمەدان و ئەسفەهان تەواو کردووە. یەکەم جار ساڵی ١٥٩٣ لە شاری ڕۆم لە دوو بەرگدا چاپ کراوە. پاشان ساڵەکانی ١٨٩٦ و ١٩٠٠ لە قاهیرە، ١٩٠٢ لە تاران، ســـاڵی ١٩٠٥ لەگەڵ ڕوونکردنەوەی فارســـی لە لاهووری پاکستان و ١٨٨٠، ١٩٠٢، ١٩٠٤، ١٩١٣ و ١٩٣٠ لە هیندستان دیسان چاپ کراوە.

لە خوارەوە ناوی چەند نموونە لە وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە ئەخەمە بەر دیدی خوێنەرانی خۆشەویست:

- وەرگێڕان بە زمانی لاتین (١١٥١ زایینی) لە ســەر فەرمانی قەشـەی گەورە تۆڵدۆ ڕیمۆند
- وەرگێڕان بە زمانی لاتین (١١٥٢ زایینی)، وەرگێڕ ئاندرئا ئاکپاکۆ
- وەرگێڕان بە زمانی لاتین (١١٨٧ زایینی)، وەرگێڕ ژراردۆی کرمۆنایی

بەگشتی ئەم کتێبە سەدەی پازدەی زایینی ١٦ جار و سەدەی شازدە ٢٠ جار چاپ کراوە

- وەرگێڕان بە زمانی عیبری (١٤٩١ زایینی)، وەرگێڕ یۆسێف لۆرکی لە وڵاتی ئیتالیا
- وەرگێڕانی ناتەواو بە زمانی فارســـی (١٨٨٥ زایینی)، وەرگێڕ مەلا فەتحوڵا

فەخرەدین شیرازی بە فارسی لە لۆکنهۆی هیندستان

- وەرگێڕانی بەشـــی ســـێهەم لە پەرتووکی ســـێهەم و نەخۆشـــیەکانی چاو، وەرگێڕ هیرشبیترگ و لیپر بە ئالمانی، ساڵی ١٩٠٢
- وەرگێڕانی (تشریح الاعضا) بە فەرەنسی، وەرگێڕ کۆپینگ، ساڵی ١٩٠٠
- وەرگێڕانی پەرتووکی پێنجەم بە ئینگلیزی، وەرگێڕ زۆنت هایمەر چەند ساڵ پێش ئێستا
- وەرگێڕانی (تشـــریح الاعضـــا) و نەخۆشـــیەکانی گورچیلە و میزلدانە بە ئینگلیزی، وەرگێڕ دۆکنینگ، چەند ساڵ پێش ئێستا
- وەرگێڕانی پەرتووکی یەکەم بە ئینگلیســـی، وەرگێڕ کامێرۆن گرۆنێر، چەند ساڵ پێش ئێستا
- وەرگێڕان بە زمانی فارســـی (١٩٨١ زایینی)، وەرگێڕ مامۆســـتا هەژاری موکریانی لە تاران
- وەرگێڕان بە زمانی فارسی (٢٠١٤ زایینی)، وەرگێڕ دەستەی پزیشکان و بە سەرپەرستی دکتۆر یۆسف بەیک باباپوور لە تاران، پەخشانگای ئەردەهاڵ

## باسی دووههم

### پێناسەی پزیشکی سروشتی و خۆماڵی

کاتێ قسـه له سـەر پزیشـکی خۆماڵی و سـروشـتی دەکرێت مەبەسـت دەرمان و چارەسـەرکردنی ئینسـانه بەیارمەتی شـێوازەکانی دەرمانی و چارەسـەری که له پێشـینانی یەک گەل، نەتەوە و یەک هۆز بە جێ ماوە. ئاشـکرایە هەر هۆز و گەلێک خاوەنی شـێواز و تایبەتمەندیەکانی چارەسـەری و دەرمانی تایبەت بە خۆیە. کەواتە پزیشـکی خۆماڵی هەر گەل و نەتەوەیەک دەتوانێت جیاوازی زۆر یا کەمی بێت لەگەڵ گەل و نەتەوەکانی دیکە.

ساڵی ١٩٥٨ ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی یاساکانی بەکارهێنانی شێوازەکانی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی دانا و مۆڵەتی کار کردن بە شێوازەکانی ئەم پزیشکیە لەپاڵ پزیشکی سەردەم پەسەند کرد و جەختی کردەوە کە دەبێ تا ساڵی ٢٠٠٧ ئەم دوو شـێوازە پزیشـکیە پێکەوە ئاوێتە بن و لە خزمەت تەندروسـتی و سـلامەتی مرۆڤدا یەک نیـاز و یەک ئـامـانج بڕۆنە پێش. وڵاتی چین پێش ڕێکخراوەی تەندروسـتی جیهانیش سـاڵی ١٩٥١ یاسـای پەرەپێدان و کارپێکردنی پزیشـکی سـوننەتی چینی لەو وڵاتە پەسـەند کرد. هەر ئەم بابەتە بووە هۆی ئەوە کە دواتر لقی پزیشـکی سـوننەتی چین وەکوو لقێکی ناسـراو و بناغەدار، لە پێناسـه و

ڕوونکردنەوەکانی ڕێکخراوی (WHO) لە سەر پزیشکی سوننەتی ئاماژەی پێ بدرێت و جەهانگیر ببێت.

وڵاتی ئێران کە پێشینەی دەیان حەکیمی گەورە و ئەزموونداری وەکوو ئەبووعەلی سینا، ڕازی و ئەبووڕێحانی هەیە، سەد ساڵ پێش ئێستا بەکارهێنان و بەرنامەی پەرەپێدان بە پزیشکی سوننەتی و خۆماڵی قەدەغە کرد، بەڵام ساڵی ١٩٨٦ کۆمەڵەی گیادەرمانانی ئێران دامەزرا و بە ناونووس کردنی ئەندامەکانیان لە تەواوی ئێران و هەروەها ڕاکێشانی دکتۆر و پزیشکانی تر بۆ ناو کۆمەڵەکەیان توانیان پاش ساڵی ٢٠٠٠ یاسای پزیشکی خۆماڵی و سروشتی ئێران و ناوچەکانی دیکەی ناوخۆی ئێران ببەنە ناو پارلەمان و وەزارەتی تەندروستی ئێران. دوای گەلێک ڕەتکردنەوە و پەسەند و هەمووارکردن ئاخری بە یاسا چەسپا و چووە بواری جێبەجێ کردن و لە وزارەتی تەندروستی پێگەی کارگێڕی و بوودجەی دارایی بۆ جیا کراوەتەوە. ئەوڕۆکە بەیارمەتی یاساکانی گەشە و پەرەپێدانی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی ئێرانی، ڕێگە بۆ کار و توێژینەوە لە بواری ئەزموونەکانی پزیشکی ناوچە ڕەسەنەکانی ئێران وەکوو کوردستان، لوڕستان، خۆراسان، خووزستان و مازەندەران ئاوەڵا بووە و چەندین کۆلیژی پزیشکی تایبەت بە پزیشکی خۆماڵی (خوێندنی PhD و ڕزیدێنت) و ٢٠ دەرمانگەی تەندروستی بە ناوی (سەلامەتکەدە) و ١٩ شوێن کە کاری خزمەتگوزاری پزیشکی خۆماڵی و پزیشکی سەردەم پێکەوە ئەنجام دەدەن، بۆ زیاتر پەرەپێدان و جێ کردنەوەی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی لە ئێران دامەزراوە.

لای هەندێک لە پسپۆڕان مژاری پزیشکی خۆماڵی بە «دەرمان و چارەسەریی نەتەوەیی، دەرمان و چارەسەریی خۆماڵی، دەرمان و چارەسەریی سروشتی، دەرمان و چارەسەریی پێشینیان، پزیشکی کۆن، پزیشکی سروشتی، پزیشکی نەتەوەیی کۆن و پزیشکی پێشینیان» دەیناسن. ئەڵبەت هەر کام لە هەمبەرەکانی سەرەوە ناتوانن واتایەکی پڕاوپڕ بن بۆ هەمان پێناسەی ڕێکخراوەی تەندروستی جیهانی ساڵی ١٩٧٨ کە دەڵێت: «پزیشکی خۆماڵی یانێ سەرجەم زانستەکانی بیرۆکەیی و کرداری کە بۆ دەستنیشانکردنی کاری پزیشکی، پاراستن و بەرگری و دەرمانی نەخۆشیەکانی جەستەیی، دەروونی یا کێشەکانی کۆمەڵایەتی کە بە شێوەی

ســـەرزارەکی یا نووســـراو ســـینە بە ســـینە لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکی تر گوازراوەتەوە».

ئەم پێناســـە تۆکمە و گشـــتگیرەی (WHO) دەبێ هەمبەرێکی کوردی پڕاوپڕ وەکوو «پزیشـکی سروشـتی و خۆماڵی یا پزیشـکی خۆماڵی» بۆ دابنرێت. ناوەندی گیادەرمانی شـەفا کە سـاڵانێکە خەریکی کۆکردنەوە و ڕێکخسـتنی هەموو بابەت و لقەکانی تایبەت بە ئەزموون و ئەنجامە سـەلمێندراوەکانی کاری چارەسـەری و دەرمانی پێشـینیانی کوردەوارییە بۆ سـەرجەم شـێواز و بەرهەمە دەرمانی و چارەسـەری و ڕێنمایی و ڕێکارەکانی تەندروسـتی و خاوێنی کوردستان سەرناوی «پزیشـکی خۆماڵی/ سوننەتی کوردەواری یا بە فارسـی طب سنتی کردستان و بە ئینگلیزی KTM: Kurdistan Traditional Medicine» داناوە. ئەوڕۆکە ناوەندی شـەفا بەهۆی هاوکارییەکانی لەگەڵ زانکۆی پزیشـکی سـنە، کۆمەڵەی گیادەرمانی ئێران و هەروەها دەرکەوتن و جێگیربوون لە پێشانگا و کۆڕبەندە سەرتاسەرییەکانی گیادەرمانی و پزیشـکی خۆماڵی ئێران، ئیتر ناوی پزیشـکی خۆماڵی کوردەواری ناوێکی ئاشنایە و دەناسرێت و دەستەواژەی دیکە جێی ناگرێتەوە.

لە سـەرانسـەری جیهاندا هەموو نەتەوە و وڵاتان بەپێی بەربڵاوی یان ڕێژەی جەماوەرییان خاوەنی شێوازی تایبەتی پزیشکی خۆیانن کە تایبەتە بە ئەزموونەکانی پێشینانیان کە سینە بە سینە بە دەستیان گەیشتووە. ئەم ئەزموونانە ڕەنگە پڕ بێت لە دەرمان و شێوازی دەرمانی تایبەت، سەرنجڕاکێش، ناوازە و دەگمەن، نەناسراو، گوماناوی، تێرامان و ڕەنگە خورافی. بەڵام پسپۆڕانی دڵسۆز و کارای ئەم بوارە بە سوودوەرگرتن لە بنەمای خوێندەواری و تێگەیشتنی شێواز و بابەتەکانی پزیشکی سەردەم، ئەنجام و توێژینەوەکانی زانستی پزیشکی تازە و هەروەها ئاشنابوون بە هەموو شـێواز و ڕێچکە دەرمانیەکانی خۆماڵی و سـروشـتی وڵاتانی دیکە، هەموو ئەزموون و بابەتەکانی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی نەتەوەیی خۆیان پاڵفتە دەکەن و بەرهەمێکی پوختە پێشکەشی نەتەوەی خۆیان و نەتەوەکانی دیکە جیهان دەکەن.

وەکوو ئەو کارانەی کە لە جیهانی ئەوڕۆدا لە سەر لقە پزیشکیەکانی دیکە کراون و نەتەوە یا وڵاتانی خاوەندار ڕەنج و هەوڵی زۆریان خسـتووەتە گەڕ تا وەکوو سەرەتا لە وەزارەتی تەندروستی وڵاتی خۆیان پاشان ڕێکخراوی تەندروستی جیهان

تۆماری بکەن و یاسا و بنەماکانی بنووسنەوە و ئامادەی هەناردەکردنی بکەن بۆ وڵاتانی دیکە. بۆ نموونە:

پزیشکی ئێرانی مەزاج و اخلاط، پزیشکی پارێزی ئیسلامی، پزیشکی دەرزیاژن، گیادەرمانی[1]، پزیشکی خۆماڵی چینی، پزیشکی شێلان[2]، کەڵەشاخ[3]، پزیشکی بادکێش یا کەڵەشاخی وشک[4]، ئاودەرمانی[5]، زەروو خستن[6]، خوێنبەردان یا دەماربڕین یا فصد[7]، شیاتسۆ یا شێلانی ژاپۆنی یا شێلان بە پەنجە[8]، یۆگا[9]، پزیشکی ئایۆرڤێدای هیندی و بووزی یا پزیشکی زانستی ژیان[10]، کایرۆپراکتیک یا شێلان بە دەست[11]، هۆمیۆپاتی[12]، ڕیفلێکس دەرمانی[13]، بۆندەرمانی[14]، سروشت دەرمانی، وەرزش دەرمانی و هتد.

پاش پێناسە و ڕوونکردنەوەکەی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی کە ساڵی ١٩٧٨ بۆ پزیشکی خۆماڵی و سروشتی گشتێندرا، ساڵی ٢٠٠٢ وردەکاریەکی دیکەی پێ زیاد کرا: «پزیشکی خۆماڵی دەستەواژەیەکی گشتیە کە هەم بۆ پێکهاتەکانی پزیشکی خۆماڵی وەکوو پزیشکی خۆماڵی چینی، ئایورڤیداوی هیندی و پزیشکی یۆنانی – عەرەبی و هەم بۆ شێوازە جۆربەجۆرەکانی پزیشکی خۆماڵی دیکە بەکار دەچێت. هەروەها شێوازەکانی دەرمانی پزیشکی خۆماڵی بریتین لە دەرمان (سوودوەرگرتن

---

١. Phytotherapy
٢. Massage therapy
٣. Cupping
٤. Dry cupping
٥. Hydrotherapy
٦. Leech therapy
٧. Fasd
٨. Shiatsu
٩. Yoga
١٠. Ayurveda
١١. Chiropractic
١٢. Homeopathy
١٣. Reflex Therapy
١٤. Aromatherapy

لە ڕووەکە دەرمانیەکان، یا ئەندامەکانی حەیوانی و کانزایی) و شـێوازەکانی نادەرمان (وەکوو پزیشــکی دەرزیاژن، شـێلان و چارەســەریەکانی ڕۆحی و دەروونی). ئەو وڵاتانەی کە سـیسـتەمی کارپێکردنی پزیشـکیان لە سـەر پزیشـکی تازە و سـەردەم دامەزراوە، پزیشکی خۆماڵی و سروشتی، زۆرتر بە سەرناوی پزیشکی تەواوکار و جێگرەوە[1] دەناسن».

ئەوڕۆکە بەکارهێنانی شـێوازی پزیشـکی تەواوکار و جێگرەوە لە وڵاتانی دنیا بە شـێوەیەکی بەرچاو پەرەی سـەندووە. ئەم شـێوازە پزیشـکیە لە ناو هەر وڵات و نەتەوەیکدا خاوەنی یەک یا چەندین لقی تایبەتیە وەکوو شـێوازە دەرمانیەکانی سەرەوە کە باسمان کرد (گیادەرمانی، دەرزیاژن، ئایۆرڤیدا، ئاودەرمانی و هتد). ئەم شـێوازە دەرمانی و پزیشـکیە هەڵقوڵاوی فەرهەنگ و ئەزموونی ناخی مێژووی نەتەوەکانە بۆیە گومان لە بناغە و ناوەرۆکی کاکڵەداریدا نیە.

ڕۆژبەڕۆژ پسـپۆڕانی پزیشـکی بەتایبەت ڕێکخراوی تەندروسـتی جیهانی و وزارەتی تەندروسـتی وڵاتانی پێشـکەوتوو خەڵکی ئاگەدار دەکەنەوە کە بەجێ هێشـتنی شـێوازە دەرمانیەکانی خۆماڵی و سـروشـتی پێشـینیان و ڕاکێشـانی سەداسـەدی خەڵکی بۆ لای پزیشـکی تازە و سـەردەم دەتوانێت خەڵکی بەرامبەر بە کاریگەریە لاوەکیەکانی دەرمانی پزیشکی سەردەم نائاگا بکات و هەڕەشە و کێشەی چارەنەکراوی ئەم کاریگەریە لاوەکیانە بمێننەوە و ڕۆژبەڕۆژ ڕوو لە زیادبوون بکەن. لەم پێناوەدا وڵاتێک بەختی خۆش یاری دەبێت و خۆشبەختی و تەندروستی تێدا جێگیر دەبێت کە سـوود لە هەموو شـێوازە دەرمانیەکانی پزیشـکی خۆماڵی و پزیشکی سەردەم تێکرا وەربگرێت.

ڕێکخراوی تەندروسـتی جیهانی هۆکارەکانی پێشـکەوتن و پەرەپێدانی پزیشـکی خۆماڵی و سروشتی بەمانەی خوارەوە دەزانێت:

- تایبەتمەندیەکانی خۆماکی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی:

هەر لە کۆنەوە پزیشـکی خۆماڵی شـێوازێک بووە خەڵک خۆیان دەرمانی خۆیان

---
١. CAM: Complementary and Alternative Medicine

کردووە. جا بۆیە بە ئاسانی قەبووڵی دەکەن. پزیشکی خۆماڵی بەشێک لە فەرهەنگ و کەلتووری هەر وڵاتێکە و بۆ چارەسەری و کردنەوەی گرێی ژیان دەورێکی کاریگەری هەیە. ناساندن و پەرەپێدانی پزیشکی خۆماڵی یانێ ڕێزلێنان لە فەرهەنگ و نەریتی خەڵک لە سەرانسەری جیهاندا.

- تایبەتمەندی گشتبینی لە پزیشکی خۆماڵی:

ئەم شێوازە پزیشکیە جەخت لە سەر ئەم بابەتە دەکاتەوە کە تەندروستی و نەخۆشی دەرنجامی نەبوونی هاوسەنگی و یەکسانی ئینسانە لە بازنەی ئەو سیستەمەی ئینسانی تێدایە. بەواتایەکی دیکە لەم شێوازە پزیشکیەدا بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان لەجیاتی ئەوەی ڕاستەوخۆ نیشانەکانی نەخۆشی بە دەرمان بپێکین و دەستی تێ وەردەین، دەبێ هاوسەنگی و یەکسانی هێزەکانی خۆدەرمانی ئینسان جێگیر بکرێنەوە. چونکە ئینسان پێویستە بەیارمەتی تایبەتمەندیەکانی دەروونی و جەستەیی و ئینسانی خۆی دەرمان بکرێتەوە.

- شیاوی جێبەجێ کردنی پزیشکی خۆماڵی بۆ هەموان:

ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە سەیری پزیشکی خۆماڵی بکەین کە بۆ گەیشتن بە گشتگیری تەندروستی هەموو خەڵکی جیهان بەیارمەتی شێوازەکانی دەرمانی پەسەند و دروست، و هەروەها دڵنیابوون و نرخی شیاوی هەموو بابەتەکانی خزمەتگوزاری ئەم شێوازە پزیشکیە، ئەوە پزیشکی خۆماڵی دەتوانێت بە سەرکەوتوویی بڕواتە پێش و خزمەتەکانی پێشکەشی مرۆڤی ناتەندروست و نەخۆش بکات و تەندروستی گشتی و تایبەتی بۆ هەموو کەسێک جێگیر بکاتەوە.

## پشکی سەرەکی لە پزیشکی خۆماڵی و سروشتی

یەکێ لە ئامانجە سەرەکیەکانی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی هەوڵدانە بۆ دابین کردنی تەندروستی مرۆڤەکان بە یارمەتی ڕێکخستنەوەی ئاستی ترازان لادانی مەزاجیان بەرەو خاڵی مەزاجی خۆماکی و سروشتیان. تا وەکوو لە کەمترین ڕێژەدا

ئەم لادان و ترازانە ڕوو بدات و مرۆڤ تووشی نەخۆشی جەستەیی و نائاسوودەیی ڕەوانی و دەروونی نەبێت.

لە دیدی حەکیمانی ئەم لقە پزیشکیەوە هەموومان ئەگەر ئاگەداری بواری تەندروستیمان نەبین مەزاجمان دەترازێت و لە ڕێگەی ڕاستی خۆی لا ئەدات و بەرەو هەڵکشان و داکشان دەچێت و نەخۆش دەکەوین. کاتێ کەسێک نەخۆش دەبێت ئەنجامدانی ڕێنوێنی و ڕەچەتە خۆراکی و دەرمانیەکانی حەکیمی دڵسۆز وەک ئەرکێکی ئایینی فەرزە و دەبێ جێبەجێ بکرێت. چونکە مرۆڤ کاتێ تووشی نەخۆشی بوو سەداسەد وەک کاتی خۆشی و ئاسایی خوداپەرستی و خۆناسینی بۆ نالوێ و ئەنجامدانی دەکەوێتە سەختی و چەرمەسەریەوە. تەنانەت بۆ مرۆڤی تەندروست زۆر گرینگە ئاگەداری ڕێنوێنی و ڕوونکردنەوەکانی حەکیمان بێت و گوێڕایەڵیان بکات تا وەکوو مەزاجی نەترازێت و پێویستی بە چەک و گوللەی دەرمان و نەشتەرگەری نەبێت ڕاستی بکەنەوە و بەرەو خاڵی مەزاجی خۆی ڕێکی بکەنەوە.

## ڕێنوێنی و ڕەچەتەی حەکیمان سێ جۆرە:

- بۆ کاتی ئاسایی و تەندروست: ڕێنوێنی و ڕەچەتەی خۆراکی، دارشتنی بەرنامە و ڕێنامەی ژیانی باش، ڕوونکردنەوەکانی مژاری پاراستنی تەندروستی و پێشخستنی بواری هزر و هەست
- بۆ کاتی نەخۆشی و ناتەندروستی: ڕێنوێنی و ڕەچەتەی خۆراکی و دەرمانی بۆ چاکبوونەوە و چارەسەری تا وەکوو مرۆڤی نەخۆش بەهۆی ناتەندروستی جەستەییەوە پلەکانی پێشکەوتنی هزر و هەستی دوا نەکەوێت.
- بۆ کاتی قەیرانی نەخۆشی بەرەو مەرگی ئەندامێک یا چەند ئەندامی مرۆڤ: خۆسپاردن بە ڕێنوێنی و ڕەچەتەکان حەکیم بە یارمەتی نەشتەرگەری و بڕین و تیمارکردن مەرگی یەکجاری دوور بخاتەوە. کەواتە قەبووڵ کردن و کێشانی ژانی نەشتەر و بڕین دەتوانێت ژیانی ئاسایی بگەڕێتەوە بۆ کەسی نەخۆش.

خاڵی گرینگ لە پزیشکی خۆماڵی و سروشتیدا ئەوەیە کە چاکبوونەوەی نەخۆش

بەستراوەتەوە بە جێگیربوونەوەی مەزاج. واتە تا مەزاج جێگیر نەبێتەوە و بارودۆخی سروشتی یا نزیک بە سروشتی خۆی بە دەست نەهێنێتەوە، مرۆڤ لە چنگ نەخۆشی ڕزگاری نابێت. ئەگەر نەخۆش باشترین خۆراک و دەرمان و نەشتەرگەریش بەکار بهێنێت، بەڵام ئەمانە ئەگەر هاوتەریبی ڕێکخستنی مەزاج نەبن چارەسەری بە دەست نایەت.

## بەرنامەی ڕێکخستنی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری

- دۆزینەوە و ڕاستکردنەوە و ڕێکخستن و ئامادەکردنی هەموو نووسراوەکانی دەرمانی و پزیشکی بۆ چاپی ڕاستەوخۆ یان وەرگێڕان
- پاراستن و هەڵگرتنی دەستنووس و دەقی ڕەچەتە دەرمانیەکان لە مۆزەخانەی چوار وڵاتی ناوەندی کوردەواری و وڵاتانی بیانی دیکە
- ڕێکخستن و ئامادەکردنی فیلم، وێنە و خشتەی شێوازە جۆربەجۆرەکانی چارەسەری و دەرمانی حەکیمانی کوردەواری
- نووسینی هەموو شێوە هەتوان و چارەسەرەکان بە وردەکارییەکانەوە
- توێژینەوە و پشکنین بۆ نووسینەوەی بەرنامە و ڕێنامەی ژیان و کاری حەکیمانی کۆن لە ڕێگەی بنەماڵە و کەسانێکەوە کە ئەیانناسن
- ڕیزبەندی و دەستنیشانکردنی پلەی حەکیمان، تا گرینگایەتی پێدان بە ئاستەکەیان بزانرێت
- هەوڵدان بۆ کردنەوەی کارگەی دووبارە دروستکردنی بەرهەمی گیراوە و شەربەت و ئاوتک و ڕۆن و حەب کە میراتی حەکیمانی کۆنە و زانکۆ و تاقیگەکانی ئەوڕۆیش پەسەندیان دەکەن
- هەوڵدان بۆ کردنەوەی خولی ڕاهێنان لەسەر شێوازی دەرمانی و ئەزموونی حەکیمانی کۆن
- توێژینەوە لە سەر ئاستی پێوەندی ڕووەک و بەرهەمەکانی لە ژیانی ئاسایی، فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی خەڵکی ئێستا و ڕابردوو.

## زاڵبوونی نەریتی نەنووسراو بە سەر پزیشکی خۆماڵی کوردەواری

کاتێ ٢٧١٥ ساڵ پێش ئێستا دەسەڵاتی مادەکان –کە بە بنچینەی کوردانی ئەورۆ ناودێر دەکرێن– بە هێرشی کوورۆشی هەخامەنشی تێک شکا گەلانی نیشتەجێی خاکی کوردستانی ئەورۆ تووشی نەمانی دەفتەر و دیوان و دەسەڵاتی خۆماڵی و سەربەخۆیی خۆیان هاتن. وردە وردە ناو و باوی فەرهەنگ و کەلتووری مادەکان پشتگوێ خرا و بەرەو لاوازبوون ڕۆیشت. کەواتە ئەگەر خەڵکی کورد بە درێژایی ڕۆژگار خاوەنی دەسەڵات و دیوانی سەربەخۆی خۆی نەبووە بەڵام هەمیشە یەکێ لە نەتەوە دەوڵەمەندەکانی ناوچەکە و جیهان بووە لە بواری وێژە و فەرهەنگ و شارستانیەتی تایبەت بە خۆیەوە.

ڕەنگە زۆر کەس پێیان وابێت کە سەردەمانی کۆن کاری نووسین و تۆمار کردن لای گەلان نەبووە یا کەمتر باو بووە. ئەم قسەیە هەرچەند بەپێی گرینگایەتی نووسین لە دنیای ئەورۆ ڕاست دەژمێردرێت، بەڵام پێشینیانیش لە ئاستی پێویستی تاک و کۆمەڵی خۆیاندا گرینگیان بە نووسین داوە. جا کەم و زۆریەکەی بەگوێرەی دیوان و دەسەڵاتی زاڵ بە سەر پێشینیان جیاواز بووە. بۆ نموونە ڕێژەی نووسراوە بەجێماوەکان لای یۆنانیەکان لە هەموو وڵاتانی دیکە وەکوو ڕۆم و چین و هێند و ئێران زۆرترە. گیرشمەن ئاسەوارناسی گەورەی فەرەنسی (١٨٩٥ زایینی) زێد و کارگەی یەکەمی سواڵەتە نەخش و خەتدارەکان، لە ناوچەکانی ڕۆژاوای ئێران واتا زاگرۆس دەستنیشان دەکات. ئەم سواڵەتانە دەریدەخەن کە سەردەمانی ماد خەت و نووسین باو بووە و گرینگی پێ دراوە.

ئەورۆکە وا باوە کە کەسانی خاوەن بیرۆکە و بۆچوون و ئەزموون دەبێ دەرەنجام و ئەزموونەکانیان بنووسن و لە بەردەستی خەڵکی دابنێن و لە پاش مەرگی خۆیشیان خەڵکانی دیکە کەڵکی لێ وەرگرن. ئەگینا بیرۆکە و بۆچوون و ئەزموونی نەنووسراو بەتایبەت بۆ خاوەنەکەی سوودبەخش نییە و ناتوانێ چەندان بڵاو بێتەوە مەگەر بە شێوەی پەند و بەیتی پێشینیان یا گۆرانی فۆلکلۆر. بەپێی باوەڕی خەڵکی ڕۆژگارانی زوو وتاری سەرزارەکی هێزی خودای یەکتایە کە بەخشیویەتی بە مرۆڤ، و خەت و وتاری نووسراویش دەستکار و سازکراوی

دەستی مرۆڤە. جا ئەوەی ڕاستەوخۆ خاوەنەکەی خودا بێت پیرۆزترە. بۆیە زۆربەی وتار و بیرۆکە و ئەزموون و چیرۆکەکان زۆرتر بە شێوەی زارەکی سینە بە سینە گوازراوەتەوە یان دۆعاکانی هەرەکۆنی ڤیدای هیندووەکان و یەشت و وەندیدادەکانی زەردەشت سەرزارەکی هەڵدەگیران و لەبەر دەکران و دەخوێندرانەوە، چونکە پێیان وابوو بە ڕێگەی نووســـین پیت و پیرۆزیان نامێنێت. یان لە فەرهەنگی کەونارای ئێراندا هاتووە کە خەت و نووسین دیاردە و دەستکاری دێوەکانە کە تەهموورس لە ئەهریمەنەوە فێر بووە. ســاڵی ٢٢٤ زایینی کە دەســەڵاتی ســاســانیەکان لە ئێران دامەزرا، ئەردەشــیری بـابەکـان فەرمـانێک دەر ئەکـات کە ســـەرجەم وتـار و ســـروودەکانی ئاڤێســـتا کۆ بکەنەوە و هەموو بابەتەکانی دیکە وەکوو پزیشـــکی، ئەستێرەناسـی، مەنتق و زانسـتی پیشـەسـازی و دروسـتکردنی چەک و کەرەسـتە پاشکۆی ئاڤێستا بکەن تا بپارێزرێن.

ئەو شتەی کە لە ناو هەموو گەلاندا زەق و بەرچاوە، نەریتی زۆرینەی چیرۆک و داستان و بەیت و هۆنراوەکانە کە ڕەنگە تا هەزار ساڵی پێشوویش هەر بە شێوەی ســەزارەکی بوون و ســینە بە ســینە هاتوون و پارێزراون. بۆ وێنە شــاهنامەی فێردەســـی لای فارســـەکان، مەم و زینی خانی لای کوردەکان و هۆنراوەکانی ڕۆژگاری جاهیلیەت لای عەرەبەکان. ئەگەر ئێمەی کورد ســـەیری چیرۆک و بەیتە باوەکانی پێشـــینیانمان بکەین دەبینین زۆربەی ئەمانە لای هەڵگرانی تایبەتی خۆیان وەکوو بەیتبێژ و حەیرانبێژان دەپارێزرێن و لە کاتی پێویســـت بۆ خەڵکی ئاســـایی دەگێڕدرێنەوە، وەکوو بەیتی لاس و خەزاڵ، شـانامەی کوردی، خۆرشـید و خاوەر، شـــیرین و فەرهاد، خەج و ســـیامەند، زەمبیل فرۆش، لەیلی و مەجنوون، ناســـر و ماڵماڵ، کوڕ سەواوە کوردە و دەیان بەیت و چیرۆکی دیکە.

یان ئەگەر لە بواری دیرۆکناســـی و مێژوو ســـەیری ئەم بابەتە بکەین، دەبینین تەنانەت مێژووی کورد ســـەرەتا بە چیرۆک و ســـەرزارەکی لە یادگەی خەڵکدا بووە یـان ئەوەیکە لە نـاو پەرتووکە مێژوویەکـانی ئێران و یۆنـان و عەرەب و ڕۆم بە شـــێوەی پرژ و بڵاو هەبووە. جا لێرەدا بوو یەکەم کەس کە مێژووی تـایبەت بە کوردستانی نووسی شەرەفخان بتلیسی (١٥٩٧ زایینی) بوو کە ساڵی ١٥٩٧ دەستی دایە کۆکردنەوەی هەموو ئاســەوار و یادەوەری و گێڕانەوەکانی تایبەت بە خەڵک و

میرانی کوردستان و لە پەرتووکەکەی بە ناوی شەرەفنامە مێژووی کوردی بۆ هەمیشە نووسییەوە.

ئەگەر بێینە سەر بابەتەکەی خۆمان یانێ پێشینە و ئەزموونە نەنووسراوەکانی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری، دەتوانین هۆکاری سەرەکی ئەم بابەتە لە پەرتووکی (قانون فی الطب) هەڵێنجێین. ئەبووعەلی سینا دانەری ئەم پەرتووکە کاتێ لە پێشەکی بەرگی یەکەمدا باس لە نیاز و ئامانجی نووسینەکەی دەکات، دەڵێت لە سەر ئامۆژگاری و راسپاردەی هاورێکم ئەم کارەم دەست پێکردووە هەتا بەم کارە دەرمان و حێکمەتی چارەسەری و پزیشکی پزیشکە راستەقینەکان جیا بکەمەوە لە خورافات و فریو و جادووی کۆلکەپزیشکەکان[1]. ئەبووعەلی سینا زۆر بە جوانی تێگەیشتووە کە کۆمەڵگا هەمیشە پێویستی بە کەسانی حەکیم و پزیشک هەیە تا خەڵک لە نەخۆشی رزگار بکەن و تەندروستی جێگیر بکەنەوە، بەڵام کەسانی هەلخواز و فریوباز خۆیان دەخەنە بەرگ و جلی حەکیمان و هیچ کە نەخۆشان چاک ناکەنەوە گیرفانی نەخۆشانیش دادەتەکێنن و لە چاکبوونەوەش هیوابڕاویان دەکەن. لێرەدا دیارە ئەگەر خەڵک تێ بفکرێت بنەما و یاسا و حێکمەت و ئەزموونە راستەکانی ناو (قانون فی الطب) حەکیم و ناحەکیم لێک جیا دەکاتەوە.

کاتێک ناوەرۆکی پەرتووکی (قانون فی الطب) دەخوێنینەوە، ئەم حەکیمە گەورەیە بە چەند شێوە بابەتەکانی نووسیوە و بنەوانی قانوونەکەی بە قایمی هەڵبەستووە:

یەکەم: لێکدانەوە و بۆچوونەکانی خۆی بە شێوەی بیرۆکە

دووهەم: دەرەنجامی لێکدانەوە، بۆچوون و توێژینەوەکانی خۆی

سێیەم: لێکدانەوە و بۆچوونەکانی حەکیمانی دیکە وەکوو جالینووس و دیسکۆریدۆس بە شێوەی بیرۆکە (بە رەتکردنەوە یا پەسەند کردن)

چوارەم: دەرەنجامی لێکدانەوە، بۆچوون و توێژینەوەکانی کەسانی دیکە (بە رەتکردنەوە یا پەسەند کردن)

پێنجەم: ئاماژە بە تاقیکردنەوە، بۆچوون و ئەزموونی حەکیمانێ کە ئەڵبەتە ناویان دەرناخات

---

[1] . مامۆستا هەژار لە وەرگێڕانی قانون فی طب هەمبەری فارسی "پزشکنما"ی بەکار هێناوە.

شەشەم: نەریتی دەرمانی و خۆراکی و چێشت و مەوادی ناو چێشتخانە و هێشخانەکانی خەڵکی ئاسایی و میرزادەکان

هەروەک باسمان کرد بەرهەمی (قانون فی الطب) ئەنجامی کۆمەڵێک هۆکارە وەکوو:

- ئەزموونی زارەکی پێشینیانی ناسراو و نەناسراو، ئەزموونی نووسراوی حەکیمان و پزیشکانی ناوخۆی (وەکوو ناوچەکانی خۆراسان، سیستان، تەبەرستان، سپاهان، لوڕستان و کوردستان)
- ئەزموونی زارەکی پێشینیانی ناسراو و نەناسراو، ئەزموونی نووسراوی حەکیمان و پزیشکانی دەرەوە وەکوو یۆنان و هێند
- ئەزموون و ئەنجامی تاقیکردنەوە و توێژینەوەکانی کەسێتی ئەبووعەلی سینا کە لە نۆڕینگەکانی بوخارا، بەلخ، خۆراسان، گورگان، ڕەی، هەمەدان و ئەسفەهان

خاڵی گرینگ لە کۆی بابەتەکانی سەرەوە ئەوەیە کە ئەوسا کەمتر کەسێک وەک ئەبووعەلی سینا پەیدا دەبوو کە پسپۆڕیی تەواوی لە سەرجەم نەخۆشییەکانی مرۆڤدا هەبوو بێت. بۆ نموونە ئەگەر سەیری کارنامەی حەکیمانی زیندوو یان پێشووی کوردەواری خۆمان بکەین زۆربەیان بە تەنیا شارەزاییان لە سەر یەک یان چەند بابەتێکی دەرمانی و چارەسەری هەبووە. جارجارە لە هەر ناوچە یان شارێک کەسێک بە ناوی حەکیمی سەرباشقە دەردەکەوت و دەرمان و چارەسەری زۆربەی نەخۆشیەکانی دەزانی. بۆ نموونە کەسانێک تەنیا کاری شکیان و گرتنەوەیان دەکرد، یەکێ کاری منداڵبوون و نەخۆشی ژنانە، یا کەسێ بۆ شێلان و کوڵنج تەقاندن و کەهەنگ، کەسێ بۆ ناوکگرتنەوە، سەرگرتنەوە، گوشەکگرتنەوە، یا دەیان بابەتی دیکە. هەروەها نموونەی کەسانێک وەک حەکیمی گەورە و سەرباشقە دەردەکەوتن وەکوو سمایل حەکیمی سلێڤانی و شێخ عوسمانی دۆڕۆ. هەرچەند لە پەراوێزی کتێبی گیابەند و هەروەها چیرۆکی ژیانی سمایل حەکیمدا هاتووە کە ئەم حەکیمە سەرەڕای حەکیمی بۆ هەموو نەخۆشییەکان، بەڵام لە بواری چاودا زۆر زیرەک بووە.

## تایبەتمەندی و بنەماکانی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری

ئەگەرچی تا وەکوو ئێستا لە لایەن هیچ وزارەتخانە و ڕێکخراوێکی جیهانی بابەتی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری بە فەرمی نەناسراوە و تۆمار نەکراوە، بەڵام ئەم بابەتە لای کۆمەڵەی گیادەرمانانی ئێران، ناوەندی گیادەرمانی شەفای کوردستان لە شاری سنە و کۆمەڵەی ڕوەکناسانی باشووری کوردستان دەناسرێت و گرینگی بە بابەتەکانی دەدرێت. شیاوی خۆیەتی ئەم دەستمایە و فەرهەنگە نیشتمانییە زۆرتر بپارێزرێت و لایەکانی پێوەندیدار هەوڵی تۆمارکردنی ناوخۆی وڵات و جیهانی بۆ بدەن.

سەرجەم ئەزموونەکانی نزیک بە ٤٠ ساڵەی ناوەندی گیادەرمانی شەفای کوردستان کارنامە و پێشینەیەکی بەنرخە بۆ سەلماندنی ناوی ئەم فەرهەنگە پرشنگدارە بە لقێکی نوێ لە پزیشکی تەواوکار و جێنشین. شەفا زۆربەی ئەزموون و ئەنجامە باوڕپێکراوەکانی ئەم شێوازە پزیشکییەی لە حەکیمان و هەڵگرانی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری بەتایبەت ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان کۆ کردووەتەوە و کاری ڕێکخستن و ڕاستکردنەوە و ڕێکوپێک کردنی سەرەتایی بۆ ئەنجام داوە بەڵام هێشتا بە شێوەی نووسراوی فەرمی یا کتێبێک بڵاوی نەکردووەتەوە.

کاک بورهان حوسەینی سەرپەرست و ئەندامی سەرەکی پرۆژەی کۆکردنەوە و ئامادەکردنی لقی پزیشکی کوردەواری هەموو ئەزموونە کۆکراوەکانی ئەم لقە پزیشکییەی لە سەر پارچە قاقەزێکی گەورە بە شێوەی نەخشەی دارێکی گەورە بە چڵ و پۆی زۆرەوە دارشتووە و نووسیوە. ئەم دارە گەورەیە ڕیشەی لە ناخی فەرهەنگ و شارستانیەت و مێژووی گەلی کوردستاندا داکوتاوە. لاسکی سەرەکی دارەکە ناوی پزیشکی خۆماڵی/ سوننەتی کوردەوارییە، شاچڵەکانی بە (گیادەرمانی، پارێز، شێلان، کۆڵنج تەقاندن، وەرزش، شکستەبەندی، فریشککەوتن، چاوداتەکاندن، نیمەنمەک، قانگدان، دڵکەوتن، ناوکگرتنەوە، سەرگرتنەوە، گۆشەکگرتنەوە، کەهەنگ و هتد) و چڵە باریکەکانی بە دەیان و سەدان ڕەچەتە، ئامۆژگاری، ڕێنوێنی و ڕێکار (وەکوو: خواردنی بنێشتەتاڵ بۆ برین و ترشی گەدە، خواردنی چایی قەزوان بۆ گیرسانەوەی سکچوون، بەکارهێنانی خورما و دووگ بۆ شکاندنەوەی ئێسک یان

ڕەوانەوەی گرێ و لووی گۆشت و خوێن، زەفت و قیر بۆ گیرساندنەوەی شکانی پەراسوو، شیری ژنێ کە منداڵی کچی هەیە بۆ ژان و گلی چاو، مێخەک بۆ ناو کولۆری ددانێ کە ژان دەکات، خوێنی کەروێشکە کێویی ماندوو بۆ نەخۆشی هەناسەسواری، دانوولە بۆ منداڵێ تازە ددانی دەردێت، دووکەڵدان گوێچکە یا ئەندامی خەتەنەکراو بۆ ئەسرەوتنی ئێش و هتد). بەم شێوەیە نەخشەی لقی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری لە سەر ئەم ڕیشە و قەد و شاچڵ و چڵە وردیلانە پێشان دەدرێن.

داری پزیشکی خۆماڵی کوردەواری بەیارمەتی پسپۆڕانی دڵسۆز و خەمخۆرانی فەرهەنگی نیشتمانی خەڵکی کوردستان کە ناوەستن و ئەزموونەکانی بەجێماوی پێشینیان کۆ دەکەنەوە و ڕادەستی داڕێژەرانی ئەم دارە بەردار و سێبەرخۆشەی دەکەن و ساڵ بە ساڵ دارێکی پڕتڕ و چڕتر دەر ئەکەوێت. تا وەکوو بەتەمای خوا هەوڵەکان یەک بگرن و بەری ڕێکەوتن و سەرکەوتن بگرن تا تایبەتمەندیەکان و سوودە ناوازەکانی لقی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری لای وەزارەتی تەندروستی ئێران و باشووری کوردستان دەربکەوێت و هەنگاوەکانی تۆمارکردن و ناساندنی بۆ هەڵبگیردرێت.

ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی بڕوانینە پزیشکی خۆماڵی دنیا، ٤ ناوچەی بەناوبانگ جیهان زۆرترین پێشینەی ئەم لقە پزیشکیەیان هەیە: ئێران، چین، یۆنان و هێند. کۆی ئەزموونەکانی پزیشکی خۆماڵی ئەم ٤ ناوچەیە نیشانی دەدەن کە پشکی هاوبەش و یەکسان لە نێوان ئەم وڵاتانە زۆرە. بۆیە زانایان باوڕیان وایە ئەم پشکە هاوبەشانە نیشاندەری ئەوەن کە پشکی مرۆڤایەتی و پێوەندیەکانی نێوان کۆمەڵگاکانی مرۆڤ لە سەر ئەم زەوییە، هەمیشە وایان کردووە کە مرۆڤەکان ئاڵوگۆڕی ئەزموون و بۆچوون بکەن و پاش هەر دووربوونەوە دیسان لێک نزیک ببنەوە. خاڵێکی تر بۆ نزیکایەتی ئەزموونی پزیشکی خۆماڵی ئەم چوار شارستانیەتە ئەوەیە کە فاکتەرەکانی بەروبوومی ڕووەک و حەیوان و کان و کانزا لە نێوان ئەم وڵاتانە دەست بە دەست کراوە و هەمیشە تێگەیشتن و پێگەیشتنیان پێکەوە بووە.

نزیکترین لقی پزیشکی بە لقی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری، لقی پزیشکی ئێرانی ئەخلات و شێوازی پزیشکی خۆماڵی خەڵکی لوڕستانە. وەزارەتی تەندروستی ئێران

ساڵانێکی زۆرە بە فەرمی لقەکانی پزیشکی ئەخلات، پارێزی ئیسلامی و خۆماڵی ئێران بە ناوی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی و ئیسلامی ناساندووە و بۆ ئەم کارە بەشی تایبەت بەم پزیشکیە لە دیوانی سەرۆککۆمار و وەزارەتی تەندروستی و وەزارەتی خوێندنی باڵا دامەزراندووە. ساڵی ٢٠١٤ بەرپرسانی تەندروستی، فەرمانگەی فەرهەنگ و ئاسەوارەکان و پارێزگای لورستان توانییان ئەزموونەکانی پزیشکی خۆماڵی ناوچەی لورستان و لەکستان بە ناوی (پزیشکی خۆماڵی لورستان) لە وەزارەتی تەندروستی ئێران تۆمار بکەن و بۆ ناساندن و تۆمارکردنی جیهانی هەناردەی ڕێکخراوی (WHO) و یۆنێسکۆی بکەن. دیارە نزیکایەتی ناوچەیی و نەژادی و فەرهەنگی کورد و لوڕ، وا دەکات زۆربەی ئەزموونە هاوبەش و هاوشێوەکانمان بە ناوی ئەوانەوە بنووسرێتەوە و کار بۆ سەلماندنی لقی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری گرانتر بێتەوە.

بەگشتی لقی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری نموونەی هاوبەش و هاوشێوەی ئەزموونی لقەکانی دیکەی ناوچەکە و جیهانی تێدایە، وەکوو: شێلان، گەرماو و مەلە، گیادەرمانی، سروشت و مەزاج، وەرزش، ئامۆژگاری زانستی بژیو و ژیان، پارێز، کاڵخۆری، ئاودەرمانی، سروشت دەرمانی و هتد.

یەکێ لە بنەما و کۆڵەکەکانی گرینگی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی و کوردەواری ئەمەیە کە جەستەی هەموو مرۆڤەکان خاوەنی سروشتی (مەزاج) تایبەت بە خۆیانن. ئەرکی حەکیم و پزیشک و دەرمانگەر ئەوەیە سەرەتا سروشتی نەخۆش بناسێت پاشان بەیارمەتی ڕەچەتە و ڕێنوێنی و ڕێچارەکانی تەندروستی، خاوێنی، جۆری چێشت و نان و ئاو، دەرمان، شێوەی هەڵسوکەوت، شوێنی حەسانەوە و خەوتن و کارکردن، پیشەی شیاو و گونجاو، وەرزش و جووڵانەوە و دووری لە تەوەزەلی و بێکاری، هاوسەنگی و یەکسانی جەستە و دەروونی کەسی نەخۆش دیسان بگەڕێنێتەوە و نەخۆش یارمەتی بدات بچیتەوە سەر باری ئاسایی و سروشتیی ژیانی.

بەگشتی پزیشکی خۆماڵی وەکوو لقی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری لە پێشدا گرینگی بە پێشگرتن لە نەخۆشی ئەدا تا وەکوو دەرمان و نەشتەرگەری. کەواتە خواردنی خاوێن و تەندروست و بەهێز، ئاوی خاوێن و خاوەن پلەی گەرمی

سوودبەخش نەک زیانبەخش، هەوا و هەناسەی ژینبەخش، جووڵانەوە و وەرزشی بەردەوام و سووک، جیاکردنەوەی خواردنی خۆراک و دەرمان و ژەهر، پشوودان و نووستن لە کات و ئەندازەی شیاو، ژینگە و جەستەی خاوێن، بیرکردنەوە لە تەندروستی و ئاسوودەیی و ئاشتی و ئارامی لەجیاتی بیرکردنەوە لە نەخۆشی و شەڕ و ناخۆشی، دووری گرتن لە کانگا و بنکەی سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی. ئەم خاڵە گشتیانە لە پزیشکی خۆماڵی وا دەکەن دنیابینیەک بدەن ببەخشن بە مرۆڤ کە هاوسەنگی و یەکسانی باری ڕۆح و جەستە بەرەو مسۆگەر کردنی تەندروستی ئەم لفەدوانەیە جێگیر بکەنەوە. بەواتایەکی دیکە پزیشکی خۆماڵی و سوننەتی بۆ چاکبوونەوە و چارەسەر کردنی تاکی نەخۆش ڕێگە و ڕەچەتەی کارساز و چارەسەری ئاسان و ساکار پێشکەش دەکات.

## تایبەتمەندیە سەرەکیەکانی ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی

١) ڕیزبەندی و ئەولەویەتی دەرمان و چارەسەری نەخۆش:

سەرەتا خواردن، پاشان دەرمان و دوایی نەشتەرگەری. کەواتە پێویستە سەرەتا حەکیم لە ڕێگەی دەستنیشانکردنی جۆر و ڕێژە و کاتی بەکارهێنانی خۆراک و چێشت نەخۆش بەرەو چاکبوونەوە ببات، پاشان ئەگەر بەم شێوەیە دیسان نەخۆشیەکە درێژەی هەبوو دەرمانی خۆراکی بۆ دابنێت، ئەگەر بە دەرمانیش چارەی نەبوو ئاخرین هەوڵی خۆی بخاتە گەڕ و نەشتەرگەری بۆ بکات. ئەم ڕێنامەیە ڕوانگەیەکی گرینگە لە ڕێبازی پزیشکی خۆماڵیدا، چونکە خۆراک باشترین دەرمانە و کاریگەری لاوەکی و دەرهاویشتەی خراپی لە سەر ئەندامەکانی دیکەی جەستە دانانێت بەڵام دەرمان دەتوانێت ئەندامی دیاریکراوی نەخۆش چارەسەر بکات و کاریگەری لاوەکی و خراپی خۆی لە سەر جەستە و ڕەوان بە جێ بهێڵێت.

حەکیمی یۆنانی بۆقرات (٤٦٠ پێش زایین) بەم شێوەیە ئامۆژگاری شاگردەکانی دەکات: با خواردنتان دەرمانتان بێت و دەرمانیشتان خواردنتان. سوێندنامەیەکە بوقرات سەردەمی خۆی دایناوە تا حەکیمان و دەرمانگەرەکان پابەندی بن ئێستاکەش پزیشکانی جیهان پاش تەواوبوونی خولی خوێندنی پزیشکیان دووپاتی

دەکەنەوە و وەک سوێندێکی پیرۆز گرینگی پێ دەدەن.

٢) ڕیزبەندی خۆراک، دەرمان و ژەهر:

- خۆراکی پەتی:

نان، برێنج و گۆشت و هێلکە. لێرە تەنیا بواری خواردن لەبەرچاو دەگیردرێت و تێر کردنی سک و دابین کردنی کالۆری و وزەی جەستە گرینگە، بەڵام نابێ زیادەڕەوی لە خواردنی پەتی بکرێت چونکە بە ئەندازەی ڕێژەی زیادەڕەویەکە دەرهاویشتەی خراپ لە سەر جەستە بە جێ دەمێنێت.

- خۆراکی- دەرمانی:

نیسک، نۆک، باقلە و زۆربەی میوە و هەندێ لە سەوزەکان وەکوو خەیار و کاهوو. لێرە سەرەڕای دابین کردنی پێداویستی خۆراکی جەستە، سوودی دەرمانیش لە بەرچاو دەگیردرێت. سنوورداری بۆ بەکارهێنانی ئەم بەشە وەکوو ڕیزی خۆراکی پەتییە واتە نابێ زیادەڕەوی بکرێت لە بەکارهێنانی خۆراکی- دەرماینەکان. ڕێژەی زیادەڕەویەکە دەتوانێت دەرهاویشتەی خراپ لە سەر جەستە دابنێت.

- دەرمانی- خۆراکی:

پیاز، تووی سپی، بەڕوو، سنجوو، هەڵووژە و زۆربەی سەوزە خۆراکیەکان. ئەم بەشە سەرەڕای دەرمانی بوون، باری خۆراکی شیاویشی هەیە بەڵام نابێ زۆر لە پێویست بەکار بهێندرێت. ڕێژەی خواردنی زیاتر لە پێویست دەرهاویشتەی خراپ لە سەر جەستەی مرۆڤ دادەنێت.

- دەرمانی پەتی:

ڕازیانە، زەنجەفیل، بەیبوون، گیاچەقچەقە، وەنەوشە و جاترە. لێرە بابەتەکان زۆرتر بۆ مژاری چارەسەر و دەرمانی نەخۆشیەکان بەکار دەهێندرێت و باری ژەهراوی بوونیان زۆر بەرچاو نییە. تەنیا دەبێ لە ئەندازەی دیاریکراو، بەپێی ئەندازەی پێویستی دەرمانی و لە کاتی دیاریکراودا بخورێن و بەکار بهێندرێن. باشتر وایە ئەم بەشە وەبێ ڕێنوێنی و ڕەچەتەی پزیشک بەکار نەهێندرێت. ڕێژەی خواردنی زیاتر لە پێویستی ئەم بەشە دەتوانێت دەرهاویشتەی خراپ لە سەر جەستە دابنێت.

- دەرمانی– ژەهراوی:

مێکووک، بێژان، بەنگ و گیای پەلەکەرگ. لێرە ئەو دەرمانانە کە باری ژەهراوییان کەمترە و بەپێی بۆچوون و ڕێنوێنەکانی پزیشـــک بەکار دەهێندرێن. کەواتە ڕێژەی پێویســـتیی دەرمانی ناو مادە و ڕوەکەکە بەدروســـتی لەبەرچاو بگیردرێت چونکە گۆڕانکاری لە ڕێژەی بەکارهێنان، باری ژەهراوی ناو مادە یا ڕوەکە زاڵ دەکات و دەرهاویشتەی خراپ لە سەر جەستە دادەنێت. بەکارهێنانی ئەم بەشە وەبێ ڕێنوێنی و ڕەچەتەی پزیشک ڕێگەپێدراو نییە.

- ژەهراوی– دەرمانی:

زۆربەی تۆوە تاڵەکان، تۆوی ئەســـپەند، کافوور و گووژاڵک. ڕوەک و مەوادی ئەم بەشـــە خاوەنی پێکهاتەی دەرمانی و ژەهراوی تێکەڵاون، کەواتە پێویســـتە بە گرینگیدان بە بەشـــە دەرمانیەکە ئاگەداری بەشـــە ژەهراویەکەیش بین. پزیشـــکان و دەرمـانگەران بەگوێرەی ئەزموونی چەنـدین و چەنـد جـارە ڕێژەی دیـاریکراو و ڕێگەپێدراویان دەســـتنیشـــان کردووە و بابەتی دەرمانی بە کەمترین زیانی ژەهرەکە ڕادەکێشـــن. بەکارهێنانی ئەم بەشـــە وەبێ ڕێنوێنی و ڕەچەتەی پزیشـــک ڕێگەپێدراو نییە.

- ژەهراوی تەواو:

وەکوو گیای زڕەگێژنۆک (شـــەوکەران)، هەلایهەل، خەربەنگ و چڵکی گوێچکەی مرۆڤ. بابەتی ئەم بەشـــە هاوشـــێوەی بابەتی ژەهراوی- دەرمانیە بەڵام ڕێژەی ژەهری ئەم بەشـــە زۆر زیاترە لە دەرمانەکەی. ڕێژەی وردبینی و ڕەچاو کردنی ڕێژە و ئەنـدازەی بەکـارهێنـان بۆ ئەم بەشـــە پێویســـتی بە چەنـدین بەرابەر تاقیکردنەوەیە زیاتر لە بەشـی ژەهراوی- دەرمانی. کەواتە تەنیا کاتی زۆر هەستیار و بە چاوەدێری پزیشک و ڕەچاوکردنی سەرجەم خاڵەکانی پێویست و ئامادەبوونی هەموو کەرەســـتە و پێداویســـتیەکان بەکارهێنانی ئەم بەشـــە بۆ دەرمان پەســـەند دەکرێت. بەکارهێنان وەبێ ڕێنوێنی و ڕەچەتەی پزیشـــک ڕێگەپێدراو نییە و زۆر مەترسیدارە.

- خۆراکی ژەهراوی:

ئەم بەشـــە بەرهەمی خۆراکیی کارگەکانی پیشـــەســـازی و ڕێچکەی تەکنەلۆژیای

ئەمڕۆیە کە مرۆڤ بۆ دابین کردنی پێداویســـتیەکانی جارجارە ناچار بووە مەوادی ناخۆراکی بگۆڕێت بە خۆراک یا تێکەڵاوی مەوادی خۆراکی بکات یا ئەوەیکە لە ئەنجامی بەرهەمهێنانی بەرهەمی خۆراکی گەلێک گۆڕانکاری ئامێری و کەرەســتەیی بە ســـەر خۆراکەکەدا بهێنێت و خۆراکە پەتیەکە بکات بە ژەهری خۆراکی، وەکوو شەکر، خوێ، سووسیس، کالباس و زۆربەی خۆراکەکانی ناو بەستە و قوتووەکان

- خۆراکی- دەرمانی- ژەهراوی:

چینیەکان پەندێکیان هەیە دەڵێن هەموو شتێ کە بە ئاسماندا هەڵدەفڕێ بێجگە لە فرۆکە و هەموو ئەوانەی بە زەوی وشـــک و بە دەریادا بڕوات بێجگە لە گەمیە و ماشێن، هەموو بوونەوەرێکی ئەم جیهانە بۆ خواردن دەبێت. کەواتە لە کەکرەی تاڵ و شـــەراب و مەی تا ژەهر و گۆشـــتی دووپشـــک و مار هەموو ڕێگەپێدراون بۆ خواردن. ئەم بابەتە دەکرێت لە سەرێ ترەوە بۆی بچین و لێکی بەینەوە. لە ڕوانگەی ئایین و زانســتی پزیشــکیەوە کاتێ هیچ دەرمانێکی جێنشــین دەســت نەکەوت ڕێگە هەیە دەرمانی ناو ئەم بەشـــە بەکار بهێندرێت بەڵام زۆر بە زانســـت و پارێزەوە. کەواتە پێویســـتە کەســـانێک کە ڕوو لە خواردن و بەکارهێنانی ئەم بەشـــە دەکەن زانیاری تەواویان هەبێت کە هیچ دەرمانێکی دیکە لە بەردەســتدا نییە و تەنیا بەشــێ دەرمانی ناو ئەم بەشـــە دەکرێت بەکار بهێنرێت. کەواتە هەبوونی مەرجی ناوبراو تەنیا مۆڵەتی بەکارهێنانی ئەم بەشـــەیە. بەگشـــتی پێویســـتە بۆ تەندروســـتبوون بەرامبەر بە زیان و مەترســـیەکانی بەشـــی ژەهری ئەم بابەتە لێزانی و شـــارەزایی زۆرمان لە سەر ئەم بابەتە هەبێت، واتا:

ژەهری پەتی[١] و تێکەڵاوی دەرمان و ژەهر[٢] یا تێکەڵاوی ژەهر و دەرمان[٣] بێت.
هەرچی بێت بەشێکی کەمیش بێت لە ناو ئەم ڕیزەدا بەشی خۆراکی و دەرمانیە بەڵام بەشـــی زۆری ژەهرەکەی ڕێگە نادا زۆر بە ئاســـانی لێی نزیک بینەوە. کەواتە بەکارهێنان وەبێ ڕێنوێنی و ڕەچەتەی پزیشک ڕێگەپێدراو نییە و مەترسی دروست دەکات.

## ڕیزبەندی خۆراك بۆ دەرمان لە ڕوانگەی پزیشکی خۆماڵی

زانایانی بواری خۆراک، هەموو ڕوەکەکان بە خۆراکی ناو دەبەن. واتا ڕاستەوخۆ یا ناڕاســتەوخۆ مرۆڤ بەربوومی هەموو ڕوەکەکانی بۆ ئەخورێت. لە خوارەوە ئەم بیرۆکەیە ڕوون دەکەینەوە:

- گەنم، برێنج و پەتاتە: مرۆڤ ڕۆژانە بەکاریان دەهێنێت و وزەی جووڵە و گەڕان و وەستان و ڕۆیشتن لەم ڕوەکانە وەردەگرێت.

---

١. ژەهری پەتی: ڕیزێک لە خۆراک تا ژەهر کە ڕێژەی ژەهری دوو بەرابەر و چەند بەرابەرە لە دەرمان و خۆراکیەکەی. کەواتە ڕێژەی خۆراک و دەرمانی زۆر خوارترە لە ڕێژەی ژەهری. ئەگەر لە ڕێژەی ١٠ یەکە، ژەهر ٧ یەکەی بەر بکەوێت، ڕیژەی دەرمان و خۆراک پێکەوە ٣ یەکە دەبن. لە کۆی ٣ یەکەی دەرمان و خۆراک ئەگەر ڕێژەی ماکە دەرمانیەکە زۆرتر لە خۆراکەکە بێت شیاوی خواردن و بەکارهێنان نییە وەک ژەهری مار و دووپشک و مادەی سیانوور، مەگەر بەشە دەرمانیەکەی لێ جیا بکرێتەوە و بە ڕێژەیەکی کەم لەگەڵ ڕێژەیەکی زۆر لە مەوادی دیکە تێکەڵ بکرێت و تەنیا لە کاتی زۆر پێویست و فریاگوزاری بەکار بهێنرێت. ئەویش زۆر بە زانست و پارێزەوە، بە ڕەچاو کردنی ڕیژەی یەک میلی گرام زیاد و کەمی

٢. تێکەڵاوی ژەهری پەتی و دەرمان: ڕیزێک لە خۆراک تا ژەهر کە ڕێژەی ژەهر دووبەرابەرە لە دەرمان و خۆراک. کەواتە ڕێژەی خۆراک و دەرمان نیوە یا کەمێ زۆرترە لە نیوەی بەشی ژەهەرەکە. ئەگەر لە ڕێژەی ١٠ یەکە، ژەهر ٥ یەکەی بێت و ڕێژەی دەرمان ٢ یەکە و خۆراک ٢ یەکە بێت. خواردن و بەکارهێنانی بۆ دەرمان دەشێت بەڵام بەکارهێنانی زیاتر لە دەرمان زیان و مەترسیەکەی زۆرتر دەکاتەوە وەکوو گۆشتی مار و دووپشک

٣. تێکەڵاوی دەرمان و ژەهری پەتی: ڕیزێک لە خۆراک تا ژەهر کە ڕێژەی بەشی ژەهر و بەشی دەرمان و خۆراکی نیواونیوە. کەواتە ئەگەر لە ڕێژەی ١٠ یەکە، ژەهر ٥ یەکەی بێت و ڕێژەی دەرمان ٢ یەکە و خۆراک ٣ یەکە بێت، دەکرێت کاتی دەرهێنانی بەشی ژەهرەکەی وەکوو خۆراک بخورێت و زیاتر لە دەرمان ڕێگەی خواردنی هەیە، وەکوو مەی و شەراب

- نیسک و گوێز: بۆ وەرگرتنی وزەیەکی زۆرتر لە ڕیزی سەرەوە بەکاریان دەهێنێت و ئاستی جووڵە و گەڕان و وەستانی زۆرتر دەکات.
- وێنجە، گلێنە و کەما: بە زۆری مرۆڤ ڕاستەوخۆ چەشنی خواردن بەکاریان ناهێنێت بەڵام مانگا و مەڕ و بزن ئەم ڕوەکانە دەخۆن و بەرهەمی شیرەکەیان ڕۆژانە مرۆڤ بەکاریان دەهێنێت.
- بیبەر، زەردەچێوە و شویت: مرۆڤ هەمیشە حەزی لە تاقیکردنەوەی چێژ و بۆ و ڕەنگە جیاوازەکان بووە یان ئەوەیکە بۆ نموونە یەک یا دوو چێژ تێکەڵ بکات و چێژێ جیاوازتر دروست بکات. ئەم کارە وا دەکات مرۆڤ هەندێ ڕوەک بە ڕێژەیەکی کەم لە خواردنە سەرەکیەکانی بکات.
- گوڵە گۆزروان، تووی خاکشیر و سەلکی توور: مرۆڤ بەپێی ئەو ئەزموونە پێشووانە کە لە خواردنی ڕوەکەکانی وەرگرتووە، کاتی پێویست هەندێ لە ڕوەکەکان هەڵدەبژێرێت و بێ ترس دەیانخوات و سوودی دەرمانی و چارەسەری خۆی مسۆگەر دەکات.
- سەلکی هاڵیکوک، تووی بیبەر و ڕەگی مێکووک: بەپێی ئەزموونەکانی پێشوو هەندێ لە ڕوەکەکان بە لە بەرچاو گرتنی ڕێژەی دیاریکراوی خواردنیان، دەتوانێت بۆ چارەسەری و دەرمان بەکاریان بهێنێت، بەڵام خواردنی بەردەوامی ئەم ڕوەکانە مرۆڤ تووشی کێشە و ناخۆشی جەستەیی دەکەن.
- خەشخاش، کۆکا و تووتن: خواردنی هەندێ ڕوەک ڕەنگە دیاردەیەکی دەگمەن دروست بکات وەکوو خواردنی شیلە و تووی خەشخاش کە مرۆڤ هەست بە نەمانی ئازار و ژان دەکات. ئەم کارە ڕەنگە هێندە دووپات بووبێتەوە و تاقیکردنەوەی لە سەر کرابێت تا مادەی مۆرفینیان پەیدا کردبێت و ئەوڕۆکە سەختترین بریندار ئەگەر دەرزیەکی مۆرفینی لێ بدەن بۆ ماوەیەک هەست بە ئێش ناکات.
- خەربەنگ، شەوکەران و تاتووڵە: ئەگەر مرۆڤ لەم سروشتەدا چەشنی خۆراکخۆر هاودەم و هاوڕێی ڕوەکی خۆراکساز بووە زۆر بە ئاسانی نەیتوانیوە هەموو ڕوەکەکان بخوات. ڕەنگە چینی مرۆڤ بەهۆی خواردنی ڕوەکەکانەوە ئەزموونی دەیان کوژراو و نەخۆشکەوتووی لا دەست بکەوێت. ئەم ئەزموونانە

ڕووەکە مەترسیدارەکانی دیاری کردووە و بۆ مرۆڤ جێی سەرسووڕمان و پرسیار بووە. ڕەنگە کەسێک تۆزێک گەڵای خەربەنگی خواردبێت و هەستی کەمکردنەوەی ئازارێک کردبێت. دوایی کە ئەم ئەزموونەی گێڕابێتەوە کەسانی شارەزا هەوڵیان دابێت کە ئەو ڕێژەیە کە کاریگەری ئازارشکێنی هەیە وەکوو دەرمانی و خۆراکی ناو ئەم ڕووەکە مەترسیدار و ژەهراویانە بە دەست بهێنن و جیای بکەنەوە.

بەپێی ڕیزبەندی سەرەوە هەموو ڕووەکەکان مادەی خۆراکیان تێدایە و مرۆڤ دەتوانێت بەکاریان بهێنێت، بەڵام لێرەدا پێویستە مەبەست و ئامانج لە خواردن بزانین. واتا دەتوانین ئامانجەکانی مرۆڤ لە خواردنی ڕووەکەکان بە شێوەی خوارەوە دیاری بکەین:

- وەرگرتنی وزەی ئاسایی ژیانی ڕۆژانە
- بەدەست هێنانی وزەی زۆرتر
- وەرگرتنی چێژ و ڕەنگ و تامی جیاوازتر
- قەرەبووکردنەوەی دابەزینی وزە و توانستی جەستەیی و ڕەوانی
- چارەسەر کردن و دەرمانی نەخۆشی و بارە ناتەندروستیەکانی

دەسپێکی دەستنیشانکردنی دەرمان و مادەی چارەسەریی لە ئەنجامی بیرۆکەی (هەموو ڕووەکەکان بۆ خۆراک دەبن) بووە. ئەورۆکە بابەتەکانی سەرەوە لای پزیشکان و دەرمانسازان و کیمیاویەکان زۆر بە گرینگیەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت و ڕۆژبەڕۆژ بەرهەمی خۆراکی و دەرمانی و تەنانەت ژەهراوی تازە ڕەوانەی بازاڕ دەکرێت.

## باسی سێهەم

### مێژووی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی[1]

ئەگەر بڕوانینە پوختەی ڕێبازی ئایینی زەردەشـــت، بۆمان دەرئەکەوێت کە زەردەشـــت یەکێ لە بنەماکانی ئایینەکەی لە ســـەر پاکی چوار توخمی ســـەرەکی ســروشــت واتا هەوا، ئاو، خاک و ئاور دامەزراندووە. هەر لە سـەر ئەم ڕوانگەیەوە وردە وردە بناغەی تێڕوانینی ژیانێ باشـــتر لە پێناو ئەم چوار توخمە ســـەرەکیە کەوتە ناو بەرنامەی هزر و هەســـت و هەناوی شـــوێنکەوتوانی. بە واتایەکی دیکە ڕێباز و شـــێوازێک بۆ ژیانی بەرەو تەندروســـتی و پاکژی بە ناوی ئایینی زەردەشـــتەوە واتا ڕێبازی مەزدیســـنایی ناســـێندرا. مێژوو نیشـــانی دەدات کە ســـەرهەڵدانی ڕێبازی مەزدیســـنایی دەکەوێتە پێش بەرنامە و ڕێنامەی ناو خوێندنگاکانی یۆنان و ڕۆمەوە. کەواتە بانگەواز و بەرنامەکانی مەزدیســـنایی تا ئەوپەڕی سنوورەکان گوازرایەوە و سوودبەخش بوو بۆ هەموو جیهان و سەرجەم گەلانی ئاریایی.

ســـەردەمی ژیانی حەکیم بوقرات لە یۆنان هاوکات بووە لەگەڵ ڕۆژگاری

---

١. پزیشکی مەزاجی، پزیشکی ئەخلات و مەزاجی، پزیشکی سینایی و پزیشکی مەزدیسنایی: طب سنتی ایرانی، طب مزاجی، طب سینایی

پاشـــایەتی ئەردەشــیری یەکەمی ســـاســـانی[1] لە ئێران، کە ئەو کاتە ئەســکەندەری مەقدوونی لەگەڵ حەکیمانی یۆنانی وەکوو حەکیمی گەورە ئەرەســتوو ڕاوێژ دەکات و ئینجا هێرش دەکاتە ســەر دەســەڵاتی ئێران و ئاشــوور. لە ئەنجامی ئەم هێرشــە یۆنانیەکان زۆربەی بەرهەمەکانی زانستی و نەتەوەیی ئاشووری و ساسانیەکانیان بە تالان برد. زۆر ئاســـاییە کە کاتێ دەســـتکەوتەکانی زانســـتی و نەتەوەیی شــارســتانیەتی ئێران و ئاشــوور چووە ناو دەســەڵاتی یۆنانیەکان، بوو بە هەلێکی ڕەخساو و شیاو بۆ بووژانەوە و گەشانەوەی ڕێبازی ئەزموون و زانستی مرۆڤ لە خوێندنگەکانی ئاتێن.

بوقرات لە ســەر ئەزموون و زانســتەکانی ناو دەقە پزیشــکی و ســروشــتیەکانی یۆنان، ئێران و ئاشــوور بنەمای پێڕەونامەی پزیشــکی بە ناوی خۆیەوە دامەزراند و هاوچەشنی بوارەکانی دیکە پزیشکیش بوو بە لقێکی زانستی سەربەخۆ. هەر چەند پێشتریش کەسانێک حەکیم و پزیشک کار و پسپۆڕی پزیشکیان دەکرد بەڵام بابەتی فریو و جادوو تێکەڵی بنەماکانی پزیشـــکی بوو تا وەکوو ئەوەی بوقراتی حەکیم ســەربەخۆیی زانســتی پزیشــکی ڕاگەیاند. بەم جۆرە حەکیم بوقرات بوو بە باوکی پزیشکی جیهان. هەر لەو ڕۆژەوە تا وەکوو ئێستەش پزیشکان پێش دەست پێکردنی ئیشــی پزیشــکی و دەرمانگەریان ســوێندی پزیشــکی بوقرات دووپات دەکەنەوە و خۆیان پابەند دەزانن بە ڕێباز و ڕەوشتە بەرزەکانی پزیشکی.

بوقرات یەکەم کەس بوو یاســا و ڕێســای پزیشــکی دامەزراند و پزیشــکی جیا کردەوە لە جادووگەری و فریوبازی. پاش بوقرات حەکیم جالینووس[2] خوێندگەی پزیشکی جالینووسی دامەزراند و تا وەکوو هەزار ساڵ خوێندنگەکەی جالینووس لە یۆنان فێرخواز و شاگردی پەروەردە دەکرد و زانستی پزیشکی فراوانتر دەکرد.

لە نێوان ساڵەکانی ١٤١ تا ١٧١ زایینی شاپووری یەکەم پادشای ساسانیەکان فەرمانی دەرکرد و زانکۆی گوندی شـــاپووری لە ناوچەی نێوان باشـــووری ڕۆژهەڵاتی دزفوول و باکووری ڕۆژاواری شـــووشـــتەر لە خووزســـتان دامەزرا. زۆرترین چالاکی و ناوداری ئەم خوێندنگەیە کە مێژوونووسان دەیگێڕنەوە لە نێوان

١. ساڵی ٤٦٠ پێش زایین

٢. ساڵی ١٢٩ تا ١٩٩ زایینی

ســـاڵەکانی ٣١٠ تا ٣٧٠ زایینی لە ســـەردەمی شـــاپووری دووهەم بووە. لەم خوێندنگەیەدا سەرەڕای زانستەکانی دیکە، چالاکی سەرەکی لە زانست و ئەزموونی پزیشـــکی یۆنانی و ئێرانی خۆی دەنواند. مێژوونووســـان باس لەوە دەکەن کە بە فەرمانی پاشاکانی ساسانی زۆربەی بەرهەمە نووسراوەکانی یۆنان وەرگێڕانە سەر زمانی پالەوی کە زمانی فەرمی دەفتەر و دیوانی ساسانیەکان بووە. ئەبووحەنیفەی دینەوەری لە کتێبی ئەخبارولتەوال[1] دەگێڕێتەوە کە سپای ساسانی پاش گەڕانەوە لە هێرش بۆ ســەر ڕۆمیەکان، لە ســەرزەمینی ئەهواز لەپاڵ ڕووباری کاروون شــاری گوندی شاپووریان دامەزراند و پاشان ئەم شارە بەهۆی پێشکەوتنەکانی خوێندنگەی گوندی شاپوور ناوبانگی لە هەموو جیهان بڵاو بووەوە.

ســـەردەمی دەســـەڵاتداری عەباســـیەکان و دامەزراندنی خوێندنگەی گەورەی نزامیەی بەغداد، ســـیاســـەتەکانی دەرباری عەباســـی کارێکی وای کرد کە هەموو پسپۆڕان و خوێندکارە باڵاکانی ئەو سەردەمەی جیهانیان بۆ بەغداد ڕابکێشێت و لە مەودای ســـاڵەکانی ٨٨٠ تا ٩٨٠ زایینی ناوبانگ و ناســـراوی خوێندنگەی گوندی شـــاپوور بگوازرێتەوە بۆ نزامیەی بەغدا و وردە وردە ئەم خوێندنگە ئێرانیە لە باو بکەوێت.

ئەگەر بە وردی بچینە ناو باســی مێژوو دەبینین دامەزراندنی بنکەی (بیت‌الحکمە) لە ســـەردەمی دەســـەڵاتداری عەباســـیەکان لە حەڕان[2] و بەغدا، وەرچەرخانێکی مێژوویی بوو بۆ پێشکەوتن و پەرەپێدانی زانسـت لە باوەشـی ئایینی ئیسـلامدا. ئەم بنکەیە سەرەتا ئەرکی تۆمارکردن و پاراستنی بەڵگەنامە و نووسراوە و فەرمانەکانی میرانی عەباســی لە ئەســـتۆ بوو، پاشـــان لە ســـەردەمی یەحیای کوڕی بەرمەکی وەزیری هاروون ڕەشـــید فەرمانێک دەرچوو کە بلیمەتان و پســـپۆڕانی بوارە جیاجیاکانی ناو دەسەڵاتی عەباسیەکان سەردانی کتێبخانەکانی یۆنان و ڕۆم و هێند و سوریان و ئێران بکەن و بە هەر نرخێک بێت کتێب و دەستنووسی زانایان بکڕن و ژمـارە و ڕێژەی بەڵگەنـامە و پەرتووکەکـانی کتێبخـانەی بەیتولحیکمەی پێ

---

١. اخبارالطوال: سەرچاوەیەکی سەرەکییە بۆ مێژووی دەسەڵاتداری ساسانیەکانی ئێران لە پێش ئیسلام و دەسەڵاتەکانی عەرەبی ئیسلامی تا ڕۆژگاری موعتەسەمی عەباسی (٨٤٢ زایینی)

٢. ساڵی ٧٥٠ زایینی

دەوڵەمەند بکەنەوە. پاش ئەم قۆناغە هەمدیسان فەرمانێک دەرچوو کە دەسەڵات بۆی هەیە وەرگێڕانی بیانی و تەنانەت ناموسڵمان دابمەزرێنێت تا وەکوو کتێبەکانی پالەوی، یۆنانی، سوریانی، ڕۆمی و هێندی بکەن بە عەرەبی.

پەرتووکە پزیشیکەکانی یۆنانی لای پزیشکی سوریانی یوحەنا کوڕی ماسوویە دانرا و وەری گێڕایەوە سەر عەرەبی یان فەزل کوڕی نەوبەخت پەرتووکەکانی ئەستێرەناسی زمانی پالەوی کرد بە عەرەبی. لە سەردەمی مەنسوور و مەئموونی عەباسی دەسەڵات گرینگی زۆرتری دا بە بەیتولحیکمە. کەسانێکی تایبەت بۆ وەرگێڕانی هەموو بوار و زمانەکان دامەزران. ابن‌ندیم لە کتێبی (الفهرست) نووسیویەتی: مەئموون شەوێک لە خەونیدا ئەرەستووی حەکیم دەبینێت و پرسیارێکی زۆری لێ دەپرسێ و ئەویش وڵامی هەموو پرسیارەکانی ئەداتەوە. مەئموون بەیانی فەرمان دەر ئەکات کە پێویستە کتێبەکانی ئەرەستوو دەبێ بکرێنە عەرەبی.

دەوڵەمەند بوونی کتێبخانەی عەباسیەکان و دانان و نووسینی کتێبی تازەی زانایان بە زمانی عەرەبی توانی ڕۆژبەڕۆژ ناو و ناوبانگی بەغدا بەتایبەت خوێندنگەی نزامیە بەرزتر بکاتەوە و هەموو جەماوەری ژێر دەسەڵاتی ئیسلام و دەرەوەی وڵاتی موسڵمانان ئارەزوومەند بوون لەم خوێندنگەیەدا بخوێنن و خزمەتی خۆیان بنوێنن. ئەگەر سەیری گەشتی ئەبووعەلی سینا لە بوخارا بۆ هەمەدان و ئەسفەهان بکەین، ئامانجی سەرەکی ئەم حەکیمە گەیشتن بە خزمەت مامۆستایان و کتێبخانەی نزامیەی بەغداد بووە، بەڵام ئاخری بەم ئارەزووەی ناگات.

سەردەمی ژیانی ئەبووعەلی سینا[1] هاوکات بووە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی سەرچاوەی خوێندنێک کە گوشراوە و پوختەی بەرهەمی وڵاتانی کۆنی یۆنان، هێند، سوریان، ڕۆم و ئێران، هەروەها زیادکراوەکانی ڕێبازی ئایینی ئیسلام بە ناوی (طب نبوی) بووە. لە لایەکی ترەوە کۆمەڵە ئەزموون و ڕێچکەی خۆماڵی و باوی خەڵک کە سەرزارەکی بوون و بە شێوەی سینە بە سینە دەپارێزران و حەکیمانی بێ ناو و نیشان لە نۆرینگە و دەرمانگە ساکارەکەی خۆیان لە دەڤەرەکانی لوڕستان، خۆراسان، مازندەران و کوردستان کاریان پێ دەکرد. کەواتە پەرتووکی (قانون فی

---

١. ساڵەکانی ٩٨٠ تا ١٠٣٧ زایینی

الطب) گوشراوەیەکە لە سەرچاوە نووسراوەکانی سەرەوە و نووسینی ئەزموون و دەرەنجامەکانی پوورسـینا لەگەڵ تۆمارکردنی گەلێک ئەزموون و دەرەنجامی نەنووسرای حەکیمانی لوڕ و فارس و لەک کە نزیک بە دەڤەری هەمەدان بوون.

نووسـین و دەرکەوتنی کتێبی (قانون فی الطب) بوو بە بناغەی پێشـکەوتن و سـەرهەڵدانی شـێوازە پزیشـکیەکانی دیکە بەتایبەت لە دەسـپێکردنی دەسـەڵات لە ئەندەلۆسـیا و دواتر بۆ ناو هەموو ئەورووپا. سـیریل ئەلگود پزیشـکی باڵوێزخانەی بریتانیا سـاڵی ١٧٨٥ زایینی لە کتێبی مێژووی پزیشـکی لە وڵاتی ئێران، دەنووسـێت: بنەمای سـروشـتە چوارینەکان (خوێنی، زەرداوی، سـەوداوی و بەڵغەمی) بیرۆکەی نەریتی پزیشـکیی ئێرانیەکان بووە کە چووەتە ناو پزیشـکی یۆنان. ئەم پزیشـکە هەروەها دەنووسـێت کە پاشـاکانی قاجار لە ئێران توانیان شـێوازی پزیشـکی سـینا بگۆڕن بە پزیشکی هاروی و پاستور. واتا ئەزموون و دەرەنجامە تازەکانی ئەورووپا بە ناوی پزیشکی سـەردەم ئەخەنە جێی شێوازی پزیشکی خۆماڵی و باوی ئێرانی و ئیسـلامی پێشـینیان. ئەم پزیشـکە بریتانیە لە کتێبەکەیدا هەروەها دەنووسـێت نازانم خەڵکی ئێران بۆچی نایانەوێت دەست هەڵگرن لە بیر و باوڕی دینی و نەتەوەییان. لە سەردەمی شا عەباسی سەفەویشدا بەم شێوەیە پێداگریان کرد و خەڵک کارێکی کرد کە سیاسەتی سەفەویەکان بۆ گۆڕانی پزیشکی لە سینابیەوە بۆ ئەورووپی شکستی هێنا بەڵام لە سەردەمی قاجارەکان ئەم سیاسەتە سەرکەوتووانە جبەجێ بوو.

ساڵی ١٩١١ وزارەتی مەعارفی ئێران فەرمانێکی دەرکرد کە پێویستە کەسانێ کە نیازی درێژەدان و یا وەرگرتنی پیشـەی پزیشـکیان هەیە پێویسـتە لە وزارەتی مەعارف مۆڵەت وەربگرن یان دەبێ بڕوانامەی پزیشکی یەکێ لە وڵاتانی دەرەوەیان پێ بێت. بەم شـێوەیە تا سـاڵی ١٩٨٦ بە شـێوەی نافەرمی[١] و سـەرەتای سـاڵەکانی ٢٠٠٠ بە شێوەی فەرمی[٢] خوێندن و چالاکی لە بواری پزیشکی خۆماڵی و سروشتی ئێران ڕێگەپێدراو نەبوو.

کورتە باسی سەرەوە لە سەر مێژووی ناوچەکە بەتایبەت ئێران و یۆنان نیشانی

---

١. دامەزراندنی یەکەم کۆمەڵەی گیادەرمانان و پزیشکی سروشتی لە ئێران

٢. پەسەند کردنی یاسای گیادەرمانی و پزیشکی سروشتی لە پارلەمان و دواتر دامەزراندنی یەکەم زانکۆی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی لە تاران

دەدات کە ئەزموون و دەرەنجامی سەرکەوتووانەی پێشینیانی لە هەموو بوارەکاندا بەتایبەت پزیشکی هەمیشە جووڵەی گەشە و پێشکەوتنی تێدا بووە. بۆ نموونە نەتەوەی کورد خاوەنی دەیان و سەدان چلی دەرمانگەری و چارەسەرە کە دەتوانین بڵێین لە ناو نەتەوە و ئەزموونی وڵاتانی دیکەدا بەرچاو ناکەوێت، وەکوو: ناوکگرتنەوە، بەز و بنێشت، هەنوون، سەرگرتنەوە، دڵگرتنەوە، کەهەنگ، خورما و دوو، فریشک گرتنەوە، بینبەردان، مڵاشوو گرتنەوە و هتد.

خاڵێکی تر کە شیاوی ئاماژە پێدانە باسی ساردی و گەرمی خۆراکەکانە لە پزیشکی خۆماڵی کوردەوای. ئەم باسە یەکێ لە بنەماکانی پێکهاتەی پزیشکی مەزاج و ئەخلاتە کە لە لقی پزیشکی سینایی و ئێرانیدا بەرچاو دەکەوێت. پێویستە شوێنەکەوتوان و شارەزایانی بواری پزیشکی کوردەواری زۆرتر هەوڵی خۆیان بخەنە گەڕ و بنەماکانی ئەم سامانە نیشتمانیە تۆکمەتر و تەواوتر ڕاست بکەنەوە و یاسا و بەرنامەکانی بنووسنەوە.

## بنەماکانی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی

ئەگەر لێرە بە شێوەیەکی تایبەت باسی پزیشکی خۆماڵی و سوننەتی ئێرانی دەکرێت بۆ ئەوەیە هەمیشە بەهۆی دەسەڵات و خوێندنگە و بەرهەمی حەکیمان، ئەم شێوازە پزیشکیە کاریگەری لە سەر شێوازی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری داناوە. هەروەها وەک چۆن بۆمان دەرکەوتووە کە شێوازی پزیشکی خۆماڵی کوردستان کۆکراوەی یەک یا هەموو بابەتەکانی لقەکانی پزیشکی دیکەیە (وەکوو سروشت و خەڵتەکان، شێلان، کەڵەشاخ، گیادەرمانی و هتد) لەگەڵ بابەت و ئەزموونەکانی تایبەت بە خۆی. کەواتە پێناسە و ڕوونکردنەوەی یەکێ لە نزیکترین شێوازەکانی پزیشکی وەکوو پزیشکی خۆماڵی ئێرانی بە لقی پزیشکی خۆماڵی و مللی کوردەوارییەوە دەتوانێت یارمەتی پسپۆڕان و مامۆستایان و هەموو شوێنکەوتوانی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری بدات توێژینەوەکانیان زیاتر بکەن و بەرەو داڕشتنی بنەما و تایبەتمەندیەکانی ئەم شێوازە پزیشکیە هەنگاو بنێن.

ساڵی ٢٠٠٢ ڕێکخراوی (WHO) پێناسەی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی وڵاتان

و نەتەوەکانی جیهانی تۆکمەتر کرد و دیسانەوە سەرەڕای ئاماژە بە گشتگیری پزیشکی خۆماڵی و میللی پێشنیاری ڕێبازی پزیشکی تەواوکار یا جێگرەوەی خستە بواری تەندروستیەوە.

لە زانستی پزیشکی خۆماڵی و سروشتیدا کەسێ کە مامۆستا و ئەزموونداری ئەم بوارەیە، پێی دەڵێن: حەکیم. وشەی حەکیم زۆر پڕ ماناترە لە پزیشک و دەرمانگەر. ڕەنگە نزیکترین وشەی کوردی بە ناوی حەکیم چارەزان، چارەگەر، یان چارەدۆز بێت.

بنەمای وشەی حەکیم زۆر لەوە قووڵترە کە تەنیا کورتی بکەینەوە سەر بواری دەرمانگەری و چارەسەری نەخۆشیەکانی جەستەی مرۆڤ. ئەوساکە جیاوازی بووە لە نێوان دوو وشەی حەکیم و پزیشک[1] کە وەکوو دوو پیشەی جیاگانە سەیر دەکرا. حەکیم پیشە و پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بوو کە ئەو کەسە خاوەنی سەرجەم یا زۆربەی زانستەکانی سەردەمی خۆی بوو وەکوو ئەستێرەناسی، ژمێریاری و بیرکاری، لۆژیک، فەلسەفە، شەرعیات، پزیشکی، دەروونناسی و هتد، بەڵام پزیشک پیشەی تەنیا دەرمانگەری و تیمار کردن و ڕەچەنووسینی بووە بۆ برین و تا و نەخۆشیەکانی مرۆڤ و ئاژەڵە ماڵیەکان.

کەواتە پێویستە هەندێ زیاتر بکۆڵینەوە و تیشک بخەینە سەر بابەتی حێکمەت کە وشەی حەکیمی لێ وەرگیراوە. حێکمەت واتە بە یارمەتی کەرەستەی زانست پێناسە کردنی هەموو بوونەوەرانی ئەم جیهانە. حێکمەت خۆی دەبێ بە دوو بەشی بیرۆکەیی و کرداری.

- حێکمەتی بیرۆکەیی[2]

زانین و ناسینی زانستی ئەو بوونەوەرانە کە بە ویستی مرۆڤ بوونیان پەیدا نەکردووە. ئەم حێکمەتە بریتیە لە:

١) زانستی سەرووی دنیای سروشت و مادە[3]

---

١. طبيب

٢. حكمت نظرى

٣. علم مابعدالطبيعه: ئەو بوونەوەرانە کە بۆ بوونیان مادە مەرج نییە، وەکوو: ڕۆح و خوا

٢) زانین و ناســـینی ئەو بوونەوەرانە کە وەبێ مادە بوونیان نییە: زانســـتی بیرکاری[١] و زانستی سروشتی[٢]

زانستی سروشتی لە سەر هەشت بنەما پێک هاتووە:

١) ســـەماعی ســـروشـــتی[٣]: مەبەســـت لە بنچینەی گۆڕانکاریەکانە، وەکوو: کات، شوێن، جووڵە، وەستان، کۆتایی و هەتا هەتایی

٢) جیهان و ئاسمان: پێناسەی تەنە تاک و تێکەڵەکان، هەم لە ئاسمانی سەروو[٤] و هەم لە ئاسمانی خواروو[٥]

٣) دنیای بەدیهاتن و لەناوچوون[٦]: پێناســـەی بنەما چوارینەکان (ئاو، هەوا، ئاور و خاک) و گۆڕانکاری شێوازەکانی مادە

٤) زانستی شوێنەوارەکانی جیهانی سەروو[٧]: ناسینی ڕووداوە سروشتیەکانە وەکوو هەورە برووسکە، بەفر، بوومەلەرزە و هتد

٥) زانســـتی کان و کانزاکان: پێناســـەی چۆنیەتی و چەندیەتی مەوادی بێ گیانی سروشت

٦) زانستی ڕووەک[٨]

٧) زانستی ئاژەڵ[٩]

٨) دەروونناسی[١٠]: زانستی پێوەندیدار بە هزر و هەناوی مرۆڤ

- حێکمەتی کرداری[١١]

---

١. علم ریاضیات: ئاوێتەبوونی مادە مەرج نییە لە تێفکرین و تێبینیدا

٢. علم طبیعیات: تا وەکوو مادە ئاوێتە نەبێت بوونی نییە

٣. سماع طبیعی

٤. سماء علوی

٥. سماء سفلی

٦. کون و فساد

٧. علم آثار علوی

٨. علم نبات

٩. علم حیوان

١٠. علم نفس

١١. حکمت عملی

پێناسەی کاروباری پێوەندیدار بە ویست و کرداری مرۆڤ، وەکوو: پاڵاوتنی ڕەوشتی تاک[1] و ڕەوشتی کۆمەڵ[2]

ئەگەر بە وردی بڕوانینە بڕگە و بابەتەکانی سەرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە حیکمەتی ژیانی ئەم دنیایە گەلێک بەربڵاو و پڕ واتایە. مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی خاوەن هزر و هەست و هەناو کە دەچێتە ناو بەستێنی ئاسمانی و زەمینی زانستەکان و پێویستە بۆ پێناسە و تێگەیشتنی ئەم زانستانە، ئاگەداری و پارێزگاری گەورەترین هۆکاری مانەوەی بێت لەم دنیایە واتا تەندروستی جەستە و هەناوی و بە دەستهێنانی بوارێکی تەندروستتر و ئاسوودەتر بۆ ئەم لفەدوانە (جەستە و هەناو).

پێشینیان زۆر بە ژیرانە و وردبینانە مامۆستا و پسپۆڕی بواری پێناسە و تێگەیشتنی زانستەکانی سەرەوەیان بە حەکیم داناوە. حەکیم واتا خاوەن زانیاری یەکێ لە زانستەکانی سەرەوە، وەکوو حەکیمی پزیشک[3] و حەکیمی دەروونناس[4].

## پێناسەی پزیشکی لە ڕوانگەی ئەبووعەلی سینا

لە ڕوانگە و دیدی ئەبووعەلی سینا بە یارمەتی زانستی پزیشکی بارودۆخی جەستەی مرۆڤ لێک دەدرێتەوە کە هۆکاری تەندروستی و نەخۆشی بدۆزرێتەوە تا وەکوو باری تەندروستی مرۆڤ بپارێزرێت و ئەگەر هاتوو ئەم تەندروستیە بەرەو تێکچوون ترازا، چۆناهی و بە چ شێوەیەک بگەڕێتەوە.

(ابوبکر ربیع ابن احمد اخوینی) حەکیمی سەدەی چوارەمی کۆچی لە پەرتووکی (هدایە المتعلمین) دەڵێت: پزیشکی[5] پیشەیکە باری تەندروستی مرۆڤەکان دەپارێزێت و ئەگەر ئەم تەندروستیە تێکچوو، حەکیم بە یارمەتی زانست و کرداری پزیشکیەوە

---

١. ڕاوێژ و هاوبیری بۆ کاروباری کۆمەڵگەی ناوماڵ

٢. ڕاوێژ و بەشداری لە بەرنامە و ڕێنامەکانی ناو کۆمەڵگەی دەرەوە

٣. حکیم طبیب

٤. حکیم نفس

٥. ئەم پەرتووکە بۆ هەمبەری پزیشکی لە زمانی فارسی کۆندا وشەی "بجشکی" بەکار هێناوە.

دیسان ئەم تەندروستیە دەگەڕێنێتەوە سەر جێ خۆی.

خاڵی گرینگ لە پێناسەی سەرەوە و هەموو پێناسەکانی حەکیمان و پزیشکانی کۆن و ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی سەبارەت بە پزیشکی ئەوەیە کە ئامانجی پزیشکی و ئەرکی پزیشک ئەوەیە تەندروستی مرۆڤ بپارێزێت و بابەتی دەرمان ئەولەویەتی دوایی پزیشکە. جا ئەم ڕوانگەیە زۆر بالاتر و سەرووترە لەوەی کە ڕێبازی پزیشکی سەردەم بەرامبەر بە پزیشکی دەیناسێت. ئامانجی زانستی پزیشکی لە ڕێبازی پزیشکی تازە و سەردەم ئەوەیە کە زانست و کرداری پزیشکی کار بۆ ئەوە دەکات کە پێشگری بکرێت لە نەخۆشی مرۆڤەکان، واتا پزیشکی پێشگیری.

لە ڕوانگە و ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی، پزیشکی خاوەنی زانستی بیرۆکە و کردارە.

## زانستی پزیشکی کرداری[1]

بە گوێرەی ئەم زانستە پزیشک پێویستە زانست و کرداری یەک بخاتەوە و بە یارمەتی شێوازەکانی خوارەوە باری تەندروستی و چاکبوونەوە بگەڕێنێتەوە بۆ تاکی نەخۆش:

- ڕێنمایی و ڕێکارەکان: ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی بەرنامە و ڕێنامەی خۆراکی و هەموو ئەو هۆکارانە لە سەر تەندروستی کاریگەرن
- دەرمان: بەکارهێنانی دەرمانی ڕوەکی، حەیوانی و کانزایی
- کاری دەستی[2]: وەکوو شێلان، کەڵەشاخ، نەشتەردان و هتد

## زانستی پزیشکی بیرۆکەیی[3]

---

١. طب عملی
٢. اعمال یدوی
٣. طب نظری

زانستێکە کە پزیشک چۆنیەتی کرداری سروشتی و گۆڕانکاریەکانی جەستەی مرۆڤ و هەروەها ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی تەندروستی یا نەخۆشی لێک دەداتەوە تا وەکوو بتوانێت بە پێناسە و بڕیارێکی دروست بگات.

## پزیشکی بیرۆکەیی دەبێت بە سێ بەشەوە:

۱) هۆکار و کەرەستەکان: هۆکاری دروستبوونی گۆڕانکاری لە جەستەی مرۆڤ و هۆکارەکانی کاریگەر لە سەر ئەم گۆڕانکاریە و هەروەها چۆنیەتی سەرهەڵدانی نەخۆشی پێناسە دەکات.

۲) نیشانەکان: هۆکار و نیشانەکانی نەخۆشی پێناسە دەکات و لێکیان دەداتەوە و پزیشک یارمەتی دەدات بۆ بەدەست هێنانی تەندروستی یا باری نەخۆشی نەخۆشەکە. وەکوو نیشانەکانی مەزاجی و خەڵتەکان، ترپەی دڵ[۱] و میزناسی

۳) کردارە سروشتیەکان[۲]: ئەو کردارانەی کە مانەوە، ڕاگرتن و پاراستنی تەندروستی جەستەی مرۆڤ لە سەر ئەوانە دامەزراوە. پاراستن و جێگیربوونی باری هاوسانی و مامناوەندی سروشتی مرۆڤ لە سەر حەوت بەشی کردارە سروشتیەکان بنیات نراوە: بنەماکان[۳]، خەڵتەکان[٤]، مەزاجەکان[٥]، ئەندامەکان[٦]، ڕەوانەکان[٧]، هێزەکان[٨] و کردارەکان[٩]

لە خوارەوە بە کورتی کردارە سروشتیەکان ڕوون دەکەینەوە:

---

۱. نبض

۲. امور طبیعیه

۳. ارکان

٤. اخلاط

٥. امزجه

٦. اعضا

۷. ارواح

۸. قوا

۹. افعال

## بنەماکان

حەکیمان باوڕیان وایە کە هەموو شتێکی ئەم جیهان پێکهاتووە لە چوار توخمی: ئاو، ئاور، با (هەوا) و خاک. ئەڵبەتە مەبەست لەمانە ئەو ماکە ڕواڵەتیەی ئاو، ئاور یا هەوا و خاکی ناو ژینگە نییە بەڵکوو تەمسیل و وێنایەکە لەم چوار توخمەی سروشت.

حەکیمان چوار توخمی[1] ئاو، ئاور، با و خاک بە تەنەکان[2]، بنەماکان[3] یا بنەما چوارینەکان[4] ناودێر دەکەن.

سووکی و قورسی توخمەکانی سروشت لە دیدی حەکیمانی کۆن:

- سووکی پەتی (ئەوپەڕی سووکی):

ئاور نیشانەی سووکی پەتیە و خاوەنی کواڵێتی گەرم و وشکە

- سووکی ڕێژەیی:

با[5] نیشانەی سووکی ڕێژەییە و خاوەنی کواڵێتی گەرم و تەڕە

- قورسی ڕێژەیی:

ئاو نیشانەی قورسی ڕێژەییە و خاوەنی کواڵێتی سارد و تەڕە

- قورسی پەتی (ئەوپەڕی قورسی):

خاک نیشانەی قورسی پەتیە و خاوەنی کواڵێتی سارد و وشکە.

کواڵێتی بنەماکانی سروشت لە ڕوانگەی حەکیمانی کۆن:

- ساردی: توخمەکانی ئاو و خاک نیشانەی ساردین
- گەرمی: توخمەکانی ئاور و با نیشانەی گەرمین

---

١. عنصر
٢. اجرام
٣. ارکان
٤. عناصر اربعه
٥. بە واتایەکی تر "هەوا"

- تەڕی: توخمەکانی با و ئاو نیشانەی تەڕین
- وشکی: توخمەکانی ئاور و خاک نیشانەی وشکین

## سروشت (مەزاج)

مەزاج وشـــەیەکی عەرەبیە بە واتای تێکەڵبوون. لە زانســـتی پزیشـــکی کۆندا سروشت یانێ دەرەنجامی تێکەڵبوونی بنەما چوارینەکان. لە بارودۆخی سروشتی و ئاســـایی توخمەکان دەتوانن بە ٩ دۆخی جیاواز تێکەڵ ببن و ٩ مەزاجی تایبەتی دروست بکەن:

## مەزاجی گشتی

١) سروشتی مامناوەند[1]:
مەزاجێکە هەر چوار توخمی ئاو، ئاور، با و خاک بە ڕێژەیەکی یەکســـان پێکەوە تێکەڵ بوونە و هاوسانی لە نێوانیاندا هەیە و کواڵیتی هەر چوار توخمەکەی تێدایە.
٢) سروشتی سارد:
مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی دوو توخمی ئاو و خاک
٣) سروشتی گەرم:
مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی دوو توخمی با و ئاور
٤) سروشتی تەڕ:
مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی دوو توخمی با و ئاو
٥) سروشتی وشک:
مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی دوو توخمی ئاور و خاک
٦) سروشتی گەرم و تەڕ:
مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی ســـێ توخمی ئاور، با و ئاو پێک دێت و توخمی خاکی

---

١. مەزاجی هاوسان یا ئاسایی: مزاج معتدل

تێدا نییە. چونکە خاک وشک و ساردە

٧) سروشتی گەرم و وشک:

مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی ســـێ توخمی ئاور، با و خاک پێک دێ و توخمی ئاوی تێدا نییە. چوونکە ئاو سارد و تەڕە

٨) سروشتی سارد و تەڕ:

مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی ســـێ توخمی ئاو، با و خاک پێک دێ و توخمی ئاوری تێدا نییە. چوونکە ئاور گەرم و وشکە

٩) سروشتی سارد و وشک:

مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی ســـێ توخمی ئاور، ئاو و خاک پێک دێ و توخمی بای تێدا نییە. چوونکە با گەرم و تەڕە

بەڵام لە باردۆخی ناو جەســـتەی مرۆڤ مەزاجەکان دەتوانن بە ٩ شـــێوازی خوارەوە شیکاری و ڕوون بکرێنەوە:

## مەزاجی مرۆڤ

١) سروشتی مامناوەند:

باری تەڕی، وشـکی، سـاردی و گەرمەیەکەی مامناوەندە و حاڵەتی سـروشـتی خۆی هەیە.

٢) سروشتی گەرم:

تەڕی و وشکیەکەی مامناوەندە و گەرمی بە سەر ساردیدا زاڵە.

٣) سروشتی سارد:

تەڕی و وشکیەکەی مامناوەندە و ساردی بە سەر گەرمیدا زاڵە.

٤) سروشتی وشک:

گەرمی و ساردیەکەی مامناوەندە و وشکی بە سەر تەڕیدا زاڵە.

٥) سروشتی تەڕ:

گەرمی و ساردیەکەی مامناوەندە و تەڕی بە سەر وشکیدا زاڵە.

٦) مەزاجی گەرم و وشک[١]:

گەرمی بە سەر ساردی و وشکی بە سەر تەڕیدا زاڵ بووە، واتا مەزاج سەفراوی یا زەرداویە

٧) سروشتی گەرم و تەڕ[٢]:

گەرمی بە سەر ساردی و تەڕی بە سەر وشکیدا زاڵ بووە، واتا مەزاج خوێنیە

٨) سروشتی سارد و تەڕ[٣]:

ساردی بە سەر گەرمی و تەڕی بە سەر وشکیدا زاڵ بووە، واتا مەزاج بەڵغەمیە

٩) سروشتی سارد و وشک[٤]:

ساردی بە سەر گەرمی و وشکی بە سەر تەڕیدا زاڵ بووە، واتا مەزاج سەوداویە

مرۆڤ هەمیشـــە بەهۆی کاریگەریەکانی مەزاجی دایک و باوکی، و هەروەها کاردانەوەکانی قۆناغەکانی ناوسـکی دایکی بە مەزاجێکی خۆماک[٥] یا سـروشـتی یا ژێنێتیک[٦] یا کێوی[٧] لەدایک دەبێت، بەڵام ئەم مەزاجە خۆماکی و سروشتیە لە ماوەی تەمەنیـدا بەردەوام دەکەوێتە بەر کـاریگەریەکـانی ژینگەیی، خۆراک و پلەکـانی تەمەنیەوە. کەواتە هەر جۆرە هەوڵێک بۆ گۆڕانکـاری و ترازانی ئەم مەزاجە تـاک بەرەو نەخۆشـــی دەبات. حەکیمی دڵســـۆز هەوڵی ئەوەیە مەزاجی ئەو نەخۆشـــە بگەڕێنێتەوە سەر باری سروشتی و خۆماکیەکەی خۆی.

ئەم مەزاجە خۆماکیە نەگۆڕە و لە ئەنجامی ڕێژەی خەڵتە چوارینەکانی (زەرداو، خوێن، بەڵغەم و ســەودا) لە جەســتەدا دروســت دەبێت. واتا ئەگەر مرۆڤ بەهۆی شـــتێکەوە مەزاجی خۆماکیەکەی لە باری هاوســـانی خۆی تراز و چووە ســـەر

---

١. مەزاجی زەرداوی: مزاج صفراوی

٢. مەزاجی خوێنی: مزاج دموی

٣. سروشتی بەڵغەمی: مزاج بلغمی

٤. سروشتی سەوداوی: مزاج سوداوی

٥. ذاتی

٦. وراثی

٧. جبلی

مەزاجێکی دیکە، ئەو مەزاجە ناتوانێ جێگیر بێت چونکە جێگیر بوونی مەزاجی تازە واتا سەرهەڵدانی نەخۆشی. هونەری حەکیم ئەوەیە بە ئاسانترین و ساکارترین شێوە مەزاجی نەخۆش ڕێک بکاتەوە و بیخاتەوە سەر مەزاجی خۆماک و سروشتی خۆی.

مرۆڤ لە سەرەتای لەدایکبوونیەوە بەردەوام دەکەوێتە ژێر کاریگەری و کاردانەوەی بارودۆخی ژینگەیی جیاواز وەکوو قۆناغەکانی ژیان (منداڵی، مێرمنداڵی، جوانی، پێش پیری و پیری)، خواردن، کەش و هەوای ژینگە، پیشە، نەخۆشی و هتد. کەواتە مرۆڤ بەهۆی ئەم هۆکارانە بەردەوام سروشتی خۆماکی لە هەڵکشان و داکشانە و لە دەوروبەری مەزاجی خۆماکی گۆڕانکاری بە سەریدا دێت. هەمیشە حەکیمان تێبینی سەرەکیان ئەوەیە کە ڕێژەی دوورکەوتنەوە لە خاڵی سروشتی خۆماکی زۆرتر نەبێت تا وەکوو نەخۆشی نەیتە گۆڕێ. مرۆڤ هەرچی لە خاڵی مەزاجی خۆماکی زیاتر دوور بکەوێتەوە تەشەنە کردن و گرانبوونی نەخۆشیەکە زۆرترە.

بەپێی ڕوانگە و بۆچوونی حەکیمانی کۆن هەموو بوونەوەرانی مادی و مەعنەوی ئەم دنیایە مەزاج و سروشتی تایبەت بە خۆیان هەیە.

## سروشت و مەزاجی بوونەوەرانی مادی و مەعنەوی

- مەزاجی کات:

شەو لەچاو ڕۆژ ساردتر و تەڕترە، بەهار گەرم و تەڕە، هاوین گەرم و وشکە، پاییز سارد و وشکە، زستان سارد و تەڕە.

- مەزاجی شوێن:

خەڵکی ئەورووپا چونکە زۆرتر سەر بە یاسا و سیاسەت و ئابوورین مەزاجی ساردیان هەیە، بەڵام خەڵکی ئاسیا بەتایبەت ڕۆژهەڵاتی ناوین چونکە تا ئەندازەیەک یاسابەزێن و هەستی شیعر و ئەوین و عیرفانیان هەیە خاوەنی مەزاجی گەرمن.

- مەزاجی ڕووەک:

گەرم و وشک (خورما و گوێز)، گەرم و تەڕ (هەرمێ و کاڵەک)، سارد و وشک (هەڵووژەی سەوز و هەناری ترش)، سارد و تەڕ (شووتی و خەیار).

- مەزاجی ئاژەڵ:

گەرم و وشک (گۆشتی وشتر)، سارد و وشک (گۆشتی مانگا و گا)، گەرم و تەڕ (گۆشتی مەڕ)، سارد و تەڕ (گۆشتی ماسی)

- مەزاجی ژن و پیاو:

ژنان لەچاو پیاوان مەزاجیان سارد و تەڕترە.

- مەزاجی تەمەن:

مندال (گەرم و تەڕ)، بەڵام مێرمنداڵ و گەنجان هەر بە هەمان ڕێژە کە گەرمە، ڕێژەی تەڕیەکەی کەمترە. لە تەمەنی پیران و بەساڵاچوان مەزاجی سارد و وشک بەڵام لەگەڵ زۆربوونی تەمەن گەرما و تەڕی جەستەی پیران کەم دەبێتەوە.

- مەزاجی بوونەوەرانی بێ گیان:

مەزاجی کاوڵ (قوڕی کا و گڵ) گەرمە و مەزاجی گەچ ساردە.

- مەزاجی خۆراکە مادی و مەعنەویەکان:

✓ بینین و چاولێکردن:

مەزاجی ڕەنگی شین و سەوز مامناوەندییە (مەزاجی زۆرتر مەیلەو گەرم)، ڕەنگی زەرد و سوور مەزاجی گەرم، و ڕەنگی سپی و ڕەش مەزاجی ساردن. لە زانستی تازەدا بۆ ڕەنگەکان باس لە ڕنگی سارد و گەرم دەکەن.

✓ بیستن و گوێگرتن:

وشە و قسەی خۆشەویستی و هیوابەخش گەرمی دەبەخشن، و جنێو و وشەی ناخۆش مرۆڤ دڵسارد دەکەنەوە، واتا مەزاجی سارد و گەرمیان هەیە.

✓ بۆن و بەرامە:

بۆن و بەرامەی شتی نەرم و سووتێنەر و شیرین و بۆنخۆش مەزاجی گەمیان هەیە، بەڵام بۆنی چڵک و کەڕوو، ترشاو و هەندێ ماکی بۆنخۆش وەک کافوور مەزاجی ساردیان هەیە.

✓ ڕەوشت و هەڵسوکەوت:

ڕق و ترس کە ڕەوشـــتی ســـاردن و زۆرتر پێکەوە دەبینرێن و ئازایەتی و دڵفراوانی پێکەوەن و مەزاجی گەرمیان هەیە.

✓ دەست پێوەدان:

جلی خوری کە پێســتی جەســتەی وێ ئەکەوێت مەزاجی مرۆڤ گەرم دەکات و پەموو فێنک.

✓ خواردن و خواردنەوە:

تام و چێژە گەرمەکان بە ڕیزەوە تیژی، تاڵی، سوێری و شیرینی (تامی شیرینی زۆر بە مەزاجی مامناوەندەوە نزیکە) و چێژە ساردەکان بە ڕیزەوە مێخۆش، تفت و گرس (تامی قابض)[1]، ترش و بێتام. چەوری تامێکی مامناوەندی هەیە.

■ مەزاجی مرۆڤەکان:

### کەسانی خوێنی مەزاج[2]:

مەزاجی گەرم و تەڕ، دەموچاوی ســـوور و پڕ خوێن، ئەندامی قورس بەتایبەت ئەندامی ســـەر و مێشــک، زۆرتر تەپەڵۆس و تەمبەڵ، خەوی قورس و بە ئەندازەی زۆر، زۆربڵێ (فرەوێژ)، بالآیان بەرەو کووڕییە، دەســـت و پەلیان کراوە و فشـــۆڵ، زۆرتر خۆش ڕەوشت، بەزم خۆش و دەم بە پێکەنین، خەڵکی شاد دەکەنەوە، ئازا و بەجەرگ، تامی زاریان شیرینە، پێست و زمان و چاویان سوورە، خوێنبەربوون لە پووک و لووتیان باوە، شوێنی کەڵەشاخ و خوێنگرتنیان دەبێتە برین. ئەم نیشانانە لە وەرزی بەهاردا زۆرتر خۆیان نیشان ئەدەن.

### کەسانی بەڵغەمی مەزاج[3]:

مەزاجی سارد و تەڕ، سیمای و ڕەنگی دەموچاویان سپییە، پێست سارد و نەرم

---

١. وەک تامی توێکڵی هەنار و بەهێ کاڵ یا هەرمێ نەگەیشتوو. ئەم چێژە لە فارسیدا پێی دەڵێن (گس) و بە کوردی تفت، گرس، کرچ و کاڵکرچ

٢. دموی مزاج: خوێن لەم کەسانەدا زاڵتر و دیارترە

٣. بلغم مزاج

و ڕوون، زۆر جار بەهۆی تەڕی زۆرەوە پێستی ژێرچاو و بن هەنگڵیان چرچ و لۆچ دەبێ، تف و گلێزی ناودەمیان زۆر، کەمتر تینوویان دەبێ، جنسی گۆشتیان نەرمە، تەمبەڵ و تەپەڵۆســــن، قورقێنەی ترش ئەدەن، گەدەیـان زوو زوو ترش دەکـات، جموجووڵیان خاوە، زۆر بە سەبر و خۆگرن، هێواش قسە دەکەن، لە ڕێگە ڕۆیشتندا بە جێ دەمێنن و زوو ماندوو دەبن، ماســـت و دۆ و خۆراکە ســـاردەکانی دیکە دوژمنی ئەمانەیە، خەوخۆش، تێگەیشتن و فێربوونی خاو، دابەزینی هێزی مێشک و یادگە، ڕەنگی میزی بەیانیان ڕوون و بەرەو ئاوییە، ســەر زمانیان زۆر جار ســپی دەبێتەوە. ئەم نیشانانە لە وەرزی زستاندا زۆرتر خۆیان نیشان ئەدەن و نەخۆشییان لەم وەرزەدا زۆرترە.

## کەسانی زەرداوی مەزاج[1]:

مەزاجی گەرم و وشـک، ڕوخسـار و سـپێنەی چاویان کەمێک زەردە، ناو دەم و لووتیان وشکە، زمانیان زوور و وشک و تاڵە، زوو زوو تینوویان دەبێ، ئارەزووی خواردنیان کەمە، بەژنی و باڵای کز و لاوازیان هەیە، زوو فێر دەبن و تێدەگەن، بە ئاســـانی ناخلەتن و فریو ناخۆن، کەم خەوی و وریـابوون لە کـاتی خەو، زوو هەڵدەچن و توورە دەبن، پێســـتیان گەرم و وشـــکە، دەور چاویان بەهۆی کەمی تەڕایی و چەوریەوە چاڵ و قووڵ دەبێ، خورانی پێســـت و زرەنگانەوەی گوێ، ژانەســەریان زۆرە بە تایبەت لە هەوای گەرم و کاتی توورەبووندا، ئەگەر دەســتیان پێوە ئەدەیت پێســـتیان گەرمە و حەز ئەکەن بە هەوای فێنک، یەکەم میزی بەیانیانی پڕڕەنگ و هەندێ جار لەگەڵ کزانەوەدایە، گەرمی و وشـــکییان لە وەرزی هاویندا زۆر دەبێ، لە تەمەنی گەنجیدا زۆرترین کێشــە و تێکچوونی تەندروســتیان بۆ پێش دێت بەتایبەت لە وەرزی هاویناندا.

## کەسانی سەوداوی مەزاج[2]:

---

١. صفراوی مزاج

٢. سودا مزاج

مەزاجی سـارد و وشـک، ڕەشـتاڵە، پێسـتیان وشـکە و نەرم و نۆڵ نییە، خوێنی کەڵەشـــاخیان ڕەش و خەســـتە، زۆر دەچنە ناو بیر و خەیاڵ و هەوای بابەت و کێشـــەی دەوروبەریـان، خەوی هەڵیـت و پەڵیـت زۆر دەبینن، بەهۆی خێرایی تێفکرینەوە ئەم دەســتەیە زۆرترین شــاعێر و ســیاســەتمەداریان لێ هەڵدەکەوێت، ئەگەر شـــێوازی خواردن و هەڵســـوکەوتیان چاک نەکرێت زۆرترین کێشـــەی دەروونیان بۆ پێش دێت، خەمۆکی و دوورەپەرێزی و تێکەڵاو نەبوون لەگەڵ خەڵکدا ڕەوشـــتی ئەمانەیە، کزانەوەی ســـەر گەدە و ســـەردڵ، جەمام کەوتن و داگیرانی ماســـوولکەکانی پشـت پووزی پێ، داگیرانی و ژانی ئەندامی قوڕگ بە شـێوەی یەک بازنە، حەز و ئارەزووی دروێنەیان بۆ خواردن هەیە، کوڵک و موو و خاڵی ڕەش لە سەر پێستیان دەرئەکەوێت. ئەمانە لە وەرزی بەهاردا مەزاج و تەندروستیان باشترە بەڵام پاییزانە نەخۆشیەکانیان زۆرتر سەر هەڵەدات.

- **مەزاجی ئەندامەکانی لەش**

✓ ئەندامەکانی خاوەن مەزاجی گەرم: (بەڕیزەوە)

١) ئەندامی دڵ
٢) خوێن
٣) جەرگ
٤) گۆشت و ماسوولکە
٥) سپڵ
٦) گورچیلە
٧) دەمارە ترپەدارەکان (سوورەدەمارەکان: دەماری خوێنبەر)
٨) دەمارە بێ ترپەکان (ڕەشەدەمارەکان: دەماری خوێنهێن)
٩) پێست

✓ ئەندامەکانی خاوەن مەزاجی سارد: (بەڕیزەوە)

١) بەڵغەم
٢) پی و بەز

٣) چەوری
٤) ئێسک
٥) کرکرۆژکە
٦) دەماری عەسەب
٧) مۆرخەوانە[١]
٨) مێشک
٩) پێست

✓ ئەندامەکانی خاوەن مەزاجی تەڕ: (بەڕیزەوە)
١) بەڵغەم
٢) خوێن
٣) چەوری
٤) پی و بەز
٥) مێشک
٦) مۆرخەوانە
٧) گۆشت
٨) مەمک و گون
٩) سی و ناوپەنچک
١٠) جەرگ
١١) سپڵ
١٢) گورچیلە
١٣) ماسوولکە
١٤) پێست

✓ ئەندامەکانی خاوەن مەزاجی گەرم: (بەڕیزەوە)

١. دەماری عەسەبی نوخاع لە ناو بڕبڕەی پشت

١) موو
٢) ئێسک
٣) کرکرۆژکە
٤) سوورەدەمار
٥) ڕەشەدەمار
٦) عەسەبەکانی جووڵە[1]
٧) دڵ
٨) عەسەبی هەست[2]
٩) پێست

✓ ئەو شتانەی خاوەنی مەزاجی گەرمە و گەرمی دەبەخشن:
١) خواردن بە ئەندازەی پێویست و مامناوەند
٢) جووڵە و وەرزشی مامناوەند
٣) شێلان و دەستماڵینی مامناوەندی جەستە
٤) بەکارهێنانی کەڵەشاخی وشک
٥) خۆراک و دەرمانی گەرم مەزاج
٦) حەمام کردنی مامناوەند و گەرماوی شیلەوگەرم
٧) مەڵهەم و نیمەنمەک و گیراوەی گەرم
٨) خەو و خەبەربوون بە ئەندازە و ڕێژەی گونجاو
٩) تووڕەبوون و هەڵچوون
١٠) خەم و پەژارەیەک کە زۆر نەبێت
١١) شادی و خۆشحاڵی بە ئەندازەی مامناوەند
١٢) هەندێ لە چڵک و کێمەکان
١٣) کرانەوەی هەناو و دەروونی جەستە
١٤) خستنە تەنگەوە و ترەنجانی پێستی جەستە

---

١. عصب حرکتی
٢. عصب حسی

✓ ئەو شتانەی خاوەنی مەزاجی ساردە و ساردی دەبەخشن:

١) جموجووڵی زۆر (بەهۆی کەمبوونەوەی گەرما و تینی خۆماکی دەروونی و غەریزی)

٢) ئارامگرتن و هێمنی زۆر (بەهۆی کوژانەوە و دامرکاندنی تین و گەرمای خۆماکی دەروونی و غەریزی)

٣) زۆر یا کەم خواردن

٤) خۆراک و دەرمانێک کە مەزاجی ساردی هەیە

٥) زێدەڕەوی لە وەرگرتن و بەرکەوتنی گەرمابەخشەکان وەکوو هەوای گەرم، مەڵهەمە گەرمەکان و ئاوی گەرمی حەمام

٦) زێدەڕەوی لە بابەتی ڕاگرتنی[1] مەواد لە ناو جەستەدا

٧) پاکسازی[2] لە ئەندازەی زۆر

٨) ڕاگیرانی میز

٩) توند بەستن و جەڕاندنی ئەندامەکان

١٠) خەم و ترس و شادی و خۆشی لە ئەندازەی زۆر

✓ ئەو شتانەی خاوەنی مەزاجی تەڕە و تەڕی دەبەخشن:

١) ئارامگرتن و هێمنی

٢) نووستن

٣) مانەوەی ئەو مەوادانەی کە پێویستە پاکسازی بکرێن و لەش فڕەیان بدا

٤) پاکسازی و فڕێدانی خەڵتی وشک

٥) زۆر خواردن

---

١. ئەم ڕاگرتنە لە عەرەبی و فارسیدا پێی دەڵێن (احتباس) واتا: ڕاگرتن و پاکسازی نەکردنی مەوادی زیادەی لەش کە بەهۆی ئەم مەوادانەوە گەرمای خۆماکی دەروونی کۆ دەبێتەوە و ڕادەوەستێت

٢. پاکسازی لە عەرەبی و فارسی کۆن بە (استفراغ) ناوی لێ دەهێنن، واتا دەرکردنی ئەو مەوادە کە پێویستە بە شێوەی سروشتی لە جەستە بکرێتە دەرەوە، وەکوو: عارەق، خۆراکی ژەهراوی بوونی ناو گەدە، ئاوی جنسی و سێکسی، چڵم، کێم و زووخ، چڵک، کەمێڵە، پیسایی و میز

٦) خۆراک و دەرمانێک کە مەزاجی تەڕی هەیە
٧) وەرگرتن و بەرکەوتنی تەڕیبەخشەکان وەکوو حەمام کردن بە سکی تێر
٨) وەرگرتن و بەرکەوتنی ساردیبەخشەکان کە تەڕی کۆ دەکەنەوە
٩) وەرگرتن و بەرکەوتنی ئەو شتانەی کە ڕێژەی گەرمی یەکسان دەبەخشن و تەڕی وە جووڵە ئەخەنەوە.

✓ ئەو شتانەی خاوەنی مەزاجی وشکیە و وشکی دەبەخشن:
١) جموجووڵ و وەرزش
٢) شەو نەنووستن و بەخەبەربوون
٣) پاکسازی زۆر
٤) نزیکی و سەرجێیی
٥) کەم خواردن
٦) بەکارهێنانی خۆراک و دەرمانی وشک
٧) هەموو جۆرە چالاکی دەروونی کە لە ئەندازەی زیاد بێت
٨) خۆراک و دەرمانە قەبز و گرسەکان
٩) شتی زۆر گەرم
١٠) شۆردن و حەمام کردنی زۆر

**تینی خۆماکی دەروون[1]:**
هێزی سەرەکی ژیانە کە لە سەرەتای ژیانەوە لە مرۆڤدا بوونی هەیە و وردە وردە کەم دەبێتەوە تا ئەوەیکە لە کاتی مەرگ بە تەواوی نامێنێت. تینی خۆماکی هەمان سووتەمەنی چرای ژیانی مرۆڤە.

**خەڵت**

١. گەرمای غەریزی

مرۆڤ کاتێ خۆراکێک بەکار دەهێنێت و دەیخوات پاش جوین و قووتدان، خۆراکی وردکراو دەچێتە ناو ئەندامی گەدە و پێش گەدە. بۆیە خانە و شانەی ئەندامەکانی جەستە پێویستیانە کە ماکی پێویستی ناو ئەم خۆراکە وردکراوە وەربگرن و وزەی ژیان و زیندوو مانەوەی خۆیان دابین بکەن. کەواتە خۆراکی وردکراو پێویستە چەند قۆناغ بپێوێت تا وەکوو بگات بە ئاستی خۆراکی وزەی ناو خانە و شانەی ئەندامەکان.

سەرەتا خۆراکی وردکراو بە یارمەتی تف و لیکی ناودەم تەڕ دەبێت و بە بۆری خۆراکدا دەچێتە ناو گەدە. لە ناو گەدە دووبارە هێندێ تراوی پێویست وەکوو لینجاوی گەدە و ئەنزیمەکانی دیوارەی گەدەی پێ زیاد دەبێت و بە یارمەتی جووڵانەوەی ماسوولکەکانی گەدە و جووڵەی خۆماکی گەدە خۆراکی ناو گەدە بەردەوام دیواودیوی پێ دەکرێت و چەشنی هەویر و پاشان شیلەیەکی تەڕی لێ دێت. لە قۆناغی سەرەتادا خۆراکی هەرسکراو چەشنی هەویر و شیلەی خەستی (ماکی کیمووس)[1] لێ دێت کە ئەم هەرسە پێی دەڵێن هەرسی یەکەم[2]، دواتر بە هێندێ ئالوگۆڕی ترەوە دەچێتە ناو ڕیخۆڵەکان و لەوێ شیلەیەکی زۆر تراو ڕادەستی دەمارەکانی ماساریقا[3] لە ئەندامی جەرگ دەکرێت کە لێرە پێی دەڵێن هەرسی ئامادە[4].

ماکی هەرسی ئامادە کە شیلەیەکی تراوە پێی دەڵێن خەڵت[5]. بە بۆچوونی حەکیمان ئەگەر ئەم تراوە ئامادەیە بکرێتە ناو کەرەستەی بۆری تاقیگە و ماوەیەک دابنێیت تا بنیشێت، دەبێت بە تراوێکی چوار نهۆمی جیاوازەوە کە ماک و تراوی هەر نهۆم پێی دەڵێن خەڵت.

ئەگەر ماک و تراوی بۆری تاقیگەکە شیکاری بکەین بەم شێوەیە دەتوانین تێی

---

١. تراوێکی نیوەخەستە بە شێوەی هەویر. لە زانستی پزیشکی کۆندا بەم کردارە دەڵێن هەرسی گەدە (طبخ معدی) یا هەرسی یەکەم (طبخ اول)

٢. طبخ اول

٣. ماساریقا یا ماساریقین وشەیەکی یۆنانیە، بەو ڕەگ و دەمارانە دەگوترێت کە بەسراونەتەوە بە بەشی چاڵایی جەرگەوە

٤. طبخ ثانوی

٥. کۆی تراو و ماکی ئەم چوار نهۆمە لە زانستی پزیشکی کۆندا پێی دەڵێن (اخلاط)

بگەین:

بنەوەی بۆریەکە تەنێکی ڕەش و قورس دەبینرێت کە ڕێژەکەی زۆر کەمە ئەمە خەڵتی سەودایە. سەرووی خەڵتی سەودا بە ڕیزەوە خەڵتەکانی بەڵغەم، خوێن و زەرداو وەستاونەتەوە. سەودا خاوەنی چۆنیەتی و کوالێتی سارد و وشک، بەڵغەم سارد و تەڕ، خوێن گەرم و تەڕ، و زەرداو گەرم و وشکە. حەکیمانی کۆن چوار خەڵتی سەودا، بەڵغەم، خوێن و زەرداویان بە خەڵتە چوارینەکان[1] دەناسن.

ماک و جنسی ئەو خۆراکە کە مرۆڤ دەیخوات و قۆناغەکانی هەرس و ئامادە کردن دەپێویت تا دەگاتە ئەندامی جەرگ، ماکی خەڵت دەستنیشان دەبێت. واتا خۆراکێک کە تایبەتمەندی و جنس و کوالێتی دروست بوونی خەڵتی بەڵغەمی هەبێت ئیدی نابێت بە خەڵتی سەودا یا خوێن و زەرداو، هەروەتر بە پێچەوانە. خەڵتی سەودا و بەڵغەم سەنگین و ساردن و خەڵتی خوێن و زەرداو سووک و گەرم. لە ئەنجامی کار و کاردانەوەی ئەم چوار خەڵتە، دۆخێکی مامناوەند لە نێوان گەرمی، ساردی، تەڕی و وشکی دێتە ئاراوە کە پێی دەگوترێ: مەزاج یا سروشت.

## ئەندام[2]

مەبەست هەمان ئەندامەکانی جەستەیە وەکوو دڵ، مێشک، جەرگ، گورچیلە، پێ، دەست، دەمار، گەدە، ددان و هتد.

## ڕەوانەکان[3]

---

١. اخلاط اربعه

٢. عضو

٣. ارواح: باشترین هەمبەری کوردی بۆ واتای ڕۆح لە پزیشکی کۆن وشەی ڕەوانە. چونکە لە زانستی پزیشکی کۆن روح واتایەکی جیاوازتری لە واتای ڕۆحی ئاسایی و ناسراو هەیە. لە ئەدەبیاتی فارسی و کوردیدا کاتێ باس لە هێزێک لە جنسی گیانی مرۆڤ دەکرێت واتای مادی هەیە و مەبەست لە ڕۆح نییە، وشەی ڕەوان بەکار دەهێنن. تەنانەت لە فارسیدا بۆ زانستی دەروونناسی، وشەی ڕەوانناسی بەکار دەبرێت. لێرەشدا مەبەست لە ڕۆحی ئاسایی نییە بەڵکوو بوونێکە تایبەتمەندی هاوبەشی ڕۆحی ئاسایی و مادەی هەیە. هێزەکانی جەستەی مرۆڤیش هەمان تەنی نادیارن کە نە مادەی پەتین و نە ڕۆحی نادیار.

حەکیمان دەڵێن ئەم ئەرواحە مەبەست ئەو ڕۆحە نادیار و ناسراوە نییە بەڵکوو ئەم ڕۆحە تەنێکی ڕەوان و ڕوونە کە ماکێکی ڕوون و ڕەوانە لە پاش قۆناغێکی هەرسی خەڵتەکان، واتا قۆناغی هەڵمی خەڵتەکان کە لە کۆتاییدا دەبێت بە ماکێکی زۆر ڕوون و ڕەوان کە هەمان هێزی جەستەیە و جووڵاندنی لەشی مرۆڤ.

## هێز[1]

ڕێچکەی هەرسی خۆراک هەرچی دەچێتە پێشەوە ماکی بەدەستهاتوو دەبێت بە ماکێکی ڕوونتر و ڕەوانتر لە قۆناغی پێشوو. کەواتە پاش هەرسی خەڵتەکان و هەڵمی ڕەوان، ماکی خۆراک لە کۆتاییدا دەبێت بە ماکێکی تەواو ڕوون و ڕەوان کە بە چاو نابینرێت و تەنیا هەستی پێ دەکرێت و دەکەوێتە دنیای نادیارەوە کە بە هێز ناودێر دەکرێت. ئەگەر هێز نەبێت کردار و کردەوەی لەش ئەنجام نابێت و بە پێچەوانەیشەوە ئەگەر کردەوە نەبێت سەرچاوەی هێز مسۆگەر نابێت. هێزەکان سەرچاوەی سەرەکی جووڵە و کردارەکانی هزر و هەست و دەروونە. ماکی هێز لە کۆتاییدا دابەش دەبێت بە سێ لقی جیاوازەوە واتا کۆمەڵێک هێز بۆ جووڵە و کردارەکانی جەستە، کە هەر هێزێک دەسپێردرێت بە ئەندامێکی سەرەکی واتا ئەندامی سەرۆک[2] بۆ ئەنجامدانی ڕاسپاردە و ئیشی خۆی.

### هێزە سەرەکیەکانی مرۆڤ

- هێزی سروشتی[3]:

سەرچاوەی سەرەکی ئەم هێزە لە ئەندامی جەرگ و سپیەلاکە[4]

---

١. قوه
٢. عضو رئیسیه
٣. قوه طبیعی
٤. کبد: لە کوردیدا بەشی خورماییەکەی جەرگە و سپیەکەی سپیەلاکە

- هێزی حەیوانی[1]:

سەرچاوەی سەرەکی ئەم هێزە لە ئەندامی دڵە[2]

- هێزی هەناوی[3] یا هێزی مرۆڤی[4]:

سەرچاوەی سەرەکی ئەم هێزە لە ئەندامی مێشکە[5]

## هێزی سروشتی

بەکارهێنانی خۆراک بۆ کاروباری ئاسایی جەستە و هەروەها دروست کردن و بەدنیاهێنانی منداڵی بە ئەستۆیە.

ئەرکەکانی سەرەکی هێزی سروشتی مرۆڤ:

١) گۆڕانی خۆراک بۆ پێداویستی زیندووبوونی ئەندامەکان. ناوەندی ئەم کارە جەرگە و بە یارمەتی دەمارەکان ئەم مەوادە بڵاو دەبێتەوە.

٢) جیاکردنەوە و وەرگرتنی ماکی تۆواوکی پیاو لە هەموو خەڵتەکانی لەش، پاشان ئامادەکردن و پوختە کردنی ئەم مەوادە یەک ماکی پوختە بە ناوی تۆواوکی[6] پیاو بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ تۆوی[7] ژن. بەیارمەتی هەندێ دەماری تایبەت لە ئەندامی جەرگ کاری وەرگرتن و جیاکردنەوەی تۆواوک ئەنجام دەبێت و ڕادەستی ئەندامی گونی پیاو دەکرێت.

تێبینی: سەرچاوەکانی زانستی پزیشکی کۆن زۆر بە ڕوونی ئاماژەیان بە سەرچاوەی هێز و ماکی ناو تۆوی ژنانیان نەکردووە و زۆرتر بابەتە چڕتر کراوەتەوە سەر ئاوی پیاوان.

---

١. قوه حیوانی

٢. قلب

٣. قوه نفسانی

٤. قوه انسانی

٥. مغز

٦. منی

٧. تخم

## هێزی حەیوانی

بە یارمەتی ئەم هێزە و ئەندامی ئەم هێزەیە ماکی هێزەکانی سروشتی و مرۆڤی وەردەگیردرێت بۆ ئەندامی سەرۆک کە ببن بە سەرچاوەی سەرەکی. بە واتایەکی تر بە یارمەتی هێزی حەیوانی کردار و واتای ژیان خۆی نیشـــان ئەدات. کەواتە دەمارە خوێنبەرەکانی لەش ئەم هێزە بڵاو دەکەنەوە بە هەموو ئەندامەکانی لەش. لە ئەنجامی کاری هێزی حەیوانی ڕەوانی هەڵمی[1] تێکەڵاوی ماکی ئەندامی دڵ دەبێت و هێزی حەیوانی بڵاو دەکاتەوە بە هەموو ئەندامەکانی لەش. واتە ڕەوان لە ئەندامی دڵ دەبێت بە ماکی هێزی حەیوانی و سەرچاوەی وزەی حەیوانی بۆ هەموو ئەندامەکانی جەستە. ئەندامی دڵ خاوەنی مەزاجی گەرمە و ماکی ڕەوانی هەڵمی لەم ئەندامە مەزاجی گەرمی دڵ دەگرێت، بەڵام ماکی ئەم هێزە دەگوازرێتەوە بۆ ئەندامەکانی دیکە و بەپێی ئەندامەکانی جەستە مەزاجی دەگۆڕێت.

کەواتە خاڵی گرینگ لە ئەولەویەتی ئەندامی دڵە بۆ مسۆگەر کردنی سەرچاوەی دوو هێزی دیکە لە ئەندامەکانی جەرگ و مێشک. بۆ نموونە گریمان لە ئەندامەکانی چاو و گوێچکە هەم خۆراکی پێویست هەیە بۆ هێزی سروشتی و هەم دەرکردنی فەرمانی بینین و بیستن، بەڵام خاڵە گرینگە لێرەدایە کە تا وەکوو ماکی هێزی حەیوانی لە سەر ڕەوانی هەڵمی سوار نەبێت و نەچێتە ناو ئەندامەکانی گوێچکە و چاو و هەروەها سروشتی ئەو دوو ئەندامە وەرنەگرێت، کرداری بینینی چاو و بیستنی گوێ دەرناکەوێت. بۆیە ئەگەر هێزی مرۆڤی ئەندامێک نەمێنێت تا وەکوو ئەو کاتەی هێزی حەیوانی لە ئەندامی دڵ هەیە ئەو ئەندامە زیندووە (وەکوو ئیفلیج بوونی ئەندامێک). کەواتە کاتێ هەوڵ ئەدرێت کە هێزی مرۆڤی بگەڕێندرێتەوە بۆ ئەندامە ئیفلیجەکە، تا وەکوو ئەو کاتەی ئەو ئەندامە هێزی حەیوانی تیا ماوە هەوڵدان ڕێگەپێدراو و شیاوە بەڵام کاتێ هێزی حەیوانی تیا نەمێنێ هەوڵدان کارێکی نەگونجاو و نەشیاوە چونکە ئەو ئەندامە مردووە. لە زانستی پزیشکی سەردەمدا

---

[1]. روح بخاری

کاتێ ئەندامێ تووشی نەخۆشی قانقاریا[1] دەبێت پزیشک نەشتەرگەری دەکات و ئەو ئەندامە دەبڕێتەوە، بەڵام لە پزیشکی کۆن حەکیم کۆتا هیوای چارەسەر کردنی لە دەست نادات و هەوڵی خۆی ئەخاتە گەڕ و هێزی مرۆڤی دەگەڕێنێتەوە و نایبڕێتەوە.

## هێزی مرۆڤی

ئەرکی هەست و جووڵەی جەستە بە ئەستۆی هێزی مرۆڤی یا هەمان هێزی هەناوییە. ناوەندی ئەم هێزە ئەندامی مێشکە و بە یارمەتی دەمارەکانی عەسەب کە لە مێشک و نۆخاع سەرچاوە دەگرن، ئەرک و ڕاسپاردەی ئەم هێزە ئەنجام دەبێت. ئەم هێزە دابەش دەبێ بە سەر دوو هەستی گرینگ:

## هەستی ڕواڵەت[2]

1) بینایی[3]: هەستی تایبەتی بۆ بینین لە ئەندامی چاو
2) بیسایی[4]: هەستی تایبەتی بۆ بیستن لە ئەندامی گوێچکە
3) بۆیایی[5]: هەستی تایبەتی بۆ بۆن کردن لە ئەندامی لووت
4) چێژایی[6]: هەستی تایبەتی بۆ چێژتن لە ئەندامی زمان

---

١. قانقاریا (Clostridium perfringens): ڕەشبوونەوەی بەشێکی ماسولکە و ئێسک کە هۆکارەکەی ئەوەیە کە خوێنی ناو دەمارەکانی ئەم بەشە تێکەڵاوی هۆکاری نەخۆشیەکە دەبێت و دەمارەکە بەرەو مردن و گەندەڵی دەبات و ڕەش و شین دەبێتەوە و چڵک و زووخی لێ دێتە دەرەوە و بۆگەند دەکات. ئەم نەخۆشیە بەهۆی بەکتریای (Clostridium perfringens) دروست دەبێت.

٢. حس ظاهری

٣. حس بصری: بینایی

٤. حس سمعی: شنوایی

٥. شامە: حس بویایی

٦. حاسە الذوق: حس چشایی

٥) ساوپایی[١]: هەستی تایبەتی بۆ ساوین و دەست پێدا هێنان لە ئەندامی پێست

## هەستی نهێنی[٢]

١) هەستی هاوبەش[٣]: هەستێکە لە پێشدا هەموو شتە بەرهەستەکان[٤] دەچنە خانەی ئەو و هەموویان کۆ دەکاتەوە و پاشان دەیانگەینێتە هەستە نهێنیەکانی دیکە.

٢) هەستی وێنا و خەیاڵ[٥]: یاد هەگبە و شوێنی ئەم هەستەیە. لە خانەی یاد وێنەی شتە بەرهەستەکان کە وەرگیراوە وەبێ هیچ دەستێوەردانێک وێنا دەکرێن و سیمای خەیاڵی دەگرن.

٣) هەستی تێفکرین[٦]: ئەم هەستە وێنە خەیاڵیەکانی یاد هەڵدەگرێت و لێکدانەوە و شیکاریان بۆ دەکات و وێنای تازەیان لێ دروست دەکات. لەوانەیە ئەم وێنە تازانە ناڕاستیش بن و لە دنیای دەرەوە بوونیان نەبێت، بەڵام ئەمانەیش سەر بە بەرهەستەکانن، وەکوو هەڵفڕینی مرۆڤ یان بینینی کێوێک زێڕ.

٤) هەستی وەهمی[٧]: لە خانەی ئەم هەستەدا لە وێنەی شتە بەرهەستەکان، درکی نابەرهەستی دەکرێت، وەکوو لە ئەنجامی بینینی گورگ، واتای دوژمنایەتی و دڕندایەتی درک دەکرێت.

٥) هەستی بیرەوەری (یادگە) [٨]: کۆگا و شوێنی واتا نابەرهەستەکانە[٩] کە لە وێناکانی بەرهەست وەرگیراون.

---

١. حس لامسه
٢. حس باطنی
٣. حس مشترک
٤. محسوسات
٥. حس خیال
٦. حس تفکر
٧. حس متوهمه
٨. حس حافظه
٩. نامحسوس: نابەرهەست

## شەش بنەمای سەرەکی تەندروستی[1]

تەندروستی بریتیە لە دەرکەوتنی کرداری ڕاست و تەندروست لە ڕواڵەت و ناوەرۆکی جەستە و هەناوی مرۆڤ، هەروەها بەپێی بۆچوون و ڕوانگەی پزیشکان و حەکیمانی کۆن پاراستنی تەندروستی[2] یانێ زانین و ناسینی زانستنی جەستە تەندروستەکان. حەکیمی گەورەی یۆنانی جالینووس دەڵێت: ئەگەر پێوانە و ڕێژەی شەش بنەمای سەرەکی تەندروستی مرۆڤ بە شێوەی شیاو و گونجاو و لە ئەندازەی هاوسان و سروشتیدا بمێنێتەوە، جەستە و ڕەوانی مرۆڤ تەندروست دەمێنێتەوە.

لە ڕوانگەی حەکیمانی ڕێبازی پزیشکی کۆنی ئێرانی بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بە شێوازی سروشتی درێژە بدات بە ژیانی، پێویستە مەرجەکانی تەندروستی ئەم شەش پێداویستیە ڕەچاو بکات:

- هەوا:

توخمی هەوا بەهۆی تایبەتمەندیەکانی ڕوونی و خەستی، پلەی گەرما و سەرما، ئاوێتەبوون لەگەڵ توخمەکانی زەوی و دووکەڵەکان یا پاکژبوون لەم توخمانە و دووکەڵ، دەتوانێت کاریگەری بەرچاوی هەبێت لە سەر تەندروستی جەستەی مرۆڤ. بۆ نموونە هەوای تێکەڵ بە مەوادی پیس (وەکوو هەوای زێراب و گەنکاوەکان) دەبێتە هۆی نەخۆشی، بەڵام هەوایەکە مەوادی پیسی تێدا نەبێت دەبێتە هۆی تەندروستی و سلامەتی.

هەمیشە بارودۆخی هەوا بەهۆی هۆکارەکانی وەرزەکانی ساڵ و کەشی جۆگرافیایی دەگۆڕدرێت. کەواتە هەر وەرزی ساڵ خاوەنی مەزاج و سروشتی تایبەت بە خۆیە. بەهار مەزاجی هاوسان و مامناوەند، هاوین گەرم و وشک، پاییز سارد و وشک و وەرزی زستان مەزاجی سارد و تەڕە، هەروەها هەر کەشێکی جۆگرافیایی زەوین وەکوو کاتی شەو و ڕۆژ، کوێستان و پێدەشتەکان، پلەی

---

۱. ستە ضروریە

۲. حفظ الصحە

گەرمی، شــەوبا[1] و ڕۆژبا[2] (لای شـنیان و هەڵکردنی با)، ڕەنگی خاکی زەوین، ئاوی ژێرخان و ڕووی زەوین و هتد.

- خواردەمەنی و خواردنەوە:

هیچ مرۆڤ و تەنانەت بوونەوەرێک نییە کە پێویســـتی بە خواردن و خواردنەوە نەبێت. تا وەکوو ئێستا کەس نەبووە وەبێ بەکارهێنانی ماکی خواردن و خواردنەوە بژیت و ژیانی بەرێتە ســـەر. جا ئەمەیکە مرۆڤ چی بخوات و چی بخواتەوە زۆر گرینگە. چونکە هەموو خواردن و خواردنەوەیەک یان هەر ڕێژەیەکی کەم و زیادی خواردن و خواردنەوە شـــیاو نییە بۆ مرۆڤ. بۆ یەکجار هەڵە کردن لە خواردن و خواردنەوەی هەندێ ماکی ئەم دنیایە بۆ هەمیشـە گیان لە جەستە نامێنێت و مرۆڤ تووشــــی مەرگ دەکات یا وەکوو هەڵەی ورد و درشـــت لە بەکارهێنانی ماکەکانی خواردن و خواردنەوە دەتوانێت وردە وردە تەندروســـتی تەمەن دابەزێنێت و ژیان بەرەو نەخۆشـــــی و ناخۆشـــــی ببات و مەرگ نزیک بکاتەوە. کەواتە زۆر گرینگە زانست و شارەزایی مرۆڤەکان لە سەر ماک و بەرنامەی خواردن و خواردنەوەیان ڕۆژبەڕۆژ زیاتر بێت.

- ڕاگرتن و پاکسازی[3]:

ڕاگرتن یانێ هێشـتنەوەی بەشـێک لە پشکە پێویسـتیەکان لە ناو جەستە (وەکوو ڕاگرتنی ئاو بە ڕادەی پێویست) و پاکسازی یانێ فڕێدان و کردنە دەرەوەی مەوادی ناپێویســـتی ناو جەســـتە (وەکوو فڕێدان و کردنە دەرەوەی مەوادی ژەهراوی ناو خوێن بە یارمەتی گورچیلە کە پێی دەڵێن میز). ئەگەر کەســـێک نەتوانێت مەوادی پێداویســـتی لە جەســـتەیدا ڕابگرێت یا مەوادی ژەهراوی و زیادەی فڕێ بدات، ئەوە تووشی نەخۆشی دەبێت.

- وەرزش و پشوودان[4]:

وەرزش هەمـان جووڵانەوە و چـالاکی ڕۆژانەیە، بەڵام پشـــوودان دۆخێکە کە

---

١. شەوبا: هەڵکردن و شنیانی با لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژاوا

٢. ڕۆژبا: هەڵکردن و شنیانی با لە ڕۆژاواوە بۆ ڕۆژهەڵات

٣. احتباس و استفراغ. لێرە استفراغ سەرووترە لە ڕشانەوە یانێ ڕشانەوە جۆرێکە لە استفراغ

٤. ریاضت و استراحت

جەستە و ڕەوان هێمن دەبێتەوە و بێدەنگ دەبێت. زۆرێک لە کردارە پێویستیەکانی جەستە لە دۆخی پشووودان و حەسانەوەدا ئەنجام دەبێت. کەسێ کە نەتوانێت بە ئەندازەی پێویست پشوو بدات و وەحەسێت تووشی نەخۆشی دەبێت یان هەروەتر کەسێ کە جووڵە و وەرزشی کەم بێت. وەرزش و جووڵانەوە بەشێکن لە کاتی خەوەری و بیرداری ژیان، کەواتە پەیوەستە بە وزە و ورەی پاشەکەوت کە لە کاتی نووستن و پشوودان گل دراوەتەوە لە جەستە و ڕەوان. مرۆڤ کاتێ دەتوانێت کاتی وەرزش و جووڵانەوە و بەگشتی کاتی خەوەری وەکوو نیوەی زیاتری ژیانی تێپەڕێنێت کە بە گونجاوی و لەباری کاتی پشوودان و خەوتنی بە ئەنجام گەیاندبێت.

- دەرهاویشتە هەناویەکان[1]:

مەبەست دۆخەکانی شادی، خۆشی، پێکەنین، گەشکەبوون، شانازی کردن، گەشانەوە، گریان و خەم، تووڕەیی، ڕق، هەڵچوون و هتد کە لە ناوەرۆکی مرۆڤەکاندا ساز دەبێت و لە ڕواڵەتدا خۆی نیشان ئەدات. پێویستە ئەم دۆخانە لە کەسی ئاسایی و سروشتیدا بە ئەندازە ڕێژەی پێویست بێ. ئەگەر ئەندازەکەی لە جێ خۆی بوو ئەو کەسە تەندروستە و لە دۆخی نەخۆشیدا نییە.

- خەو و خەوەری[2]:

نووستن دەبێتە هۆی بەهێزبوونی خۆگرتوویی و مانەوەی کردارە ماوسوولکەییەکانی لەش، هەروەها خەو دەبێتە هۆی ئەوە کە ژیان کوتوپڕ ڕانەوەستێت و ماوەی بەردەوامی ژیان بۆ کاتی خەوەری و بیرداری لە داهاتوودا بمێنێتەوە. چەندە کات، شوێن و ڕێژەی نووستن گرینگە هێندە کات، شوێن و ڕێژەی بیرداری و خەوەریش گرینگایەتی هەیە. ئەم لفەدوانەیە پێویستە وەک یەک گرینگی پێ بدرێت و ڕێزی ژیانی بۆ دابنرێت چونکە هەر دوو ژیان پێک دەهێنن. هەندێ تەنیا کاتی بیرداری و خەوەری بە تەمەنی ژیان دەزانن، بەڵام لە ڕوانگەی حەکیمانی کۆن و پسپۆڕانی ئێستا ماوەی خەوەری نیوەی ژیانە و نیوەی دیکە بۆ کاتی

---

١. حالات روحی

٢. نوم و یقظە: نووستن و بیرداری (بێداری، خەوەری). وشەی بیداری کە لە زمانی فارسیدا بەکار دەچێت یەکێ لەو هەزاران وشەیە کە لە کوردیەوە چووەتە ناو فارسی. لەبنەڕەتدا بیداری هەمان بیرداری کوردیە کە بەواتای لە سەر هۆش و بیربوون کە مرۆڤ کاتێ نەخەوتووە بیری لای خۆیە و خاوەنی بیر و هۆشە

نووستن و پشووودانی دوای جووڵانەوە و وەرزشە.

## نەخۆشیەکانی مرۆڤ

لە ڕوانگەی حەکیمانی پزیشکی خۆماڵی ئێرانیەوە نەخۆشیەکانی مرۆڤ بریتین لە نەخۆشیە ساکار و تێکەڵەکان

## نەخۆشیە ساکارەکان

جۆری نەخۆشیە ساکارەکان بریتیە لە سێ دەستەی بەدسروشتی یا بەدمەزاجی[1]، بەدپێکهاتی[2] و لێکەوەبوون و پێکەوەبوونی[3] ئەندامی لەش

- بەدمەزاجی:

لێکترازان و تێکچوونی مەزاجی سروشتی مرۆڤ بەرەو لای زۆری یا کەمی خاڵی ناوەڕاستی مەزاج. بەدمەزاجی هەم لە یەک ئەندام ڕوو دەدات و هەم دەتوانێت زیاتر لە یەک ئەندام. بەدمەزاجی دوو جۆرە: بەدمەزاجیی ساکار (تەنیا یەک چۆنیەتی و کواڵیتی دەگۆڕێت، وەکوو ئەگەر گەرمای گەدە هێندێک لە ئەندازەی پێویست هەڵبکشێت، ئەم گەرما زیادە بە خواردن و بەکارهێنانی ساردکەرەوەکان دادەبەزێت و دەگەڕێتەوە سەر دۆخی سروشتیی خۆی) و بەدمەزاجیی مادی (ئەگەر یەک خەڵت یا زیاتر لە ناو خەڵتە چوارینەکانی سەودا، بەڵغەم، خوێن و زەرداو لە یەک ئەندام یا زیاتر تووشی گۆڕانکاری چۆنیەتی و چەندیەتی مەزاجی بێت، بەدمەزاجی مادی سەرهەڵدەدات. کەواتە چارەسەرکردنی بەدمەزاجی مادی دژوارترە و پێویستی بە چاکسازی خەڵت و پاڵپێوەنان و کردنە دەرەوەی خەڵتی زیادییە لە جەستە).

پزیشکی لێزان و دڵسۆز بۆ کاری چارەسەری و دەرمانگەری نەخۆش، پێویستە سەرەتا مەزاجی سروشتی کەسی نەخۆش بدۆزێتەوە، پاشان هەوڵ بدات

---

١. سوء مزاج
٢. سوء ترکیب
٣. تفرق و اتصال

لارەسەنگی مەزاج ڕاست بکاتەوە و بیگەڕێنێتەوە سەر خاڵی مەزاجی سروشتی.

هەر کەسێک لە هەر قۆناغێکی تەمەنیدا مەزاجێکی دیاریکراوی بۆ خۆی هەیە:

قۆناغی تەمەنی گەشەی[1] جەستەی مرۆڤ زۆرتر گەرما و تەڕی زاڵە یانێ مەزاج خوێنیە، تەمەنی ٣٠ بۆ ٦٠ ساڵ تین و گەرمای جەستە بەرەو کەمبوونەوە دەچێت و ساردی و وشکی زاڵ دەبێت یانێ مەزاج سەوداویە، بەڵام تەمەنی سەرووی ٦٠ ساڵ مەزاج جیاوازە واتا بەپێی خواردن و خواردنەوە مەزاجی جەستەی بەساڵاچوو دەگۆڕدرێت.

- بەدپێکهاتی:

دۆخی بەدپێکهاتەیی جەستە واتا ناسروشتی بوونی یەک ئەندام دابەش دەبێت بە ٣ بەشەوە:

١) هەبوونی کێشە لە ڕواڵەتی ئەنجامی لەش، بۆ نموونە کەسێک لاقی شەلە و بە سکماکی شەل لە دایک بووە

٢) ئەندازەی ئەندام کێشەی هەیە، بۆ نموونە کەسێک بە سکماکی لاقێکی لە لاقەکەی دیکەی گەورەترە

٣) ژمارەی ئەندام ناسروشتیە، بۆ نموونە کەسێک بە سکماکی دەستێکی شەش قامکی هەیە.

- لێکەوەبوون و پێکەوەبوونی پەیوەستەیی ئەندام:

لێرە ئەندامەکان لە سەر جێ خۆیان نامێنن و بەهۆی بڕینەوە ئەندام هەڵدەوەشێت و لێک جیا دەبێتەوە (وەکوو برین و بڕین) و یا ئەندام بە شێوەیەکی نایەکسان جێگیر دەبێت (بۆ نموونە کەسێک ئێسکی دەشکێت، بەڵام ڕاست ناگیرسێتەوە و گرێ و گۆڵی تێدا دروست دەبێت).

## نەخۆشیە تێکەڵەکان

---

١. واتا سەرەتای منداڵی تا تەمەنی ٣٠ ساڵی

لە ئاوێتەبوونی دوو یا چەند نەخۆشــــی ســـــاکار ڕوو ئەدات. زیپکە و کوان نموونەیەکی ســاکارە لە نەخۆشــی تێکەڵ کە بەهۆی بەدمەزاجیەوە دروست دەبێت. واتا ســەرەتا چەند لە شــوێنی کوان یا زیپکەکە بەدمەزاجی پێک دێت و ئەو شــوێنە دوایی دەئاوسێت. ئینجا ئاوســانەکە دەتەقێت و پێوەستەیی ئەندام هەڵدەوەشێت و لێک جیا دەبێتەوە.

## دەرمانی نەخۆشیە ساکار و تێکەڵەکان

لە ڕێبازی پزیشـــکی خۆمـاڵی ئێرانی ئەخلاتەوە کـاتێک بەهۆی بەدمەزاجی، بەدپێکهاتی و یا لێکەوەبوون و پێکەوەبوونی یەک یا چەند ئەندامی جەســـتە جۆری نەخۆشـــیەکە دیاری کرا، پزیشـــک دەســـت ئەکات بە چارەســـەری و دەرمانی نەخۆشـــیەکە. ئەگەر هۆکاری نەخۆشـــیەکە بەهۆی بەدپێکهاتی و لێکەوەبوون و پێکەوەبوونەوە بوو ئەوە کاری چارەسەری دوور و درێژ دەبێت و نەخۆش پێویستە بەردەوام بێت لە سەردان کردنی بۆ لای پزیشک و پلە بە پلە ڕێنمایی و ڕەچەتەکان جێبەجێ بکـات و تەنـانەت خۆیشـــی ئـامـادە بکـات بۆ کـاری نەشـــتەرگەری. ڕوونکردنەوەی شـــێواز و ڕێگـاکـانی دەرمـانی بۆ بەدپێکهـاتی و لێکەوەبوون و پێکەوەبوون پێویســـتی بە بابەت و دەقی تۆکمە هەیە کە بۆ خوێنەر ڕوون بێتەوە، بەڵام بەگشـــتی بابەتی دەرمانی بەدمەزاجی ئاســـانترە و لەم یەک دێڕەدا دەکرێت سیمای گشتیەکەی بزانین.

پزیشک بۆ چارەسەر کردنی بەدمەزاجی ئەندامەکانی جەستە بەگوێرەی داڕشتنی بەرنامەی خواردن بۆ نەخۆش، جۆری بەدمەزاجیەکە دەســـنیشـــان دەکات و بە یارمەتی ئەم بەرنامەیە و بەپێی پێویســـــت بە پێدانی دەرمان و ئەنجامدانی کاری دەســـتی (واتە کاری دەســـتی وەکوو کەڵەشـــاخ گرتن بۆ دەرمانی زاڵبوونی خوێن) مەزاجی نەخۆش بەرەو هاوســـانی و ســـروشـــتی بوون ڕێک دەکاتەوە. بۆ نموونە ئەگەر نەخۆش مەزاجی بەرەو ساردی زۆر ترازابێت پزیشک بە یارمەتی ڕەچەتەی خواردن و یا ئەگەر پێویست بوو بەیارمەتی دەرمانە گەرم مەزاجەکان مەزاجی ڕێک

دەخاتەوە. هەروەتر بۆ تێکچوونی مەزاجەکانی دیکە خواردن و دەرمانی جیاواز دەسنیشان دەکات.

خاڵی گرینگ ئەوەیە کە زۆربەی نەخۆشییەکانی مرۆڤ بەهۆی پێوانە و ڕێژەی نەشیاو و نارێکی شەش بنەما سەرەکییەکەی تەندروستی دروست دەبێت. کەواتە پێویستە هەم تاکی نەخۆش و هەم پزیشکی دەرمانگەر گرینگی بدەن بە بابەتی پاراستنی تەندرستی جەستە و دەروونی، و بە هاوکاری ڕێنمایی و ڕێکارە تەندروستەکان وەکوو ڕێکخستنی دۆخی هەناسەکێشان، ژینگە و هەوای پاکژ، ئاوی خاوێن، نەخواردن و کەم خواردنی سوورکراوە و خواردنی پڕ ڕۆن و خوێ و شەکر، خۆراکی تازە، خەوتنی شەوانە و زوو هەستانی بەیانیان، وەرزش و جووڵەی دروست و پێویست، شادی و ئارامی و هتد، هاوکات لەگەڵ گرتنەبەری ڕێوشوێنی دەرمانی (چاکسازی مەزاج سەرەتا بە خواردن، پاشان دەرمان و دواتر نەشتەرگەری) بۆ هەمیشە تەندروستی بپارێزێت و خۆی بخاتە بازنەی ئاسوودەیی و ئاسایشەوە.

## جیاوازیەکانی نێوان پزیشکی کۆن و پزیشکی سەردەم

۱) بابەتی هێزی بەڕێوەبردن یا سروشتی جەستەی مرۆڤ:

- ڕوانگەی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی:

بەپێی ڕێبازی خۆماڵی، گشت خاوەنی مەزنی و بەهایە. کەواتە کۆی تایبەتمەندی و بەهای بەشەکان، واتای گشت پێک دەهێنێت و دوو یا چەند بەشی بچووک دەبن بە یەک بەشی گەورە. حەکیمانی کۆن بەگوێرەی ئەم پێناسەیە گرینگی و سەرنج ئەدەن بە هەموو بەشەکان تا وەکوو سەرجەم بەشی گەورە ڕێک بکەوێتەوە.

فەلسەفەی ئەم لقە پزیشکیە باس لەوە دەکات کە مرۆڤ پێک هاتووە لە دوو

جیهانی مادە و ڕۆح (گیان). جنســـی ڕۆح نوور و ڕووناکیە و بۆ جێبەجێ کردنی دەسەڵاتی خۆی بە سەر جەستەدا، نوێنەرێکی داناوە بە ناوی هێزی بەڕێوەبەرایەتی[1] یا ســـروشـــتی جەســـتەی مرۆڤ (مەزاج، ســـروشـــت). مەزاج هێزێکە هاوچەشـــنی ســـافوۆری (نەرمەواڵە) یەک کۆمپیۆتەر کە بەشـــێوەی ڕێکوپێک کاری خۆی دەکات بەڵام خۆی لە خۆیدا خاوەنی هزر و ویســـتی ســـەربەخۆ نییە. مەزاج، پزیشـــکی یەکەمی مرۆڤە کە پێگە و جێگەی پزیشک، تەنیا بۆ هاوکاری کردنی مەزاجە.

بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤێک خۆراکێکی ژەهراوی بخوات، مەزاجی ئەو کەســە وریا دەبێ و هەوڵ ئەدات ئەو ژەهرە بە شێوەی ڕشانەوە فڕێ بداتە دەرەوە. لە ڕوانگەی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی، کاتێ بەهۆی ڕشانەوە مەترسیەک تووشی نەخۆش نەبێت (وەکوو فشاری بەرزی خوێن و ئەگەری لێک هەڵوەشانی دەمارەکانی چاو و هتد) نابێ لێرەدا هەوڵ بدرێت کە دڵپێکدادان[2] لەناو ببەین، بەڵکوو پێویســـتە بە گرتنەبەری ڕێوشـــوێنی گونجاو، یارمەتی جەســـتە بدرێت کە بەئاســـانی ڕشـــانەوەکە ئەنجام بدات و لە لایەکی تریشـــەوە هەوڵ بدرێت بە پێدانی خواردنەوە و تراوەکان[3] و شـــێوازەکانی دیکە، دەرهاویشـــتە لاوەکی و خراپەکانی ڕشـــانەوە کەم بکرێنەوە. یا نموونەیەکی دیکە کاتی هەوکردن و چڵک کردنی کۆئەندامی هەناســـە، لووت چڵم و ئاوی پێدا دێت، لێرە تا ئەو جێگەیە دەتوانین پێویستە لەجیاتی وشک کردنی، هەوڵ بدەین نەخۆش بەرامبەر بەم چڵم و ئاوە خۆڕاگر بێت و ئارام بگرێت. ئەڵبەتە خاڵی گرینگ ئەوەیە مەزاج، تووشـــی بەهێزی و لاوازی دەبێت و جاری وایە لەم بوارەدا زیادەڕەوی و کەمڕەوی دەکرێت.

لە نموونەکانی ســـەرەوە ئەرکی پزیشـــک ســـەرەتا ئەوەیە پاش لێکدانەوە و ســـەیرکردنی وردی تەواوی دۆخ و کرداری ســـروشـــتی جەســـتەی مرۆڤ، هەوڵ بدرێت بۆ بەهێز کردنی جەســـتە و بەرگری لە لاواز کەوتنی جەســـتە و هەروەها ئەگەر پێویســـت ببێت مەزاجی تێکچوو کە لە دۆخی مامناوەند و ســـروشـــتی لایداوە، چاک بکرێتەوە. کەواتە بەگشتی، پزیشکی خۆماڵی و سروشتی چۆنیەتی یارمەتیدانی

---

[1] قوە مدبرە

[2] تهوع

[3] هایدرە کردن

مەزاجی جەســتەی مرۆڤ فێری پزیشــکان دەکات. خاڵی گرینگ لە ڕێبازی خۆماڵی ڕوانگەی پێدانی تەندروســـتیە بە پزیشـــکی (بەهۆی هێزبەخشـــی بە مەزاج). ئەم ڕوانگەیە لە سەرەتا تا کۆتایی ئەم زانستە بوونی هەیە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە، ئەبووبەکر ئەحمەد ئەلخوەینی (ســـاڵی ١٠٠٠ زایینی) لە پەرتووکی (هدایة المتعلمین فی الطب) بەم شـێوەیە زانسـتی پزیشـکی پێناسـە دەکات (بە ڕیزەوە): زانسـتێکە کە "تەندروسـتی مرۆڤەکان دەپارێزێت" (ئەولەویەت پاراسـتنی تەندروسـتی) و پاشـان دەڵێت: "وە ئەگەر ئەم تەندروســـتیە نەما بە یارمەتی زانســـت و کرداری پزیشـــکی تەندروستی جێگیر بکرێتەوە" واتا بە دەرمان و نەشتەرگەری و کارە دەستیەکان.

پێناسـەی سـەرەوە هەمیشـە حەکیمانی بواری تەندروسـتی هان داوە کە فاکتەری پاراســتنی تەندروســتی بۆ بەهێزکردنی مەزاج ڕەچاو بکەن. پاشــان بە پۆلێنبەندی هۆکارەکانی دەرەکی و ناوەکی پێوەندیدار بە تەندروستی، پاراستنی تەندروستی لە ٦ بنەمـای ســـەرەکیدا دیـاری دەکەن: هەوا، خواردن و خواردنەوە، جووڵانەوە و وەرزش و پشـــوودان، خەو و خەوەری، دەرهاویشـــتە هەناویەکان (شـــادی، خەم، گریان و هتد)، پاکسازی لەش لە مەوادی زیادە و پاراستنی مەوادی پێداویستی.

حەکیمانی پزیشکی خۆماڵی بۆ هەرکام لە هۆکارەکانی سەرەوە کۆمەڵێک ڕێنمانی و ڕێنوێنیـان دانـاوە. بۆ نموونە حەکیم زەکریـای ڕازی تەنیـا ســـەبارەت بە کاتی بەکارهێنانی میوەکان لەگەڵ ژەمەکانی خواردندا نامیلکەیەکی دەرکردووە. کەواتە ســـوودی هەبوونی پزیشـــک لەوەدایە کە بۆ کاتی تەندروســـتی مرۆڤ بە یارمەتی دەرکردنی ڕێنمایی و ڕێنوێنیە پێویستەکان، هەوڵی پاراستنی تەندروستی و نەخۆش نەکەوتن بدرێت. ئەم ڕوانگەیە تەنانەت بۆ کاتی دەرمانیش کاریگەری خۆی هەیە. ئەم حەکیمانە بۆ کاتی نەخۆشـی مرۆڤەکان دەڵێن: پێش دەرمان و کارە دەسـتیەکان (وەکوو شێلان و کەڵەشاخ و نەشتەرگەری) پێویستە سەرەتا وردبینی هەڵسوکەوت و شێوازی ژیانی نەخۆش بکرێت و ڕێکاری چاکسازییان بۆ دەستنیشان بکرێت.

خاڵێکی دیکەی ڕوانگەی حەکیمان لە نەخۆشی مرۆڤەکان، کاتی دەستنیشانکردن و دەرخستنی نەخۆشیەکەیە. پزیشکی خۆماڵی بۆ دەستنیشان کردنی نەخۆشیەکان، جیا لەوەی ئەندامی نەخۆش لە جەســـتەدا دیاری دەکات، دەبێ نیشـــانە و کاری ئەندامەکانی دیکەیش چێک بکات و مەزاجی تێکچوو بەرەو مەزاجی ســـروشـــتی

بگەڕێنێتەوە.

- ڕوانگەی پزیشکی سەردەم:

بەپێچەوانەی ڕێباز و ناوەرۆکی پزیشــکی خۆماڵی، گریمانەی فەلســەفەی شاراوە لە پزیشکی ڕۆژاوا، لە سەر دیدی میکانیستی ڕێنە دیکارت (١٥٩٦ تا ١٦٥٠ زایینی) جێگیر کراوە. دیکارت دەڵێت: گشــت هیچ بەهایەکی ســەربەخۆیانەی جیا لە ئەندام و بەشــەکانی (بەشــە بچووکەکان) نییە و تایبەتمەندی گشــت ئەوەیە کە کۆی بەهاکانی بەشەکان بەهای گشتی دروست دەبێت. کەواتە بۆ پێناسەی گشت، تا ئەو جێگەیە ڕێگە هەیە گشت دابەش بکرێت بە بەشی بچووک و وردیلە. کەواتە ناسینەوە و پێناسەی گشت لە بەشەوە دەست پێ دەکات. لە ئەنجامدا پێناسەی گشتی لە کۆی پێناسەی بەشەکان بە دەست دێت.

لەم ڕوانگە تازەیەوە بۆ ناســینەوە و چارەســەری نەخۆشــی، هەوڵ دەدرێت تا قووڵایی خانە و تەنانەت مۆلێکوول (بەشــی وردیلە و بچووک) وردبینی دەکرێت و خاڵی تێکچوو دەدۆزرێتەوە. ئینجا بە داڕشتنی بەرنامەی تایبەت ئەو خاڵە چارەسەر دەکرێت. وردبینی و شــێکاری ئەم زانســتە هەر بەهۆی گەشـــەی ئەم ڕوانگە دێکارتیەوەیە کە چووەتە ناو وردیلەترین ئەندامی لەش. پاش پەرەســـەندنی ئەم بیرۆکەیە پسپۆڕانی بواری پزیشکی و کیمیا و فیزیا بۆ گەیشتن بە خاڵی سەرەتایی ئەندامی لەش ڕۆژبەڕۆژ هەوڵیان زیاتر کرد کە وردیلەترین ئەندامەکان بەهۆی داهێنانی ئامێرە وردبین و پســپۆڕیەکان بدۆزنەوە و دەر و دیمەنی هەموو ئەندامەکانی لەش بخەنە ژێر دەستی خۆیان و بەم شێوەیە دەرمان و چارەسەر و نەشتەرگەری دەست پێ بکەن. ئەگەر سەیری ناوەرۆک و پێشبینی دەرهاویشتەکانی ئەم شێوازە بکەین بۆمان دەر ئەکەوێت کە کورت هێنان لە بەرگری لە نەخۆشیەکان و لاواز بوونی تەندروســتی، چارەســەریی نەخۆشــیە دژوارەکان و دەرهاویشــتە لاوەکی و خراپەکانی دەرمان و نەشــتەرگەری تازە ئاکامی ئەم تێڕوانینە جیاوازەیە. بەگشــتی زانســتی پزیشــکی ســەردەم کار لە ســەر دەرمان دەکات و بە شــێوەی پزیشکی کۆن ناپەردەژێتە سەر پاراستنی تەندروستی.

پرسیارێکی گرینگ کە دێتە ئاراوە ئەمەیە کە ڕێبازی پزیشکی سەردەم چەندین لقی جیاوازی وەکوو دەروونناسی و دەروونپزیشکی لێ بووەتەوە و کار لە سەر ڕەهەندی سەرووی مادە واتا ڕۆح دەکات، بەڵام ئەوەیکە ئەورۆکە پسپۆڕانی ڕۆژاوایی جەختی لە سەر دەکەن زۆرتر لەوەیکە ڕوونکردنەوە و شیکاری بواری ڕەوان و ڕۆح بێت، زۆرتر بابەت و چەمکی کردارناسی (ڕەفتارناسی) مرۆڤەکانە. هەروەها پسپۆڕانی دەروونناسی و دەروونپزیشکی سەرجەم هەڵسوکەوت و کردار و بابەتەکانی سەرووی مادە (مێتافیزیک) بە هۆکاری مادە دەزانن، واتا ئاکامی کاردانەوە و کاریگەریەکانی جووڵەی لەش. ئینجا ئەم جووڵەیە لە ئاکامی هۆکارە کیمیاویەکانی لەش وەکوو ئێپی نێفرین و نۆراپی نێفرین و دۆپامین و هتد لێک دەدەنەوە.

بابەتێکی دیکە کە لایەنگرانی پزیشکی سەردەم باوڕیان پێیە، سیستەمی اتونوم و هۆرموونانی ناو شانەکانی لەشە کە زۆربەی کاروباری لەش بەمانەوە بەندە. خاڵی گرینگ ئەوەیە کە شوێنکەوتوانی پزیشکی کۆن کە ئەزموونی تازەتریان لە بەردەستە دژایەتی لەگەڵ بەرهەمی زانستی پزیشکی سەردەم ناکەن و بۆ نموونە دژی توێژینەوەی هاوشێوە لە سەر هۆرموونەکان نین. چونکە زانایانی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی سیستمی هۆرموونات و هاوشێوەکانی دیکە چەشنی ئامێرە بەکارهاتووەکانی بەردەستی هێزی مدبرە بۆ کاروباری جەستە و ڕەوان دەزانن، بەڵام لە پزیشکی سەردەم سەرەڕای ئەوەی کە چەشنی ڕێکخستن و پێکهاتەیەکی ڕێکوپێک سەیر دەکەن، هاوشێوەی پێوەندی نێوان بەشەکانی یەک ماشێن لە بەرچاوی دەگرن. لە حاڵێکدا پزیشکی کۆن دەڵێت ڕێکخستنێکی زیرەکی یەکگرتووە کە تەواوی بەشەکانی جەستە بەڕێوە دەبات و بۆ ئەم بەڕێوەبردنە سوود وەر ئەگرێت لە ڕێکخستنە چکولەکان لە ناو بەش و ئەندام و مەوادی هۆرموونات و کۆئەندامی دڵ و هتد.

خاڵی کۆتایی ڕوانگەی یەکەم ئەمەیە کە هەموو پسپۆڕانی بواری پزیشکی سەردەم خوانەپەرست و بێدین نین بەڵکوو کەسانێکی دیندار و خواپەرەستیشیان تێدایە بەڵام ژینگە و بەستێنی گەشەسەندن و سەرهەڵدان و پەرەپێدانی ئەم پزیشکییە ڕێچکە زانستی ڕۆژاوایە کە سێکۆلاریسمی لە باوشدایە.

٢) هەبوونی جیاوازی تاک لە ناو مرۆڤەکاندا:

- ڕوانگەی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی:

دووهەمین تایبەتمەندی ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی ئەمەیە کە تایبەتمەندیەکانی فیزیاوی، فیزیۆلۆژی و دەروونی هەر تاکێکی مرۆڤ تایبەت بە خۆیە و پێویستە پزیشک بەپێی ئەم تایبەتمەندیانە ڕێوشوێنی چارەسەری پێویست بگرێتە بەر بۆ هەر تاکێک. بەڵام چونکە دەرکردنی ڕەچەتە و ڕێکاری پزیشکی بۆ هەموو تاکەکان ناکرێت، حەکیمان بە گوێرەی تایبەتمەندیە هاوبەشەکان، مرۆڤەکانیان لە ٩ مەزاجی گشتیدا پۆلینبەندی کردووە. حەکیمی شارەزا سەرەڕای لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندیە هاوبەشەکان، زیرەکانە و چاوتیژانە تایبەتمەندی و نیشانە تایبەتیەکانی تاکی نەخۆش دەستنیشان دەکات و بەپێی هەر دوو بابەت (تایبەتمەندی هاوبەش و تایبەتمەندی تاک) ڕەچەتە و ڕێکاری پێویست دائەنێت. خاڵێکی دیکە ئەمەیە حەکیمان سەرەڕای مەزاجی مرۆڤەکان، بۆ هەموو بوونەوەرەکانی دنیایش (حەیوان و ڕەوک و جەماد) مەزاجی خۆیان دەستنیشان کردووە. بەپێی ئەم ڕوانگەیە هەموو تاکێک لە هەر نەخۆشیەک، چارەسەری تایبەتی خۆی هەیە کە لەوانەیە تا ئەندازەیەک لەگەڵ چارەسەرکردنی هەمان نەخۆشی لە تاکێکی دیکە جیاواز بێت. بە واتایەکی دیکە پزیشک هەموو بنەماکانی مەزاجی تاکی نەخۆش و پێناسەی نەخۆشی ئەندامەکان، بۆ هەر نەخۆشێک یەک ڕەچەتە و ڕێکار دەبڕێتەوە.

قسەی کۆتایی ئەم ڕوانگەیە ئەمەیە کە پێویستە پزیشک هەم نەخۆش چارەسەر بکات و هەم ئەندام و خاڵی نەخۆش.

- ڕوانگەی پزیشکی سەردەم:

هەموو تاکەکانی مرۆڤ ئەندام و بەشەکانی جەستەیی یەکسانیان هەیە. کەواتە ئەگەر دەرمانێک لە ٧٠٪ خەڵکی ئەمریکا کاریگەری چارەسەری هەبێت،

پێویستە بۆ خەڵکی ئەفریقا و ئاسیایش ڕەچەتە بکرێت و پێیان بدرێت. تەنانەت ئەم پێناسەیە بەرەو سەرتر براوە و گشتیتر کراوەتەوە و دەڵێت: مرۆڤ زیندەوەرێکی ئاخێوەر و ناتیقە، کەواتە تا ئەندازەیەکی نزیک بە سەداسەد دەتوانین کاریگەری دەرمان لە سەر مشک و مەیموون و بەرازی هێندی تاقی بکەینەوە و ئەنجامەکانی بۆ مرۆڤیش قەبووڵ بکەین. ئەگەرچی هەمیشە لە دێرزەمانەوە حەکیمان و توێژەران بۆ دەرخستنی کاریگەری و نیشاندانی دەرهاویشتە خراپەکانی دەرمان، کەڵکیان لە زیندەوەرانی دیکە وەرگرتووە، بەڵام هیچ کاتێ (بێجگە ئەم سەد ساڵە دواییە) کاریگەری دەرمانەکانیان لە سەر حەیوان و زیندەوەرانی دیکە تاقی نەکردووەتەوە و دوایی بۆ مرۆڤیش قەبووڵی بکەن. ئەگەر سەیری کتێبە پزیشکیەکانی کۆن بکەین کاتێ باس لە کوشندەترین مادە کراوە نموونەی ڕوەکی (بیش)یان هێناوە. ئەم ڕوەکە تەواو کوشندە و ژەهراویە بۆ مرۆڤ بەڵام مشک دەتوانێت بە ئاسانی بیخوات و نەیکوژێت. هۆکارەکەی ئەوەیە کە گەرمای مەزاجی مشک بەرامبەر بە مرۆڤ هێندە لە سەرە کە دەتوانێت ئەم ژەهرە کاریگەری مەرگی لە سەر نەکات.

سەد ساڵ زیاترە کە زانایانی بواری پزیشکی بە شێوەی سەرەوە دەرمان و چارەسەری مرۆڤەکان دەگرنەوە، بەڵام سەرهەڵدانی خۆڕاگری دەرمانەکان و پووچەڵبوونەوەی دەرمانەکان پاش چەند بەرە و جاری بەکارهێنان، بووە هۆی جیابوونەوەی لقێکی دیکە لە زانستی پزیشکی بە ناوی Omics. توێژەرانی ئەم بوارە تازەیە خەریکن بەپێی جیاوازی نێوان تاکەکانی مرۆڤ بەرەو دامەزراندنی ڕێکخستنێکی جیاوازتر لە پزیشکی سەردەم بۆ ڕەچەتە و ڕێکاری چارەسەری نەخۆشەکان. ئەم زانستە تا وەکوو ئەوڕۆ چەندین بیرۆکەی تازەی پێشنیار کردووە (وەکوو: Person-based medicine، individualized medicine و personalized medicine) کە زۆرترین کار و توێژینەوەیان لە سەر ژێنە تایبەتەکانی نەخۆشی و خۆڕاگری ناو خانەی تاکەکانە.

بابەتی سەرەوە کە بە کورتی جیاوازەکانی نێوان هەر دوو ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی و سەردەم خرایە بەر باس و لێکۆڵینەوە، دەتوانین پوختەیەکی لێ وەربگرین و بیکەین بە ئاسۆی بەرنامە و ڕێنامەی کار و توێژینەوەکانی ئێستە و داهاتوو لە سەر هەر دوو ڕێبازەکە. هەرکام لە ڕێبازەکانی پزیشکی (وەکوو پزیشکی ڕۆژاوایی

سەردەم و ڕێبازەکانی پزیشکی خۆماڵی نەتەوەکانی جیهان) دەرکەوتنی خاڵی بەهێز و لاوازیان ئاسـاییە. کەواتە هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی هەموو خاڵە بەهێزەکان و داپۆشینی خاڵە لاوازەکان، دەتوانێت خاڵی کۆتایی نزیکبوونەوەی پسپۆڕان و تێکەڵاو کردنی بەرهەم و دەرەنجامی هەر دوو بوارە پزیشـکیەکە لە داهاتوویەکی نزیکدا نیشـان بدات. پسـپۆڕان دەتوانن پشـت ببەسـتن بە ئامانجی هاوبەشـی هەر دوو ڕێبازەکە واتا تەندروستی مرۆڤ و هەوڵدان بۆ چارەسەر کردنی جیاوازی سەرەکی و بنەمایی واتا سـروشـت (مەزاج) و جیاوازی تایبەتمەندی تاک، تا وەکوو ئامانجەکانی هەر دوو ڕێبازەکە لێک نزیک بکرێتەوە.

خۆشبەختانە سەرهەڵدانی زانستی Omics هیوابەخشە بۆ چارەسەری جیاوازی تایبەتمەندی تاکەکانی مرۆڤ، چونکە قسـەی گرینگ و سـەرەکی نێوان هەر دوو ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی و سەردەم، جیاوازی لە سەر بەش و مادە هاوبەشەکانی ئەندامانی مرۆڤە. کەواتە تەنیا بابەتی مەزاج لە ڕێبازی پزیشـکی خۆماڵی دەمێنێتەوە کە چەشنی تایبەتمەندی شاز و ئاوارتەی ئەم ڕێبازە دەسنیشان دەکرێت. ئەگەر بە وردی بڕوانینە بابەتی مەزاج، دەتوانین بە دەرهاویشـتەیەکی جیهانبینی دینی بزانین. دین ماکی یەکگرتووی نێوان هەموو بوونەوەر و زیندەوەری جیهان بە بزوێنەری بوونەوەری خودا دەزانێت. کەواتە ماکێکی هاوبەش و یەکگرتوو لە تەن و تاری هەموو جیهاندا هەیە و لە پزیشـکی کۆندا بە زۆری ڕەنگی داوەتەوە و بووەتە بابەتێکی پتەوی فەلسەفی. ڕەنگە ئەو جۆرەی ڕێبازی زانستی پەتی[1] بەنیازە هۆکارە فەلسـەفیەکانی پتەوی ناو ڕێبازی زانسـتی – فەلسـەفی کۆن ڕەت بکاتەوە، کارێکی ئاسان نەبێت و تێکۆشانێکی فێرۆ بێت. چونکە لەو ڕۆژەوە کە مرۆڤ هزر و هەستی کراوەتەوە و بووە بە زیندەوەرێکی تاقانەیی لە بواری هزر و هەناودا، هەمیشـە بۆ گەیشتن بە هەموو پرسـیارەکان پشتی بەستووە بە سێ ڕێچکەی سـەرەکی: دین، فەلسەفە و زانست. سەرکەوتووترین و ئاسوودەترین مرۆڤ ئەوانەن کە سەرجەم وڵامی پرسـیارەکانیان لە بواری تایبەتی خۆیەوە لە سـێ سـەرچاوەی ناوبراو وەربگرن.

---

١. مکتب علم مطلق

## باسی چوارەم

### بەرەو دانانی نموونەیەک پزیشکی ئامێتە[1]

ئەگەر بۆ نموونە ئێمە مێژووی پزیشـــکی خۆماڵی ئێران کە داگری ئەزموون و دەرەنجـامی فەرهەنگی چەنـدین گەل و هۆزی نـاو ئێران و وڵاتـانی دەوروبەرە[2]، لێکدانەوە و خوێندنەوەی بۆ بکەین، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ســـەرەتای پزیشـــکی خۆماڵی و ســروشــتی نووســراو لە ســەرچاوەکانی ئایینی زەردەشــت و پەرتووکی ئاڤێســـتا[3] دەســـت پێ دەکات. واتا هەمان ڕوانگەی ئایینی زەردەشـــتی[4] کە ماکە ســەرەکیەکانی ســروشــت بە چاوی پیرۆزەوە ســەیر دەکات و پاراســتن و جوان بەخێوکردنی ئەم ماکانە لە جەســـتەدا بە ئەرکی ئایینی مرۆڤ دەزانێت، وردە ڕێبازی تەندروســـتی و پزیشـــکی مەزدیســـنایی لە ئێران ســـەری هەڵدا و دواجار بەرهەمەکانی بە شێوەی ئەزموونی نووسراو و کرداری چووە وڵاتی یۆنان.

---

١. Medicine Integrated

٢. وەکوو نەتەوە و هۆزەکانی ناو سنووری ئێستای ئێران وەکوو کورد، ئازەری، فارس، لور، بەختیاری، تورکمان، بەلووچ، تات، مازەنی و گیلەکی، هەروەها نەتەوەکانی هاوسنووری ئێران وەکوو ئەفغانی، پاکستانی، ئۆزبەکی، گورجی، ئەرمەنی و کوردانی باشوور و باکووری کوردستان

٣. سەردەمی ١٠٠٠ ساڵ پێش زایین

٤. مەزدیسنایی یا ڕێبازی ئەهوورامەزدایی

مێژووی ئەورووپا گەواهی ئەوە ئەدات کە نزیک بە ٦٠٠ تا ٧٠٠ ساڵ پەرتووک و ئەزموونەکانی ئەبووعەلی سینا و حەکیمانی دیکە وەکوو ڕازی و فارابی لە زانکۆکانی ئەورووپا دەخوێندران و پزیشک و حەکیمی ئەورووپی بەم حەکیمە گەورانە پەروەردە دەبوون. کۆتایی ساڵەکانی ١٣٠٠ زایینی کە ڕێنسانسی ئەورووپا دەستی پێکرد، سیاسەتی پشت بەستن بە پێشینەی فەرهەنگ و زانیاری و ئابووری ئەورووپا سەری هەڵدا و کەسانێک دەستیان دایە دامەزراندنی ڕێچکە و ڕێبازی فەرهەنگ و زانیاری لە سەر بنەمای ڕەسەنایەتی ئەورووپایی. بۆ نموونە کیمیاگەری سویسی پاراسێلسووس[1] لە زانکۆی پزیشکی شاری باڵ پەرتووکی قانوونی ئەبووعەلی سینای سووتاند و لە کۆڕێکی پزیشکاندا بێشەرمانە گوتی: کوڵک و مووی پشتەملی من لە تەواوی کەسانی هاوشێوەی پوورسینا حەکیم و شارەزاترە. پاشان ڕووی کرد لە ئامادەبووانی کۆڕەکە و گوتی: کلیلی سەرەکی پزیشکی و بەتایبەت دەرمانناسی بەر لە هەموو زانستێک لە زانستی کیمیادا دەست ئەکەوێت. ئەم باوڕبەخۆبوونەی پاراسێلسووس توانی سەرنجی زۆرێک لە پزیشکان و پسپۆڕانی دیکە بەرەو لای خۆی بەتایبەت بیرۆکەکەی ڕابکێشێت. ڕێبازی ئەم کیمیاگەرە توانی پێگەی لاوەکی دەرمانە کیمیاویەکان بکات بە پێگەی سەرەکی لە زانستی پزیشکی.

هەر چەند دەرمانە کیمیاویەکان دەرەنجامی توێژینەوە و تێکۆشانی زانایانی کیمیا و پسپۆڕانی تاقیگەی کیمیاوییە و پێش بیرۆکەکەی پاراسێلسووس زانستی پزیشکی وەکوو فاکتەرێکی پاڵەکی و لاوەکی گرینگی پێ دەدا، بەڵام شۆڕشی ڕێبازەکەی پاراسێلسووس کارێکی وای کرد کە لە ماوەیەکی کورت هەموو وڵاتان یاسای پزیشکیان گۆڕا و دەرمانە دووسوودەکان[2] بوو بە بەشێکی گەورە و فراوان لە مەیدانی پزیشکی. تایبەتمەندی دەرمانە دووسوودەکان لقی پزیشکی لە گۆڕەپانی سروشتەوە بەرەو تاقیگە و مادە سەنتێتیکەکانی ڕوەکی، حەیوانی، کانزایی و نەوتی برد. کەواتە پزیشکی تازە سەرەڕای ئامێر و کەرەستەکانی تازەی پزیشکی بەشێکی

---

١. ژیانی پاراسێلسووس لە نێوان ساڵەکانی ١٤٩٣ تا ١٥٤١ زایینی

٢. ذوالخاصیت: دەرمانە دووسوودەکان هاوکات دەتوانن لە هەموو مەزاجێک کاری دیاریکراوی خۆی ئەنجام بدات، واتا دەرمانێک کە سروشتی گەرمی هەیە دەتوانێ لە مەزاجەکانی دیکە سوودیان لێ وەربگیردرێت.

زۆری دەکەوێتە بواری دەرمانە سەنتێتیکەکانی تاقیگەکانی کیمیا.

باسی دەرمانە دووسوودەکان زۆر بە خێرایی لە ناو زانکۆ و کۆمەڵە زانستیەکانی پزیشکی و کیمیا پێگە و جێگەی سەرەکی وەرگرت و توانی تا ئاستێکی دڵتەزێن هەموو لقی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی پشتگوێ بخات. لە لایەکی ترەوە دۆزینەوە و داهێنانی ئامێرەکانی میکرۆسکۆپ و تیشک و ڕۆبۆتی پزیشکی و دەرمانی بێهۆشی[1] و گەلێک بابەتی لاوەکی دیکەی پزیشکی هەموو بوون بە پاشخانی پزیشکی سەردەم و هاوکاری نەبڕاوەی دەرمانە دووسوودەکان.

هەموو لقەکانی پزیشکی بە خۆماڵی و سەردەم خاڵی بەهێز و لاوازیان زۆرە، بەڵام ئەگەر بە دڵفراوانیەوە لەگەڵ بابەتەکە مامەڵە بکەین بۆمان دەر ئەکەوێت هەموو لقەکانی پزیشکی کۆن و نوێ تەواوکەری /بواری تەندروستی مرۆڤەکانن. ئەگەر ئێمە ڕێکەوتووین لە سەر ئەوە کە مایکرۆسکۆپ، سۆنەر، تەقەڵ، ئەندەسکۆپی، تیشک و منداڵی بلۆری، سەر بە دەرمانی کیمیاوی نییە و بۆ خۆی لقێکی تەواوکەری دەرمانی کیمیاویە بۆ تەواوکەری پزیشکی سەردەم، چۆن ناتوانین لە سەر ئەوەش ڕێ بکەوین کە ئامێری مایکرۆسکۆپ و تیشک دەتوانن لە خزمەت دەرمانی تاک و تێکەڵی ڕوەکی بێت. ئایا دەرمانی کیمیاوی و لقی پزیشکی سەردەم چارە و دەرمانی هەموو نەخۆشیەکانیان پێیە یا بەپێچەوانە دەرمانی ڕوەکی و پزیشکی کۆن؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە هەمووومان دەست هەڵگرین لەم دەمارگرییە نابەجێیە و قەبووڵ بکەین هەموو لقەکانی زانستی پزیشکی پێکەوە دەتوانن تەواوکەری یەک بن و هاوتەریب و هاوڕێچکە لە خزمەت چارەی دەرمانی دەردەداران و بێدەرمانان بێت. بەڕاستی ئەگەر ئێمە هێندە دڵفراوان بین دەردی بێ دەرمان نامێنێتەوە بێجگە مەرگ و پیری.

دوای شۆڕشی ڕۆنیسانسی ئەورووپا ڕۆژبەڕۆژ زیاتر شێواز و دەرمان و ئامێرە تازەکانی پزیشکی دروست بوون و بە تەواوی جیهاندا بڵاو بووەوە. چارەی جادووئاسا و سەرسووڕێنەری دەرمانە دووسوودەکان لەگەڵ وردبینی کاری ئامێرەکانی پزیشکی وایکرد خەڵک بۆ ماوەیەکی زۆر بیریان لە دەرهاویشتە و

---

[1] ۱. بەنج، بەنگ

پاشهاتەکانی لاوەکی ئەم دەرمان و شێوازە تازانە نەکردەوە.

ساڵی ١٩٤٨ کە بۆ یەکەم جار ڕێکخراوەی جیهانی تەندروستی دامەزرا و تا وەکوو ساڵی ٢٠٠٨ زایینی ١٩٣ وڵاتی جیهان ئەندامەتی ئەم ڕێکخراوەیانە وەرگرت و خۆیان خستە ژێر چەتری بەرنامە و ڕێنامەکانی ئەم ڕێکخراوەیە. ئەرکی سەرەکی و گرینگی ئەم ڕێکخراوەیە ئەوەیە کە بەردەوام چاوەدێر و پارێزەری یاسا و ڕێنماییە پزیشکیەکانی سەرتاسەری جیهانە. ساڵانە دەیان پێڕەو و ڕێنمایی تازە دەرئەکات و بنەماکانی پزیشکی پتەوتر دەکات و زانستی پزیشکی دەپارێزێت لە دزەکردنی فریوکاری و جادووگەری.

کەواتە ڕێکخراوەی جیهانی تەندروستی پاش بوقرات و پوورسینا دیسان یاساکانی پزیشکی پاڵاوتە کرد و پێڕەونامەی یەکگرتووی پزیشکی و تەندروستیان دامەزراند. یەکێ لە خاڵەکانی گشتگیری کردنی لقی پزیشکی تازە بە سەر هەموو لقە پزیشکیەکانی دنیا، هەمان دامەزراندن و دەرکردنی پێڕەونامەی سەرەتایی ڕێکخراوەی ناوبراوە لە سەر بیرۆکە و ڕوانگەکانی شوێنکەتوانی پاراسێلسووس. هەر چەند هەموو ساڵێک هەوڵ و داکۆکی پزیشکان و پسپۆڕانی لقەکانی پزیشکی کۆن و خۆماڵی نەتەوەکانی جیهان کاریگەری دەکەنە سەر ڕێنماییەکانی ئەم ڕێکخراوەیە و وارە وارە پێڕەو و یاسا تازەکان وەکوو ژیانەوە و پەرەپێدانی ڕێبازەکانی پزیشکی خۆماڵی و کۆن دەچێتە ناو پێڕەونامەی ڕێکخراوەی جیهانی تەندروستی.

یەکێ تر لە خاڵە گرینگەکان بۆ داهاتووی بەرنامەکانی ئەم ڕێکخراوەیە ئەوەیە کە ساڵ بە ساڵ توێژەرانی ڕێبازی پزیشکی سەردەم، دەرهاویشتە و نیشانە مەترسیەکانی بەکارهێنانی دەرمانە کیمیاویەکانیان بۆ ڕوون دەبێتەوە و ژیانی مرۆڤ بەرەو چارەنووسی دیکە دەبات. کەواتە بەناچاری پزیشکانی سەردەم دان بە سوود و پشکە دەگمەنەکانی لقەکانی پزیشکی کۆن و خۆماڵی نەتەوەکانی جیهاندا دەنێن و مۆڵەتی جیهانی دەرئەکەن بۆ بەکارهێنانی شێوازەکانی پزیشکی کۆن و خۆماڵی وەکوو چینی، ئێرانی، ئایۆرڤیدا، مالایی، کوردەواری و هتد.

ماوەی ١٠ ساڵ پاش دامەزراندنی ڕێکخراوەی جیهانی تەندروستی، ساڵی ١٩٥٨ زایینی بۆ یەکەم جار یاسای کار و بەرنامەی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی لە لایەن

ئەم ڕێکخراوەیە پەسەند کرا و فەرمانی گشتاندنی بۆ دەرکرا لە هەموو وزارەتەکانی تەندروستی وڵاتانی ئەندام. زۆربەی وڵاتانی ئەندام بە خێرایی چوون بە پێشوازی ئەم فەرمانە و ناوەرۆکی یاساکانی پزیشکی وڵاتەکەیان هاوتەریب کرد لەگەڵ یاساکەی ڕێکخراوەی تەندروستی جیهانی، وەکوو وڵاتانی چین، هیند، یۆنان و هەندێ لە وڵاتانی ئەورووپی.

ئەگەر سەیری ناوەرۆکی پێناسەکەی ساڵی ١٩٨٧ زایینی ڕێکخراوەی تەندروستی جیهانی لە سەر بابەتی بەکارهێنانی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی بکەین، بەڕاشکاوی باسی پزیشکی خۆماڵی چینی و ئایۆرڤیدای هیندی و لقی پزیشکی یۆنانی – عەرەبی دەکات. هەروەها لەم پێناسەیەدا ئاسۆی هاوکاریەتی و هاوتەریب بوونی هەر دوو لقی پزیشکی کۆن و نوێ تا ساڵی ٢٠٠٧ دائەنێت. واتا وڵاتانی خاوەن لقەکانی پزیشکی کۆن هەوڵی خۆیان زیاتر بخەنە گەڕ و ساڵی ٢٠٠٧ بەرنامەی پێکەوە کار کردنی هەر دوو لقی پزیشکیەکە لە هەموو جیهاندا بە کرداری ببینرێت.

ساڵی ٢٠٠٢ دیسان ڕێکخراوەی ناوبراو پێناسەیەکی تۆکمەتر و بەربڵاوتری بۆ هەموو بواری تەندروستی جیهان پێشنیار کرد تا بەڕێوەبەرانی سەرەکی وزارەتەکانی تەندروستی هەموو وڵاتانی جیهان واتا پسپۆڕان و پزیشکانی لقی پزیشکی سەردەم، ئەزموون و بەرهەمەکانی لقەکانی پزیشکی کۆن چەشنی تەواوکاری پزیشکی سەردەم قەبووڵ بکەن و بیخەنە بەرنامەی کاری وزارەتەکەیانەوە. بەم پێناسەیە ساڵی ٢٠٠٢ پزیشکی کۆن پلەیەکی بەرزتری بە ناوی پزیشکی تەواوکار یا جێگرەوە بە دەست هێنا و خۆی نزیک کردەوە لە هەمان ئاسۆی ساڵی ٢٠٠٧.

ساڵی ٢٠١٣ ڕێکخراوەی تەندروستی جیهانی ستراتیژیەتی ١٠ ساڵەی داهاتووی[١] خۆی بۆ پێشخستنی ڕێبازی پزیشکی جێگرەوە پێشکەش کرد. یەکێ لە ئامانجەکانی ئەم بەرنامە ١٠ ساڵەیە، ئاوێتە کردنی خزمەتگوزاری و تایبەتمەندیەکانی لقەکانی پزیشکی خۆماڵی لەگەڵ کار و ڕاژەکانی ڕێبازی پزیشکی سەردەمە.

١. بەرنامەی ١٠ ساڵەی ٢٠١٤ تا ٢٠٢٣ زایینی

شارەزایان و پسپۆڕان بەردەوام خەریکی پێناسە و ڕوونکردنەوەی تازەن تا وەکوو ڕێنامەی ئەم ١٠ ساڵە بگات بە باشترین ئەنجام و ئاسۆی دیاریکراو.

یەکێ لە باشترین پێشنیارەکانی پسپۆڕانی پزیشکی و توێژەرانی بواری تەندروستی جیهانی ئەوەیە کە ڕێبازی پزیشکی ئامێتە[١] دابمەزرێت و خزمەتگوزاری و تایبەتمەندیەکانی پەرستاری و دەرمانی هەر دوو پزیشکیەکە پێکەوە ئەنجام ببێت. وزارەتی تەندروستی ئێران سەرەتای ساڵی ٢٠١٥ ئەم پێشنیارەی وەک بەرنامەی داهاتووی کاری وزارەتەکەی پەسەند کرد و خستیە بەرنامەی کاری وزارەتەکەیەوە. ئەم بەرنامەیە ئەورۆکە لە وزارەتی تەندروستی ئێران بە ناوی بەرنامەی دەسەلاتی پەرەستاری[٢] چووەتە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە. دەستەواژەی دەسەلاتی پەرستاری یانێ دانانی چوارچێوەیەکی دیاریکراو کە لە سنووری ئەم چوارچێوەیەدا فەرمانگە و بنکەکانی خزمەتگوزاری تەندروستی پێویستە هەمیشە بەرپرسیارانە بەرەو چاکسازی و باشتر کردنی کوالێتی خزمەتگوزاریی پێش بکەون و هەنگاو هەڵبگرن. هەروەها پێویستە وێڕای پاراستنی ستانداردەکانی تایبەت بە پارێزگاری لە نەخۆش، ژینگەیەکی کاری دروست بکەن کە تێیدا هۆشداریەکانی پەرەستاری بە باشترین شێوە ئەنجام بدەن.

شێوازی کار کردنی دەسەلاتی پەرستاری هاوشێوەی دەسەلاتی بنکەکانی ڕێکخستنی هەرەوەزی و هاریکاریە[٣]. لە ناو دەسەلاتی هەرەوەزیدا کۆمپانیا گەورەکان، دەزگاکان، کارگە و ناوەندەکانی بەرهەمهێنان و خزمەتگوزاری پابەندن بە دەستەبەری و دڵنیایی کوالێتی، وەلامدانەوە و شێوازی بەڕێوەبردنی شیاوتری کارەکان و هەروەها دەرخستنی خزمەتگوزاری تایبەت بە خۆیان. لە دەسەلاتی پەرەستاریدا ئەرکی سەرەکی لە ئەستۆی دەزگا و ڕێکخراوەکانی تەندروستی و بنکەکانی پارێزگاری کۆمەلایەتیە.

---

١. Medicine Integrated

٢. Clinical Governance: ڕێکخستنی پەرەستاری، حاکمیت پرستاری

٣. حاکمیت تعاونی

## سەرچاوەكان

ئاشنایی لەگەڵ پزیشكی سوننەتی ئێران (Traditinal Iranian Medicine)، دكتۆر مێهدی فەلاح (پرۆفیسۆری پزیشكی سوننەتی ئێران)، كۆلیژی پزیشكی شەهید بەهەشتی تاران، ٢٠٠٨.

ئەنسكلۆپێدیای گەورەی ئیسلامی (دائرةالمعارف بزرگ اسلامی یا دانشنامە اسلامیكا)، بەهاوكاری نووسەران و لە ژێر چاودێری موحەمەد كازم مووسەوی بۆجنووردی، ناوەندی دائرةالمعارف بزرگ اسلامی، ١٩٨٨، تاران.

بیرۆكە و داهێنانەكانی ابن سینا و رازی لە پزیشكی سەردەم (نظریات و ابتكارات ابن سینا و رازی در پزشكی نوین)، دكتۆر جەعفەر نەسیری، پەخشانگای نور دانش، ٢٠٠٩، تاران.

پێداچوونەوەیەک لە سەر بنەماكان و مێژووی پزیشكی خۆماڵی ئیسلام و ئێران (مروری بر مبانی و تاریخ طب سنتی ایران و اسلام)، محمد رضا شمس اردكانی، بهزاد ذوالفقاری، مهدی روزبهانی، مهدی تركی و اكبر روزبهانی، پەخشانگای ملائک، ٢٠٠٨، تاران.

پێناسەی ڕووەكە دەرمانی و عەتریەكانی ئێران (شناخت گیاهان دارویی و معطر ایران)، دكتۆر ولی الله مظفریان، پەخشانگای فەرهەنگ معاصر، ٢٠١٢، تاران

ڕووەكەدەرمانیەكان و گیادەرمانی (گیاهان دارویی و گیاه درمانی)، دكتۆر موحەمەد حوسەین ساڵحی و مەهتاب مەنسووری، پەخشانگای دنیای تەغذیە، ٢٠١٤، تاران

ڕووەكەكانی كتێبی قانون فی الطب (گیاه شناسی كتاب قانون در الطب)، ئەندازیار ڕامتین پاكزاد و ئێلهام فەرهادی، زانكۆی ئەبووعەلی سینای هەمەدان، ١٣٨٩، هەمەدان

زانستنامەی وێژەی فارسی (دانشنامە ادب فارسی)، بە سەرپەرستی حەسەن ئەنووشە، ڕێكخراوەی چاپ و پەخشانگای وزارەتی ڕۆشنبیری ئێران، بەرگی یەكەم، چاپی یەكەم، هەڵەگری دووهەم، ساڵ ٢٠١١

زانستی خۆماڵی گوندنشینانی ئێران (دانش بومی با تاکید بر جامعه روستایی ایران)، جەلال یووسێفی، پەخشانگای راه سوبحان و رێکخراوەی دارستان و پاوان و لەوەڕگاکانی ئێران، ۲۰۱۱، تاران

ژەهراوی بوون لە منداڵان (مسمومیت در اطفال)، فەرزانە پاک مێهر، زانکۆی پزشکی ئەسفەهان، ساڵ ؟

قانون فی الطب، ابوعلی سینا (۸ بەرگی)، وەرگێڕانی عەرەبی بە فارسی: مامۆستا هەژار، پەخشانگای سرووش، چاپی ۱۳، ساڵی ، تاران

فەرهەنگی ڕووەکناسی کوردستان (کوردی، فارسی، عەرەبی، ئینگلیزی و لاتین)، ئیرەج موڕادی، پەخشانگای کتێبی کانی، چاپی یەکەم، ساڵی ۲۰۱۵، سنە

گۆڤاری فارسی کەیهان فەرهەنگی، ژمارەی ۲۲۵، لاپەڕەی ۲۲ تا ۲۹، ساڵی ۲۰۰۵، تاران: وتاری (تاریخ شناخت گیاهان دارویی)، دکتۆر ئەحمەد قەهرەمان

گۆڤاری ئیسلام و سەلامەت، خولی یەکەم، ژمارە یەکەم، لاپەڕەی ۱۰ تا ۱۵، ساڵی ۲۰۱٤، زانکۆی پزیشکی بابۆل، مازندەران: وتاری خوێندنەوەیەک لە سەر جیاوازی بنەماکانی پزیشکی خۆماڵی ئێران لەگەڵ پزیشکی سەردەم بۆ دەرخستنی نموونەی پزیشکی ئامێتە (بررسی تفاوت مبانی طب سنتی ایران با طب رایج، برای ارائه یک الگوی طب تلفیقی)، سەید عەلی موزەفەرپوور (MD) و هاوکارانی

فەرهەنگی ڕووەکە دەرمانیەکان: کوردی، فارسی، عەرەبی، ئینگلیزی و لاتین (فرهنگ گیاهان دارویی)، ئەمیر ئەمینی، پەخشانگای تاقەوسان، چاپی ۸، ساڵی ۲۰۰۵، کرماشان

فلۆرای ڕووەکە ژەهراویەکانی ناو لەوەڕگاکانی ئێران، رێکخراوەی ڤێتەرنەری ئێران، نووسینگەی تەندروستی و رێکخستنی نەخۆشیەکانی ئاژەڵ، زانکۆی تاران، ۲۰۱٤

ماڵپەڕی کوردی پێنووسەکان (http://penusakan.com): بابەتی "گەشتێک بە بناری شاخی سەرکەشی قەندیلدا"، شاسوار هەرشەمی، ساڵی ۲۰۱٤

ماڵپەڕی جیهانی ویکیپێدیای کوردی، ئینگلیزی، فارسی و عەرەبی

ماڵپەڕی کۆمەڵەی توێژینەوەکانی پزیشکی سوننەتی ئێران.

http://www.tim.ir/darbarema/index.htm

مێژووی ناودارانی کورد: بابە شێخ مەردۆخ رۆحانی "شیوا" وەرگێڕانی: ماجد مەردۆخ رۆحانی، لە کتێبەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ۲۰۱۱ ز. چاپی یەکەم

مەزاج (وتاری زانستی)، موحەممەد ئەحمەدی، ماستەری زانستی خۆراک، کۆلیژی پزیشکی قەزوین، ٢٠١٣.
ناميلكەی (معرفی شفا)، ناوەندی گیادەرمانی شەفای کوردستان، ٢٠١٠، سنە
وتاری "سەبارەت بە مێژووی پزیشکی جیهان" (مقاله دانستنی‌هایی در مورد تاریخچه پزشکی جهان)، ٢٠١٤، ماڵپەڕی: http://newharf.com
وتاری نەریتی نەنووسراو و زارەکی لە ئێرانی کۆن (سنت شفاهی در ایران باستان)، دکتۆر ژاڵە ئاموزگار (مامۆستای زانکۆی تاران)، نەشر فەرزان رووز، ٢٠٠٦، تاران
ستە ضروریە، دکتۆر نەرجس گورجی، دکتۆر ڕێحانە موعینی و دکتۆر ناسر ڕەزایی پوور، پەخشانگای المعی، ٢٠١٣، تاران.

"The Promition and development of traditional medicine- Report of a WHO Meeting". (١٩٧٨). Switzerland, WHO Report series, No: ٦٢٢
" WHO Traditional medicine strategy ٢٠٠٢-٢٠٠٥". (٢٠٠٢), Switzerland, World Health Organization Geneva.
Kessler RC., et al. Longterm trends in use of complementary and alternative medical therapies in the united states, Ann Intern Med ٢٠٠١, No: ١٣٥ .
WoodHam APD. (٢٠٠٠), Encyclopedia of natural Medicine, London, Dorling Kindersly.
Lesley Rees. Integrated medicine: Imbues orthodox medicine with the values of complementary medicine. BMJ ٢٠٠١; ٣٢٢. Available at: http://www.ncbi.nlm.nih.gov/pmc/articles/PMC١١١٩٣٩٨.
WHO traditional medicine strategy. ٢٠١٤-٢٠٢٣. Geneva, World Health Organization, ٢٠١٣. (WHO/EDM/TRM/٢٠١٤)

# Introduction on Botany Medicine Herbal and Kurdistan Traditional Medicine

By: Iraj Moradi

... ئەگەر سەیری پێشینەی ئەزموون و زانستی تەندروستی مرۆڤ بکەین، سەرجەم هۆز و نەتەوەکانی دنیا خاوەنی ئەزموون و هەگبەی چارەسەری و دەرمانی تایبەت بە خۆیانن، وەکوو لقی پزیشکی ئێرانی، چینی، مالایی، هێندی، یۆنانی و هتد. پاش ئەوەی کە ڕێکخراوەی جیهانی تەندروستی ( WHO ) لە سەر بنەماکانی پزیشکی سەردەم دامەزرا، چەندین یاسا و ڕێنمایی بۆ جێکردنەوەی ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی و میللی نەتەوە و هۆزەکانی دنیا دەرچوو. هەندێ لە وڵاتان زۆر بەخێراییەوە بەدەم بانگەواز و داواکاریەکانی ناو ئەم یاسا و ڕێنماییانە ڕۆیشتن و ئەزموون و ئەنجامەکانی پێشینیانی خۆیان لە چوارچێوەی لقی پزیشکی نەتەوەیی، تۆماری ناوخۆیی و جیهانی کرد. بۆ نموونە لە وڵاتی ئێران سەرەڕای تۆماری ناوخۆیی لقی پزیشکی ئێرانی، چەند ساڵ پێش ئێستا ئەزموونی دەرمانی و چارەسەری ناوچەی لوڕستان وەکوو لقی پزیشکی خۆماڵی لوڕستان لە وزارەتی تەندروستی ئێران تۆمار کرا و بۆ تۆماری جیهانیش نێردرا بۆ WHO .

ماوەی ٤٠ ساڵە ناوەندی گیادەرمانی شەفا لە شاری سنە و هەروەها کۆمەڵەی ڕووەکناسانی باشووری کوردستان هەوڵی خۆیان خستووەتە گەڕ بۆ کۆکردنەوە و ڕێکخستنی سەرجەم ئەزموون و دەستمایەکانی پزیشکی پێشینیانی چوار پارچەی کوردستان.

بۆ ئەوەی بتوانن لقی پزیشکی خۆماڵی و میللی کوردەواری ( KTM ) لە وزارەتی تەندروستی ئێران و باشووری کوردستان و هەروەها ڕێکخراوەی جیهانی تەندروستی تۆمار بکەن.

ئەم پەرتووکە هەوڵێکە بۆ ناساندنی هەندێک لە پێشەکی و پێداویستیەکانی پێناسەی سروشتی کوردستان، گیادەرمانی و سامانی نیشتمانی لقی پزیشکی خۆماڵی و میللی کوردەواری ...

به هاوکاری کۆمەڵەی ڕووەکناسانی کوردستان لە چاپ دراوە

ناونیشانی فرۆشتن:

هەولێر: نوسینگەی سەرۆکی کۆمەڵەی ڕووەکناسانی کوردستان، ئیسماعیل موشیر عوسمان ٠٧٥٠٤٥٤١٥٦٨

سلێمانی: نوسینگەی بەشی ڕاگەیاندنی کۆمەڵەی ڕووەکناسانی کوردستان، جەلال سەید کەریم گەڕاوی ٠٧٧٠١٥٦٩٧٨٣